# حەنا بەتاتۆ

# سەرۆک هۆز و جووتیار لە عیراق

## ١٩١٧–١٩٥٨





لە عەرەبییەوە وەرگێڕان

سدیق ساڵح

حەننا بەتاتۆ

# سەرۆکهۆز و جووتیار لە عیراق
## ١٩١٧-١٩٥٨

لە عەرەبییەوە وەرگێڕان
سدیق ساڵح




پرۆژەی هاوبەش

٩٥٦،٧٠٣
ح ٩٨٢
حەننا بەتاتۆ.
سەرۆکهۆز و جووتیار لە عیراق ١٩١٧-١٩٥٨/ دانانی حەننا بەتاتۆ؛
لە عەرەبییەوە وەرگێرانی سدیق ساڵح. - چ١.
تاران ، ٢٠٢١.
٢٥٤ل: ١٧×٢٤سم. (٢٩ خشتە + ٣ نەخشە).
١. عیراق - مێژوو ٢. هۆز ٣. جووتیار
ئـ سدیق ساڵح (وەرگێر) ب. ناونیشان

**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکەی ژین: سدیق ساڵح**

زنجیرە: ١٩٣
کتێب: سەرۆکهۆز و جووتیار لە عیراق ١٩١٧-١٩٥٨
دانەر: حەننا بەتاتۆ
وەرگێری عەرەبی: دکتۆر سادق عەبد عەلی تریخم
وەرگێری کوردی: سدیق ساڵح
پیتچنین: سەهەند، لاس
لەقاڵبدان: لاس
رووبەرگ: سەفین محەمەد
خەتی رووبەرگ: ئەحمەد سەعید
ژمارەی سپاردن: ١١٣٠ی ساڵی ٢٠٢١ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
شوێن و ساڵی چاپ: تاران، ٢٠٢١
نرخ: ٤٠٠٠ دینار

سەرچاوە: حنا بطاطو، الشيخ والفلاح في العراق ١٩١٧-١٩٥٨، ترجمة وتعليق: د. صادق عبد علي طريخم، تقديم وتعليق: د. سلمان رشيد محمد الهلالي، (من منشورات دار سطور للنشر والتوزيع)، بغداد، ٢٠١٨، ٢٢٤ص.

بنکەی ژین

**بنکەی بەڵگاندن و لێکۆڵینەوەی ژین**

عیراق: هەرێمی کوردستان، سلێمانی، شەقامی پیرەمەگروون، گەڕەکی بەرانان ١٠٧
ئاسیا: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یا ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یان ٠٧٧٠١٥٢٢٨٩٦ س. پۆست: ١٤ بەختیاری
پێگە: www.zheen.org ناونیشان: zheen@zheen.org

# پێڕست

## پێشەکیی چاپی کوردی

خوێندەواری بەڕێز

ئەم کتێبەی بەردەست، دکتۆرانامەی مێژوونووسی چەپڕۆی فەلەستینی، حەننا بەتاتۆیە، ساڵی ١٩٦٠ گەواهینامەی لە زانکۆی هارڤارد لەسەر وەرگرتووە و تا ئێستە بە ئینگلیزی لەچاپنەدراوە. کاری دکتۆر سادق عەبد عەلی ترێخم ڕاستبێ، کە پاش تێپەڕینی ئەو هەموو ساڵە بەسەر تەواوبوونی ئەم کارە بەرزە زانستییەدا و مانەوەی لە فەرامۆشیدا، ئەم ساڵانەی دوایی سۆراخیکردووە و بە ڕەزامەندیی ئەو زانکۆیە خواستوویە و لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە عەرەبی.

من خۆم دەرفەتی خوێندنەوەیم بۆ نەڕەخسابوو، بەڵام دۆستی هێژام دکتۆر نەجات عەبدوڵا، جێگری پێشووی سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی، زۆر هانیدام بیخوێنمەوە و پاشان -هەرچۆنێک بووە- کاتێکی بۆ تەرخانبکەم و بیکەمە کوردی. ڕاستی کە خوێندمەوە، بۆم دەرکەوت کتێبێکە لە بواری خۆیدا شاکارێکی بێوێنەیە و بۆ کتێبخانەی کوردی یەکجار پێویستە، چونکە ئەو کێشەیە کە نووسەر هەموو لایەنەکانیی پشت بە بەڵگەنامەی متمانەپێکراو بە وردی و بە شێوەیەکی زانستی شیکردووەتەوە و هەڵسەنگاندووە و کۆمەڵێک ئەنجامی لێ بەدەستهێناوە؛ کێشەیەکە ئێمەیش، بەتایبەت پاش ڕاپەڕینی ١٩٩١، یەخەگیریبووین و هەمان ئەو ئەزموونە تێشکاوەی کاربەدەستانی ئینگلیز و حکوومەتی عیراقمان لە هەرێمی کوردستان دووپاتکردووەتەوە.

سەرەنجام بایەخی لەڕادەبەدەری ئەم شاکارە، ناچاریکردم بڕیاری وەرگێڕانی بدەم. پێشەکی ڕەزامەندیی دەزگای "سطور للنشر والتوزيع" لە بەغدا -بە سوپاس و پێزانینەوە- وەرگیرا و ئەمەی بەردەستیش ئەنجامی کارەکەیە.

شایانی باسە، خشتە زۆرەکانی ناو ئەم کتێبە، هەڵە و پاشوپێش لە ژمارەبەندییاندا کرابوو، بەپێی شوێنیان ڕاستکرانەوە و ڕێکخرانەوە. کتێبەکە دوو پاشکۆی هەبوو، ئەوەی دووەمیان هەر وێنەی چەند کەسێتییەک و نەخشەیەک بوو، لەبەر ئەوەی ئەو وێنانە و هەندێ وێنەیتری کەسێتییەکانی ناو ناوەڕۆک بە ڕوونی

دەستنەکەوتن، لێرە دانەنران و تەنیا نەخشەکە هێڵرایەوە. پەراوێزەکانی دانەر و وەرگێڕی عەرەبی هەمان زنجیرەیان بۆ دانرابوو، بۆ جوێکردنەوە، ئەوانەی وەرگێڕ نیشانەی *یان بۆ دانرا. بەڕێزان سەلاحەدین ئاشتی، دکتۆر تەها ساڵح و دڵشاد عەبدولمەجید لە دەستنیشانکردنی کوردیی چەند زاراوەیێکدا هاوکارییانکردم، منەتباریانم. بەڕێز کرمانج زراریش، بە سپاس و پێزانینەوە، هەرسێ نەخشەکەی کە هێڵکێش بوون، بۆ ئامادەکردمەوە.

لە کۆتاییدا هیوامە توانیبێتم -لە لایەکەوە- ئەم بەرهەمە گرنگە بە ئەمانەت و سەرکەوتوویی بخەمە بەرچاوی خوێندەواران و -لە لایەکیترەوە- ئەم کەرەستە و ئامراز و بیرۆکە و میتۆدە زانستییە دەوڵەمەندەی حەننا بەتاتو، ببێتە هاندەری توێژەرەوەی کورد بۆ کارکردن لەم مەیدانە کە نەک هەر ئاوڕی لێنەدراوەتەوە، بەڵکوو -بەداخەوە- بیریشی لێنەکراوەتەوە.

سدیق ساڵح
٢٠٢١/٦/١٤

## پێشەکیی چاپی عەرەبی

کۆمەڵ (مجتمع)ی عیراقی بەوە جویدەکرێتەوە کە بنیاتی نەریتی (تقلیدي)ی تێدا باڵادەستە و کەڵکەڵەی بنەماڵەیی و هۆزایەتی و تیرەیی و ئەتنیی تێدا لە چەمکە مەدەنییەکان و بنچینە ژیارییەکان زیاتر توندوتۆڵە و چووەتە ناو دەزگاکانی دەوڵەتی نوێ و پایە سیاسییە مەدەنییەکانیان. ئەم بنیاتە نەریتییە، چەند ڕەوتێکی لاوەکی و چەند ڕۆشنبیرییەکی فرەڕەنگی پێکهێناوە، نەیانتوانیوە خۆ لەگەڵ بنیاتی هاوچەرخی کۆمەڵ بگونجێنن و تێکەڵیبن؛ چەند لەمپەرێکی لە ئەفسانە و هێما و چەند تەرزێکی لە جیاوازی و یادەوەریی سەربەخۆی بە ناسنامە و ڕۆشنبیری جیا لەویتریان، لە خۆیان ئاڵاندووە. ئەم دیاردەیە پێیدەگوترێ «چەقبەستنی ئەتنی و مەزهەبی و هۆزایەتی»، کە بەوە ناسراوە: ئارەزووی تاکەکەسە، تا تاقمەکەی خۆی -بەبێ هیچ هۆیەکی عەقڵمەندی و بابەتی- بەسەر تاقمەکانیتردا بشکێنێتەوە. واتە تاک دەبینێ تاقم و خێڵەکەی پەسەندترە و لە بوارەکانی ڕۆشنبیری و نیشتمانپەروەری و خەسڵەتی کۆمەڵایەتیدا لە تاقمەکانیتر باڵادەسترە، جاروبار پێبەپێ سووکایەتییەکی گشتیی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی دەوروبەریشی لەگەڵ دەبێ، کە بەها و هێما و تەرزەکانی ژیانیان بە جۆرێک لە سەرەتاییبوون و پاشکەوتوویی و سادەیی دادەنێ، چونکە پێوانەی هەڵسەنگاندنی ئەو تاقمانە، تەنیا لاساییکردنەوەی تاقمەکەی خۆیەتی، نەک بنچینە عەقڵمەندی و ژیاری و مەدەنییەکان.

هۆز یا خێڵ، بە یەکێک لەو گرنگترین هێزە سەرەتایی و نەریتییانە دەژمێردرێ، کە کۆسپێکی سەرەکیی ناوەتە بەردەم ئەو پرۆژەی نوێبوونەوە و هاوچەرخبوونەی وا دەستبژاردەی ڕۆشنبیری عیراقی لە گەردوگوڵی چەرخی بووژانەوەی سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، بانگی بۆ ڕاهێشت و داوایکرد لە بەڕێوەبردن و حوکم وەلابنرێ و نەخرێتە ناو ڕایەڵەی دەوڵەتی عیراق و دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانی. بەڵام ئیدارەی ئینگلیزی، وەک چۆن کاریکرد بۆ دامەزراندنی دەزگا هاوچەرخ و نوێیەکانی حکوومەت، لە لایەکیترەوە، کەوتە پینەوپەڕۆی چینە نەریتییە کۆنەکان و خستنیە ناو ڕایەڵەی دەوڵەت و دەزگاکانی جێبەجێکردن و قانوونдانانی خۆی، لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی و ئابووری؛ کە گرنگترینیان بریتیبوو لە پاراستنی

بەرژەوەندە گشتییەکانی و خولقاندنی ئەو بنکە کۆمەڵایەتییە کە پاڵپشتیدەکا. بەوپێیە، لەمپەرێکی لەگیرانەهاتوو و قۆرتێکی قووڵی لە بەردەم پرۆسەی چاوەڕوانکراوی نوێکردنەوە و هاوچەرخکردنی کۆمەڵ و دەوڵەتی عیراقدا دانا.

هۆز Tribe: تاقمێکە، لە نەشونماکردن و دامەزرانیدا، پشت بە یەک زنجیرەی خزمایەتی دەبەستێ (نموونەی یەکگرتن و لەیەکداتووانەوەی جووتیار و سەرۆکهۆز)، بە پێوشوێنی کۆمەڵایەتی لە خێڵ گەورەترە، لە کاتێکدا بە شێوەیەکی ئاسایی کۆمەڵێک لقی خێڵەکی دەگرێتەوە، یەک خزمایەتی و نزیکییان هەیە، یەکەیەکی یەکگرتووی کۆمەڵایەتیی تا ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆ پێکدەهێنێ.

بەڵام خێڵ Clan: تاقمە کەسێکە، یەک بنچینەی پشتاوپشتی هەیە، تاکەکانی پێیان وایە دەچنەوە سەر یەک باپیری هاوبەش و جاروباریش ئەم باپیرە کەسێتییەکی ئەفسانەیی یا مێژوویی دەبێ و ژمارەیەک یەکەی خێزانی دەگرێتەوە؛ ئەندامانی پابەنددەکا بە چەند بنەمایەکی دەستنیشانکراو و چەند ئەرکێکی دیاریکراویان بەرامبەر بە ڕۆڵەکانیتری خێڵ دەخاتە ئەستۆ. هۆز، لە ناوەندی خەڵکانی دەشتەکی (بدو) و دێهاتیدا، لە ئاستی دەوڵەتدایە، چونکە تاکەکەس ئاسایش و زامنکاری و سەرپەرشتییان تێدا بەدیدەکا. ئەم تەرزە کۆمەڵایەتییە، تا پاش دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عیراق بەردەوام و پایەدار بوو و دەورێکی گەورەی لە زیانگەیاندن بە ناسنامەی نیشتیمانی و مەدەنیدا بینی و بەها لەکارکەوتوو و پاشکەوتووەکانی خستنە نێو سیستەمی مەعریفی و سیاسیی کۆمەڵ و عەقڵی سیاسیی عیراقی بەستەوە و نەیهێشت بەرەو بنەما ڕەچاوکراوە عەقڵمەندی و بابەتییەکان بچێ.

هۆزە عەرەبییەکان، لە سەردەمانێکی زووەوە و پێش فەتحی ئیسلامی، لە دوورگەی عەرەبییەوە هاتنە عیراق و لێیدانیشتن، سەرەتا لە ڕۆژاوای ڕووباری فورات گیرسانەوە و پاشان لە ڕووبار پەڕینەوە و لە خاکی نێوان دیجلە و فوراتی عیراقدا نیشتەجێبوون و دواجار ئاودیوی بەشی باشووری دیجلە بوون و لە خاکی باکووری کەنداودا، کە بە عەرەبستان ناسراوە، دانیشتن. بەڵام ئەم کۆچانە نەیانتوانی ناسنامەی ژیاریی ئەو دەمەی کۆمەڵی عیراقی بگۆڕن، کە توخمی نەبەتی و زمانی ئارامی و شێوەزمانی سریانی و ئایینی مەسیحی و مەزهەبی نەستووریی ئۆرتودۆکسیی بەسەردا زاڵبوون، تا هاتنەپێشەوەی فەتحی عەرەبیی ئیسلامی؛ کە توانیی ناسنامەی ژیاریی عیراقی بگۆڕێ و لە ڕێی دەسەڵاتی

سیاسی و نیشتەجێکردنی عەرەب و باڵادەستیی ئابوورییەوە، بەرەو ڕۆشنبیریی عەرەبی و ئایینی ئیسلامی ببا؛ کە وای لێهات بنیاتی هۆزایەتیی عەرەبی بوو بە یەکەی کارای پێکهاتنی کۆمەڵی عیراقی. بەوپێیە هۆزەکان پێکەوە لە کووفە و بەسرە، یا پەرشوبڵاو لە دێهاتدا، ژیانیان بەسەربرد. دانیشتووانی ڕەسەنی نەبەتیی ئارامیی عیراق، چوونەپاڵ هۆزە عەرەبییەکان و بوون بە موسوڵمان، بۆ دەربازبوون لە باج و پەیداکردنی دەسکەوتی ئابووری و پارێزگاریی کۆمەڵایەتی، نەک باوەڕهێنان بە ئایینی ئیسلام هانیدابن. وایان لێهات لە لایەنی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، بە مەوالی (واتە مەولا -بەندەی ئازادکراو-ی هۆزێکی دەستنیشانکراوی عەرەبی) ناسران و بە تێپەڕینی ساڵان سەر بە چ هۆزێکی عەرەبی بوونایە، ناسناوەکەیان هەڵدەگرت.

ناوچەی باشووری عیراق، لە سەردەمی عوسمانیدا، بەوە ناسرایەوە کە چەند دەستەبەندی (فیدراسیۆن)یەکی بەهێزی هۆزایەتیی تێدا دەرکەوتن. ئەم دەستەبەندییانە، لە ڕووی تواناییانەوە بۆ دابەشکردنی زەویی کشتوکاڵی و باج و موڵکانە وەرگرتن و ڕاپەڕاندنی زۆربەی کارە حکوومییەکان، لە حکوومەتە بچووککراوەکان دەچوون، تا وا دەرکەوتن کۆمەڵە دەزگایەکی ڕەسمیی خۆبەخۆ دامەزراون. بەناوبانگترینی ئەو دەستەبەندییانە کە سەدەی هەژدەیەم دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرتبوو، بریتیبوون لە: خەزاعیل و مونتەفیک لە دیوی فورات، بەنولام و زوبێد و ئەلبومحەمەد لە دیوی ڕووباری دیجلە و بوونە مایەی تاوسەندنی دەمارگیریی خێڵەکی لە کۆمەڵی عیراقیدا؛ لە کاتێکدا دەوڵەتی عوسمانی بێهێزبوو و نەیدەتوانی ویست و باڵادەستیی خۆی بەسەر سەرتاسەری ناوچەکەدا بسەپێنێ، تاک بە چوونەپاڵ خێڵێکی گەورە نەبووایە کە داڵدەیبدا و بژیو و پارێزگاریی بۆ دابینبکا، پێی نەدەکرا خۆی بپارێزێ. بەو شێوەیە بەهاکانی نەریتی و خێڵەکی کە خۆیان لە تۆڵە و کوشتن لەسەر ناموس و دەخالەت و مەردایەتی و کۆنەدان بە بێگانە و داگیرکاری و ڕاوڕووت و سەرانە سەپاندن و ... دا دەبینییەوە، بڵاوبوونەوە.

لە لایەکیترەوە، حوکمدارانی تورک پێڕەویی هیچ سیاسەتێکی ئەرێنییان نەکرد بۆ نیشتەجێکردنی خێڵات و ئاواکردنەوەی زەوی و ڕێکخستنی ئاودێری و بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەران، بەڵکە سیاسەتێکی نەرێتییان گرتەبەر، خەمی بنچینەیی تێدا کۆکردنەوەی باج و موڵکانە و بەرتیل بوو لە دانیشتووانی دێهات. والییەکانی عوسمانی نەیانتوانی ناوچە خێڵەکییەکان بە تەواوی و ڕاستەوخۆ بخەنە

ژێر ڕكێفی خۆیان، لەبەرئەوەی چەندین گەلەکۆمەی بێهوودە و سەرنەکەوتوویان ڕێکخست و سەرەنجامی کۆتایی کێشایەوە بۆ هەم ملکەچی و ددان‌نان بە دەسەڵاتی خێڵاتدا و هەم بەخشینی چەندەها پارچەزەویی دەرەبەگی و زەویی بەربڵاوی کشتوکاڵی بە سەرۆکهۆزەکان بە شێوەی پابەندبوون (التزام)، بەرامبەر بەو بڕە پارانەی وا ساڵانە دەیاندانە خەزێنە لە بەغدا. بۆیە دەستە و تاقم و هاوپەیمانییە خێڵەکییەکان، زیاتر بەهێز و توندوتۆڵتر بوون. بەڵام نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم ئاڵوگۆڕێکی گەورەی لە بنیاتی هۆزایەتیی عیراقدا بەخۆوەدی، بەتایبەت لە بواری جێگیربوون و نیشتەجێبووندا، پاشتر بووە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی بێهێزی و -لە لایەکیترەوە- تێکچوون و پاشەکشەی سیستەمی هۆزایەتی. ئەوەیش لە دوو ڕووداوی جیادا خۆی نوواند:

یەکەم: کردنەوەی کەناڵی سوێس ساڵی ١٨٦٩ لە نێوان دەریای ناوەڕاست و دەریای سووردا، مەودای نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای نزیککردەوە و نەخشی هەبوو لە بەستنەوەی عیراقدا بە بازاڕی سەرمایەدارییەوە و دەرچوونی لە تەرزی بەرهەمهێنانی سروشتی و ئابووریی خۆژیاندن (الکفاف) بەرەو ئابووریی بازاڕ، ناردنەدەرێی بەرهەمی تێدا لە ١٥٠ هەزار دینار (مەجیدی)ی ساڵانی ١٨٦٤-١٨٧١ەوە، زیادبوو بۆ ٩,٢ ملیۆن دینار ساڵی ١٩١٢-١٩١٣ و ڕێژەی هێنانەناوەوەی بەرهەمیش گەیشتە ١٢ ئەوەندە لە هەمان ماوەدا. بەوپێیە کە هەموو بەرهەمێکی بۆدەرەوەنێردراوی عیراق، بەرهەمی کشتوکاڵی یا ئاژاڵی و هیی دێهات و هۆزەکان بوو، ئەمە بووە مایەی دەرکەوتنی چەند پەرەسە (تطور)یەکی هەڵکشاوی ئابووری و چەند ئاڵوگۆڕێکی گەورەی کۆمەڵایەتی؛ گرنگترینیان ئەمانە بوون: سەرهەڵدانی توێژی گەورەموڵکدارانی زەوی، زیادبوونی دانیشتووان، گەشەسەندنی شارەکان، پەل‌هاوێشتنی پێخوێندن، سەرهەڵدانی پیشەسازیی خۆجێی و چاکتربوونی دۆخی گوزەران و شتیتر. دیاردەی بەرهەمی کشتوکاڵی فرۆشتنی جووتیاران بەبێ ئاگاداریی سەرۆکخێڵ، بووە هۆی هەڵکەوتنی پێوەندیی تازەی لەسەر بناغەی قازانج و بازرگانی، نەک ئینتیما و لایەنگری، دامەزراو و پاشان پاشەکشەی دەسەڵاتی سەربازی و سیاسیی سەرۆکهۆز و ئاغا و بەگەکان و تێکشکانی هاوپەیمانی و میرایەتییە گەورە هۆزایەتییەکان، تا دەرکەوتنی دیاردەی پێشکەوتنی سەرۆکهۆزە لاوەکییەکان و لەباتیی ئەوە، پاشەکشەی سەرۆکهۆزە سەرەکییەکان.

دووەم: مەدحەتپاشا، لە نێوان ساڵانی ١٨٦٩-١٨٧٢دا، جڵەوی والێتیی عیراقی بەدەستەوەگرت و چەند چاکسازییەکی گەورەی لە لایەنە جیاجیاکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاوەدانیدا ئەنجام دا، لەوانە؛ چارەسەری کێشەی نیشتەجێکردنی هۆزەکان و گیرسانەوە و جێگیربوونیان لە عیراق. مەدحەتپاشا ڕوانیی هەموو هەڵمەتێکی سەربازیی هێزەکانی تورک دژ بە خێڵات، نەیانتوانی دەستەمۆیانبکەن، یا بیانخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. ئەمە کارێکیکرد بیربکاتەوە چەند ڕێوشوێنێکی تازە بگرێتەبەر، تا نیشتەجێیانبکا و خەریکی کشتوکاڵ بن. بۆیە پێشنیازیکرد زەویوزاری ئەمیری بە شێوەی موڵکاندن (التمليك-تاپۆ) بدرێ، بابی عالیش دەستخۆشیی لەم پێشنیازە کرد و ئیرادەی سوڵتانیی لەوبارەیەوە بۆ دەرچوو.

هەرچەندە زۆری خێڵات دەستپێشخەرییاننەکرد زەویی کشتوکاڵی بکڕن، لەبەرئەوەی متمانەیان بە دەوڵەتی عوسمانی نەبوو و پێیان وابوو خۆیان سەدان ساڵە لە بنەڕەتدا خاوەنی ئەو زەوییانەن، ئیدی هیچ پاساوێک نییە دووبارە تۆماربکرێن و بکڕدرێنەوە. ئەمە هانی خێزانەکانی نزیکی دەوڵەتی عوسمانیی دا، وەک بنەماڵەکانی سەعدوون و دانیاڵ و سەرکیس و ... کەڵک لەو پرۆژەیە وەربگرن لەسەر حیسابی خاوەنە ڕەسەنەکانی زەوی و ئەم زەوییانە بکڕن و بە ناوی خۆیانەوە تۆماریانبکەن. بەڵام ئەم پرۆژەیە سەروبەر نەخشی لە زیادبوونی نیشتەجێکردن و جێگیربوونی هۆزەکانیدا هەبوو. پاشان گەلێک لەو سەرۆکخێڵانە گۆڕدران بە موڵکدار یا سەرکار. ئەم مەسەلەیە نەخشی لە تێکچوون و پاشەکشەی سیستەمی هۆزایەتیی عیراقدا هەبوو.

ئیدارەی ئینگلیزی، لە قۆناغی داگیرکاریی عیراق و حوکمی ڕاستەوخۆی نێوان ١٩١٤-١٩٣٢دا، لە ڕووی شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵ هۆزەکان و سەرۆکانیانەوە، دابەشبوو بە دوو تاقمەوە: یەکەم- ستیڤن لۆنگریگ Stephen Hemsley Longrigg* داوایکردووە هاوکار و لایەنگری جووتیارانی بچووک بن

---

* ستیڤن لۆنگریگ ١٨٩٨-١٩٧٩ فەرماندەیەکی سەربازیی ئینگلیزە، لە عیراق بە کتێبەکەی "چوار سەدە لە مێژووی نوێی عیراق" ناوبانگیدەرکردووە. زمانی عەرەبیی زانیوە و شارەزاییەکی فراوانی لە کاروباری هۆزە عیراقییەکاندا هەبووە و ١٩٢٧-١٩٣١ وەک ڕاوێژکاری دارایی وەزارەتی دارایی عیراق، پاشان وەک بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوتی عیراق IPC، کاریکردووە.

دژ بە دەسەڵاتی گەورە سەرۆکهۆزان و موڵکدارانی زەوییە کشتوکاڵییەکان و لە موڵکایەتیی زەوی و تێکشکاندنی دەسەڵاتی نەریتیی سەرۆکی هۆزەکاندا، پاڵپشتیی داوای وەرزێرە بچووکەکان بکەن.

دووەم: هێنری دۆبس Henry Robert Conway Dobbs* سەرۆکایەتیکردووە و داواکاربووە ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ سەرۆکهۆزان بکەن و هاوکاری موڵکداران و خاوەنانی زەوییە فراوانەکان بن، تا بنکەیەکی کۆمەڵایەتی پێکبهێنێ، پشتی سیستەمی تازەی سیاسی بگرێ و دەسەڵاتی داگیرکاری لە وڵاتدا بنجبەستبکا.

پاش هێنانوبردنێکی زۆری نێوان بڕیاربەدەستانی ئینگلیز، ڕێککەوتن شێوەی دووەم هەڵبژێرن و بکەونە بەهێزکردنی سیستەمی سەرۆکایەتیی هۆز، کە پاش ئاڵوگۆڕە هاوچەرخەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم، ڕوو لە تێکچوون و هەرەسهێنان بوو. ئەوەیش لە ڕێگەی کۆمەڵێک ڕێوشوێنەوە، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون: دانانی نیزامنامەیەکی تایبەت بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە خێڵەکی و دێهاتییەکان، گوترا وەرگیراوی ئەو نیزامنامەی حوکمە بوو کە سێر ڕۆبەرت ساندمان R. Sandman ساڵی ١٨٧٥ لە هەرێمی بلووچستانی هیندستان دایمەزراند و پێڕەویکرد، کاتێک پێبەپێ ڕوانیی سیستەمی خێڵەکی لەو هەرێمەدا گیرۆدەی داوەشانێکی خێرا و لەبەریەکهەڵوەشان و بێهێزی بوو؛ ئەویش بە دانانی قانوونێکی تایبەت لەوبارەیەوە، دەستیکرد بە بەهێزکردن و پشتگرتنی. بۆیە بەڕێوەبردنی ئینگلیزی ساڵی ١٩١٦ قانوون یا نیزامنامەی داوای مەدەنی و سزایی (جزائي)ی خێڵەکانی دەرکرد، کە ئامانجی پتەوکردنی دەسەڵاتە قەزاییەکانی سەرۆکهۆزەکان و دووبارە بنیاتنانەوەی کۆمەڵە خێڵەکییەکان و ملکەچکردنیان بوو بۆ نیزامنامە دەشتەکی و دێهاتییەکان.

دەزگای بەڕێوەبردنی ئینگلیز ساڵی ١٩١٨ ئەم نیزامنامەیەی لەو هەموو بەشانەی عێراقدا کە کۆمەڵی خێڵەکی و دێهاتییان تێدان، جێبەجێکرد و حکوومەتی عێراقیش

---

* هێنری دۆبس (١٨٧١-١٩٣٤) کارگێڕێکی ئینگلیزە ١٨٩٢ لە ئیدارەی مەدەنیی هیندیدا کاریکردووە و چەند پلەیەکی تێدا هەبووە، وەک گەورەی کۆمیسێران لە بلووچستان ١٩١٧-١٩١٩ و بەشداری بەستنی پەیمانی ئینگلیزی-ئەفغانی بووە، کە بڕیاری لە سنووری نێوان هیندستان و ئەفغانستان داوە. پاشان وەک کۆمیسێری باڵا لە ماوەی ئینتیدابی ئینگلیزدا بەسەر عێراقەوە، لەکاردابووە.

ساڵی ١٩٢٢ وەک قانوونێکی سەربەخۆی جیا لە قانوونی مەدەنی، بڕیاری لێدا و تا شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ کاری پێکرا.

هەروەها ئیدارەی ئینگلیزی کاریکرد بۆ ددانناني ڕەسمی بە دەسەڵاتی سەرۆکهۆزەکاندا، بە قایمکردنی جێوڕێیان و بەهێزکردنیان بە گشت ڕێگە و شێوەیەکی شیاو. بۆیە بەرپرسیی پاراستنی ئاسایش و نیزامی ناوچەکانی خۆیان و دەستگیرکردنی تاوانباران و پارێزگاریی ڕێگەکانی گەیاندن و باجکۆکردنەوەی پێسپاردن، بەرامبەر بە بەشداریپێکردنیان لە حوکمدا، لە ڕێی ئەنجومەنەکانی نوێنەرانەوە و بەخشیش و چەک و قەواڵەی زەویی کشتوکاڵی و شتیتریشی پێدان. ئیدارەی ئینگلیزی، چەند ئەنجومەنێکی تایبەتی بەڕێوەبردنی لە ناوەندی لیواکاندا دامەزراند، لە سەرۆکخێڵەکان پێکهاتبوو، تا تەماشای کاروبار و گیروگرفتە تایبەتەکانیان بکا و ژمارەیەکی زۆریان لە وەزیفە ئیدارییەکانی قەزا و ناحیەکاندا دابمەزرێنێ.

مس بێڵ Miss Bellی سکرتێری ڕۆژهەڵاتیی کومیسێری باڵای بریتانیا لە عیراق، ساڵی ١٩٢٢ جەختی لەسەر بایەخی سەرۆکهۆزەکان کردووە، کە گوتوویە: «ئەوانە ئەو خەڵکەن کە خۆشمدەوێن و من دەزانم هەموو سەرۆکخێڵێک لە سەرتاسەری عیراقدا، ئەندازەیەک بایەخی هەیە و پێم وایە ئەوانە بڕبڕەی پشتی وڵاتن.» بەڵام هێندێ بەرپرسی ئینگلیز ڕەخنەیانگرت لەوە کە لەرادەبەدەر بایەخ بە سەرۆکخێڵەکان دەدرێ و هێز و دەسەڵاتیان بەسەر خێڵەکانیانەوە بە زیادەوە مەزەندەدەکرێ. حاکمی سلێمانی لە ڕاپۆرتێکدا کە ساڵی ١٩١٩* داویە، پێی وایە «دووبارە زیندووکردنەوەی ژیانی خێڵەکی، هەنگاوێکی بەرەوپاشەوەیە. مرۆڤ دەتوانێ بیریبێتەوە کە سکۆتلەند بە درێژایی ئەو ماوەیەی وا لە ژیانی خێڵەکیدا بوو، هیچ شتێکی بەرهەمنەهێنا و وەک بەڵا و نەگبەتییەکی نەتەوەیی مایەوە.» گەلێک بیروڕا سەبارەت بە هۆیەکانی پشتبەستنی ئینگلیز بە سەرۆکخێڵەکان خرانە بەرچاو، لەوانە: بڕوانەکردن بە فەرمانبەرانی حکوومەتی تورک کە بە چینی ئەفەندی ناسراون؛ ئارەزووی دەستگرتن بە خەرجییە سەربازییەکانەوە؛ پشتبەستن بە سەرۆکهۆزەکان بۆ پاراستنی ئاسایش؛ بێلایەنکردنی هێزی خێڵەکان کە ئەوەندە چەک و جبەخانەیان هەبوو، لە دەیان ئەوەندەی هێزی سوپای عیراقی

---

* ئەو دەمە مێجەر سۆن حاکمی سیاسیی ناوچەی سلێمانی بووە (و.ک)

تێپەڕاندبوو و توانایی سەرۆکخێڵەکان بۆ کۆکردنەوەی باج و موڵکانەی زەویی کشتوکاڵی، بە شێوەیەکی زۆر ئاسانتر لە هەر دەزگایەکی تازەی بەڕێوەبردن، ئەگەر ئەو ئەرکەیان پێ بسپێردرابایە.

پێم وایە زیادەڕۆییەک لە وەسفکردنی نەخشی بریتانیادا لە بووژاندنەوەی ژیانی خێڵەکی و نیزامە هۆزایەتییەکانی ناو کۆمەڵی عیراقیدا هەیە، چونکە بنیاتی هۆزایەتی ئەوسا و ئێستەیش لەناو کۆمەڵدا کاریگەرە و -وەک پێشتر گوترا- بە تەواوی لە قۆناغی داڕووخان و تێکچووندا نەبوو، بەڵکوو لە دۆخێکی بێهێزی و دەور و شوێن-گۆڕکێدا بوو لەگەڵ حکوومەت و دەوڵەت، چونکە بەشێکی گەورەی کۆمەڵی عیراقی لە سەردەمی عوسمانیدا -و تا ساڵانی چلیش- سروشتێکی خێڵەکیی هەبوو. بەوپێیە هۆز دەورێکی سەرنجڕاکێشی کۆمەڵایەتی و سیاسیی گێڕا. لەبەرئەوەی کەرەستەیەکی زۆروزەوەندی ماددی و مرۆیی کەوتنە ژێر دەستی سەرۆکهۆزەکان، ئەمە خۆژیێنی و سەربەخۆییەکی جیا لە دەسەڵاتی ناوەندیی دا بە خێڵەکان. سروشتی جوگرافیی شوێنی خێڵەکانیش لەم لایەنەوە پاڵپشتیانبوو، لە کاتێکدا ١٠\٩ی زەویی دێهاتیان لەژێر دەستدا بوو و دەوری قەزا و ناحیەکانیان دابوو و تۆڕی گەیاندنی وڵاتیان خستبووە ناو چنگی خۆیان. تەنانەت -گوتیان- لە دەوروبەری بەغدا و بەسرە نەبێ، خێڵەکان گەورەترین هێزی دەستوەشێنیان لە وڵاتدا هەبوو. نەک بە ژمارە، بەڵکوو لە ڕووی جیاوازیی سەربازیشەوە باڵادەستبوون؛ لە کاتێکدا بڕی ١٠٠ هەزار تفەنگ بە دەست خێڵەکانەوە بوو، سوپای عیراق هەر ١٥ هەزار تفەنگی هەبوو! لەبەرئەوە پشتبەستنی ئینگلیز بە دەسەڵاتی هۆز، ئەنجامێکی بەدیهاتووی ئەو بنیاتە کۆمەڵایەتییە نەریتییە زاڵە بوو کە ڕەگی لە کۆمەڵی عیراقیدا داکوتابوو.

سیاسەتی ئینگلیز بۆی سەرچوو گەلێک سەرۆکخێڵ لەخشتەببا و بیانهێنێتە ڕیزی خۆی و دووریانبخاتەوە لە داواکانی خوێندەواران و نیشتیمانپەروەران و پیاوانی شۆڕشگێڕی ئایینی، بۆ سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی حکوومەتێکی خۆجێیی عیراقی. بەڵام -لە لایەکیترەوە- نەیتوانی هێندێ سەرۆکیتر فریوبدا، لەوانە کە ئەو داوایانە کاری تێکردن، بەتایبەت لە ناوچەی فوراتی ناوەڕاستی نزیک بە ناوەندە ئایینییەکانی نەجەف و کەربەلا، کە ئەوسا ڕێبەرایەتیی جووڵانەوەی سەربەخۆییان دەکرد. لە کاتێکدا زۆر لەو سەرۆکهۆزانە بەپیر ئەو بانگەواز و داوایانەوە چوون، لە ڕێی بەشداریی چالاکانەیانەوە لە شۆڕشی

ساڵی ۱۹۲۰ی عیراقدا؛ لە ڕوویەکیترەوە دەبینین زۆریان لە قۆناغەکانی ئەو شۆڕشەدا دانیشتن و هیچیان لێنەوەشایەوە. ئەگەر هەندێکیان لەو هەلومەرجە سەختانەدا بە ڕاشکاوی هەڵوێستی خۆی دەرهەق بە ئیدارەی ئینگلیزی ئاشکرانەکردبێ، بەشێکی سەرۆکخێڵەکان هەڵوێستی سازشکەرانەی خۆی تەنانەت بەسەر ڕۆڵەکانیتری خێڵەکەیدا سەپاند. وێڕای ئەوە، دەسەڵاتدارانی بریتانیا بە تەواوی دەستیان لە خێڵەکانی عیراق نەشوشتبوو و لەو بڕوایەدابوون دەبنە پشتیوانی دەسەڵاتە تازەکەیان کە کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الأمم) و نیزامنامەی ئینتیدابی ساڵی ۱۹۲۰ جەختیان لەسەر کردبوو؛ ئەویش بە قەناعەتپێکردنیان کە دەسەڵاتی ئینگلیز داواکانی پیاوانی دینیی لە شۆڕشی بیستدا بەدیهێناون بۆ دامەزراندنی دەوڵەت و ئیدارەیەکی خۆجێیی و دانانی فەیسەڵ کوڕی حوسێن بە مەلیکی عیراق. زیادبوونی ژمارەی سەرۆکخێڵان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقدا، ئەوەی بەرجەستەکرد. لە کاتێکدا مەجلیسی مەبعووسان لە سەردەمی عوسمانیدا. و پاش شۆڕشی ئیتیحادییەکان ساڵی ۱۹۰۸، هەر یەک نوێنەری سەر بە خێزانی سەرۆکخێڵانی تێدابوو، عەبدولمەجید شاویی سەر بە خێڵی عوبێد، لە کۆی ۳٤ نوێنەری هەرسێ ویلایەتی عیراق، ساڵی ۱۹۲٤ نزیکەی ۱٤ سەرخێڵ لە کۆی ۹۹ ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندن (المجلس التأسيسي)دا هەبوو و ئامادەگیی کارای سەرۆکخێڵەکانیش لە ئەنجومەنەکانی ئەوەبەدوای نوێنەراندا، لە ڕێگەی قۆستنەوەی هەلی پێوەندیی ناوازەیانەوە بە موتەسەڕیفەکان و دەستبژاردەی حوکمدارانی بەغداوە، بەردەوامبوو.

لە هەر چوار خولی هەڵبژاردنی ساڵانی ئینتیدابی بریتانیادا و هەر لە ئەنجومەنی دامەزراندنەوە تا خولی سێیەمی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران، دەرکەوت ژمارەی کورسیی سەرۆکخێڵان لە نێوان ۲۰-۲٤ی کۆی ۸۸ کورسیدا بوو، واتە بە ڕێژەیەکی نێوان ۲۳-۲٦٪. ئەگەر گەورەموڵکداران و بازرگانان و دەلالان بخەینە سەر ڕێژەی ئەو سەرۆکخێڵە نوێنەرانە، لە نیوەی ئەندامان زیاتردەبێ، کە ڕێژەیەکە بەشی ئەوە دەکا لە ڕووی هەر قانوونێکدا بوەستن لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو چینانە ڕێکنەبێتەوە. هەرچی ئەنجومەنی پیران (أعيان)یشە، کە مەلیک خۆی ئەندامەکانیی دەستنیشاندەکرد، ڕۆڵەکانی بنەماڵە ئەریستۆکراتییە دەسترۆکان و هێندێ گەورە سەرۆکخێڵی لەناودابوون. بەڵام ژمارەی ئەندامانی چینی دوایی، لەچاو ژمارەی ئەنجومەنی نوێنەراندا، بە کەم

دادەنرێ. یەک پیر لە کۆی ٢٠ پیری یەکەم خولی ئەنجومەن، تەرخان‌کرا نوێنەرایەتیی سەرۆک‌خێڵەکان بکا. ژمارەکە زیادبوو بۆ دوو پیر لە خولی دووەمدا و پاشان پێنج پیر لە خولی سێیەمدا. سیاسەتی ئینگلیز بە شێوەیەکی سەرەکی پشت‌ئەستوور بوو بە هێزە نەریتییەکانی دژ بە کۆمەڵی نوێی مەدەنی لە عیراق، واتە بنەماڵە و هۆز کە ئینگلیزەکان کەوتنە بەکارهێنانیان، نەک هەر لە چوارچێوەی هاوسەنگ‌ڕاگرتنی دەسەڵات و سیاسەتە لیبراڵەکەی مەلیک فەیسەڵدا بۆ بنیاتنانی کۆمەڵێکی یەکگرتوو و بەهێزکردنی پێگەی دەستبژاردەی ڕۆشنبیر و خوێندەوار، بەڵکوو بۆ بەرەنگاریی ئەو هێزە نوێیە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی وا لە ناوەندە مەدەنییەکانی عیراقدا سەریان‌هەڵدا، وەک حیزب و ڕێکخراوە سیاسییە خوازیارەکانی چاکسازی.

دەسکەوتەکانی سەرۆک‌هۆزەکان لە سەردەمی ئینتیداب (١٩٢٠-١٩٣٢)دا، تا ڕادەیەکی زۆر زیادیان‌کرد و سەرەتای ساڵانی سی گەیشتنە ترۆپک، کاتێک گەلێ قانوون دانرا، سەروبەر بە قازانجی سەرۆک‌خێڵان بوو دژ بە جووتیاران و بە پێشنیازێک لە لایەن پسپۆڕی شارەزای ئینگلیز، سێر ئێرنست داوسن Sir Ernest Dowsonەوە، پێشکەش‌کرا، کە ساڵی ١٩٣١ ڕاپۆرتێکی خۆی سەبارەت بە گیروگرفتی زەوی‌وزاری کشت‌وکاڵی لە عیراق خستە بەردەست، ئەویش: قانوونی ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٣٢ی یەکلاکردنەوەی مافەکانی زەوی‌وزار و قانوونی ژمارە ٥١ی ساڵی ١٩٣٢ی لەزمە (اللزمة)* و قانوونی ژمارە ٢٨ی ساڵی ١٩٣٥ی ماف و ئەرکەکانی جووتیاری لێ‌کەوتنەوە، کە مافی قانوونییان بەخشییە سەرۆک‌خێڵەکان، تا دەست‌بگرن بەسەر ئەو زەوییانەدا کە موڵکی هاوبەشی خێڵ بوون و بە ناوی خۆیانەوە تۆماریان‌بکەن. وایش دانرا قەرزی سەر جووتیار و سەرکار کە بۆ موڵکداری زەوی یا سەرۆک‌خێڵ بوو، قەرزێکی نایاب بێ، پێش کارکردن یا گواستنەوە بۆ مەزرای‌تر بدرێتەوە. ئەم مەسەلەیە دوو دیاردەی خستەڕوو:

---

* لەزمە: اللزمة، ئەو مافانەیە کە لە زەوی‌وزاری میریدا دەبەخشرێنە کەسێک، ئەویش بۆی هەیە زەوییەکە بەکاربێنێ، بە داچاندن و دارتێداڕوواندن و ئاش و کۆگا و تەویلە و خانوو و شتی وەهایشی تێدا بنیات‌بنێ (بڕوانە: قانون اللزمة رقم ٥١ لسنة ١٩٣٢). (و.ک)

یەکەم: پێشکەوتنی پێوەندییەکانی موڵکایەتیی کشتوکاڵی و بازرگانی و پاشەکشەی پێوەندییەکانی خزمایەتی و نزیکایەتی. بۆیە موڵکایەتی بووە بنچینەی ڕێکخستنی ڕیزبەندی کۆمەڵایەتی، نەک خێڵایەتی.

دووەم: موڵکدارانی زەوی (سەرۆکخێڵەکان) بوون بە چینێکی دەرەبەگی، پێوەندیی ئابووری و سیاسی دەیبەستنەوە بە دەوڵەمەندانی شار و بازرگانان و گەورە فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە.

دەرکردنی ئەم قانوونانە کە هەموویان خرانە خزمەتی بەرژەوەندی سەرۆکهۆزەکان، هەندێ توێژەرەوە بە سەرەتای دەرەبەگایەتی یا سیستەمی نیمچەدەرەبەگیی لە عیراقدا لەقەڵەمدەدەن و جەختدەکەنەوە کە پێوەندیی نێوان جووتیار و سەرۆکهۆز پێش ساڵی ١٩٣٢، پشتی بە ڕیزبەندی خزمایەتی و خێڵەکی دەبەست؛ لە کاتێکدا پاش ئەم مێژووە وای لێهات پشت بە ڕیزبەندی ئابووری و بازرگانی ببەستێ، چونکە ئیتر سەرۆکهۆز پێویستی بە هەبوونی جووتیاری جەنگاوەر نەبوو -وەک لە سەردەمی عوسمانیدا باوبوو، لەبەر دامەزرانی دەوڵەتی عیراق و بنیاتنانی دەزگا سەربازی و ئەمنییەکانی و نەمانی جەنگ و ململانێی نێوان هۆز و خێڵەکان. دیارترین کەسێک ئەم بۆچوونەی هەبووبێ، دکتۆر عەلی وەردی بوو، پێشتر بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە سیستەمی کۆمەڵایەتی لە وڵاتدا خێڵەکییە، ڕایگەیاند: دەرەبەگایەتی لە عیراقدا نەبووە. بەڵام پاشتر بەدوای ئەم مەسەلەیەدا چوو و پشتیوانیی بۆچوونی بیرمەندی مارکسی، ئیبراهیم کوببەی کرد کە ڕایگەیاند: سیستەمی کۆمەڵایەتی لە عیراقدا، پاش دەرکردنی قانوونەکانی یەکلاکردنەوە و لەزمەی ساڵی ١٩٣٢، گۆڕدرا بە سیستەمی دەرەبەگایەتی یا نیمچەدەرەبەگی. ئەم ئاڵوگۆڕەیش کارێکیکرد حاڵی جووتیاران لە ڕۆژگاری سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی زیاتر نالەباربێ؛ واتە سەروەختێک کە بەشێکی گەورەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی، بە شێوەیەکی تا ڕادەیەک دادپەروەرانە بەسەر تاکەکانی خێڵدا دەبەشرایەوە.

ساڵانی سی، پاش دەرچوونی ئەو قانوونانە، دەسکەوتی ئابووریی سەرۆکهۆزەکانی تێدا زیادبوو، بەڵام دەسەڵاتی سیاسی و سەربازییان پاشەکشەیەکی بەرچاوی بەسەرداهات؛ پاش ئەوەی هێزە چەکدارەکانی عیراق بە ژمارە و چەک زۆر زیادیانکرد، سەرباری دەرکەوتنی جێوڕێی ئەفسەرانی عوسمانی- شەریفی و

موڵکدارانی شاران و کاربەدەستانی پایەبڵندی دەوڵەت. هۆی سەرەکیی ئەم پاشەکشەیە، دەستوەردانی هەندێ سەرۆکخێڵ بوو لە ململانێی سیاسیی ساڵانی ١٩٣٤-١٩٣٦ی نێوان دەستبژاردەی حوکمدار. سەرۆکهۆزانی وەک مەرزووق عەواد و عەلوان حاجی سەعدوون و ڕایح عەتییە و خەوام فەرهوود و داخل شەعلان، چوونەپاڵ بەرەی جەودەت ئەیووبی و جەمیل مەدفەعی، لە کاتێکدا شەعلان عەتییە و عەبدولواحید سوکەر و حەبیب خەیزەران چوونەپاڵ بەرەی یاسین هاشمی و ڕەشید عالی گەیلانی. لە ئەنجامی ئەوەدا، چەند چالاکییەکی سەربازی دژی ئەم خێڵانە بەڕێوەبرا، دەیان قوربانیی لێکەوتەوە. حەننا بەتاتو، سەرکوتکردنی ڕاپەڕینە خێڵەکییەکانی ئەو ساڵانەی بە زەنگی بەئاگاهێنانەوەی کۆتاییهاتنی قۆناغ یا تەرزێکی کۆنی مێژووی نوێی عیراق، مێژووی خێڵات و سەرۆکخێڵەکان، داناوە، چونکە پشێوی و شۆڕش و ڕاپەڕینە سیاسییەکانی پێش ئەم مێژووە، بە مۆرک و بنچینە خێڵەکی بوون و دیارترینیان شۆڕشی ١٩٢٠ە، کە هێزی چالاکی سەربازیی تێدا هێزی سەرۆکخێڵەکان و خێڵەکان بوو؛ بەغدا، هەر بە خۆپیشاندان و بەشینەوەی بڵاوکراوەی نهێنی و شتی وەها بەشداریی تێدا کرد. پاش ئەم ڕووداو و ڕاپەڕینانەی پێشوو، مێژوو لە عیراقدا گواستیەوە بۆ بەغدای پایتەخت، کە ئەو ساڵانە و لەوەبەدوا بوو بە تەوەری ڕووداوە سیاسی و کودەتا سەربازی و شۆڕشە جەماوەری و ڕاپەڕینە خوێندکارییەکان؛ بە کودەتای ساڵی ١٩٣٦ی بەکر سدقی دەستی پێکرد و بە کودەتای تەمووزی ١٩٦٨یش کۆتاییی پێهات. بەڵام جووڵانەوەی مایسی ١٩٤١ کە ئەفسەرانی عیراقی بە هەندێ تێڕوانینی توندڕۆی سیاسی و نەتەوەییەوە ڕێبەرایەتییاندەکرد، نەخشی هەبوو لە دووبارە پشتبەستنەوەی دەسەڵاتی حوکمداردا بە سەرۆکخێڵەکان و جارێکیتر جێوڕێی لەبەرچاوگرتنەوە و سازوتەیاریکردنەوە؛ لەبەرئەوەی بەشدارییان لەو جووڵانەوەیەدا نەکرد، یا پاڵپشتینەبوون، هەرچەندە زانایانی دینیی شیعە و سوننە پێکەوە جیهادیان ڕاگەیاند. قۆناغی نێوان ١٩٤٦-١٩٥٨، هاوپەیمانێتیی عەبدولئیلاهی سەرووەسێت (الوصي) و نووری سەعیدی لەگەڵ گەورە سەرۆکهۆزەکان و ئاغایان و موڵکداران بەخۆوەدی، بۆ بەرەنگاریی ئەو مەترسییە کە هەڕەشەی لە دەستبژاردەی حوکمدار دەکرد و بریتیبوو لەو جووڵانەوە شۆڕشگێڕی و چەپڕۆیانە کە پاش دووەم جەنگی جیهانی بە هێز و گوڕەوە خۆیان ڕێکخست و پێکهاتن. یەکێک لە گرنگترین ئامانجەکانی ئەو هاوپەیمانێتی و سازوتەیارکردنەی سەرۆکخێڵان، زیادبوونێکی دیاری ژمارەی کورسییەکانی ئەو قۆناغەی پەرلەمان بوو کە بۆیان

تەرخانکرابوو، تا ڕێژەی ئەو سەرۆکخێڵ و ئاغایانە گەیشتە ٣٧٪ ساڵی ١٩٥٤، لە کاتێکدا ڕێژەی نوێنەرایەتیی ساڵانی ١٩٤٧-١٩٥٨یان لە وەزارەتدا بەرزبووەوە بۆ ٦٪ پاش ئەوەی لە ساڵانی ١٩٣٢-١٩٤١دا هیچ نەبوو.

ساڵانی پەنجا، ژیانی سیاسی و ئابووریی دانیشتووانی شارەکان زۆر بووژایەوە و بووە سۆنگەی کەمبوونەوەی کاریگەریی داب و خووە خێڵەکییەکان و کزبوونی پێوەندییە نەریتییەکان، وێڕای گەشەکردنی هۆشیاریی نیشتیمانی و شارستانی و دەرکەوتنی حیزبە سیاسییە شۆڕشگێڕەکان و ... کە لە ئەنجامدا سەرۆکخێڵەکان زۆری ئەو بنکە کۆمەڵایەتییەی وا پشتیان پێدەبەست، لەدەستیان دا و هێزی سیاسییان کەوتە شەڕێکی دۆڕاو لەگەڵ هێزە نوێیەکانی کۆمەڵی مەدەنی کە لەو ماوەیەدا خۆیان پێکەوەدەنا؛ تا ئەو کار و سەرکەوتنە بە شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ یەکلابوونەوە، کە بڕیاری ژمارە ٣٠ی لە قانوونی چاککردنی کشتوکاڵ دا و کۆتاییی بە دەوری سیاسی و ئابووریی سەرۆکخێڵەکان هێنا.

گەلێک مێژوونووس و توێژەرەوە کاری لەسەر گرفتی پێوەندیی ئاڵۆزی نێوان جووتیار و سەرۆکهۆز لە عیراقی قۆناغی سەردەمی پاشایەتیدا کردووە؛ هەندێکیان لێکۆڵینەوەی بابەتی و ئەکادیمین و ئەوانیتر بەئایدیۆلۆجیکراون یا هاوسۆز و لایەنگرن. بەڵام ئەو دکتۆرانامەیە کە حەننا بەتاتۆ ساڵی ١٩٦٠ بە ناونیشانی "سەرۆکهۆز و جووتیار لە عیراق ١٩١٧-١٩٥٨"ەوە پێشکەشی زانکۆی هارڤاردی کردووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، لێکۆڵینەوەیەکی پێشەنگی ئەم بوارەیە، لەبەر هەم خەسڵەتی بێلایەنی و بابەتیبوونەکەی و هەم پشتبەستنی بە تێڕوانینێکی تازە و پێکەوە کۆکردنەوەی میتۆدی کارڵ مارکس و تێڕوانینی ماکس ڤیبەر لە شیکردنەوەی کۆمەڵە عەرەبییەکاندا، لەوانەیش عیراق. تەنانەت چین ی Class لە مەقام یا پایەبڵندی Status جوێکردووەتەوە. چین بە ئابووری و موڵکایەتی، جێوڕێ یا سەرداری و پایەبڵندی بە بنەچە و پێخوێندن و پێشینەی دینی و ئەتنی، دیاریدەکرێ. ئاشکرا دەبینین جەختی لەسەر بنیاتە کۆمەڵایەتییەکان و چینە کۆنەکان کردووە، نەک ڕیزبەندیی چینایەتی کە تیۆریی مارکسیی لەسەر هەڵچنراوە و ساڵانی پەنجا و شەست لای دەستبژاردەی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕی عیراقی زۆر لەبرەودابوو. بەڵام بەتاتۆ هاوکێشەی کاریگەریی سیاسی و ئایدیۆلۆجی و حیزبیی لەو تێز و چالاکییانەدا خستووەتە سەر میتۆدی هەم ماکس ڤیبەر لە لێکۆڵینەوەی چینە کۆنەکاندا و هەم مارکس لە

شیکردنەوەی دیوە کارا و کاریگەرەکانی لایەنە ئابوورییەکانی ئەو چینانەدا، چونکە پێی وابووە ئەم ڕێبازە لە ڕەوتە کۆمەڵایەتییەکان و ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکانی وڵاتدا بایەخدارە و دەورێکی سەرەکیی هەیە لە گەڵاڵەکردن و دروستکردنی گەلێک بڕیاری سیاسیدا کە مۆرکیان ئابوورییە و کاریگەریی کۆمەڵایەتییان ڕاستەوخۆیە، وەک قانوونە حکوومییەکانی ساڵی ١٩٣٢ی سەردەمی پاشایەتی، کە چەمکی دەرەبەگایەتی یا سیستەمی نیمچەدەرەبەگیی لە وڵاتدا قووڵکردەوە و بنجبەستیکرد. ئەو میتۆدە زانستییە نوێیانە بە ڕوونی لە تێزەکەیدا "سەرۆکهۆز و جووتیار لە عیراق" دەرکەوتوون، بە شیکردنەوە تۆکمە سایکۆ-سۆسیۆلۆجی و ڕانوواندنە ناوازەکەی، کە پشتی تێدا بە زەمانبەندیی مێژوویی و قانوونی و نەریتی بەستوون و پێبەپێی دیمەنی شانۆی سیاسیی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی عیراق، تێکەڵ بە ئاڵوگۆڕە سیاسی و گۆڕانکارییە حکوومی و پەرەسە (تطور) ئابوورییەکانی کردوون.

ئەو ئەرکە هەڵاواردەیە کە ئوستادی دکتۆر سادق عەبد عەلی ترێخم بە هەوڵێکی خۆیی و تایبەتی و بەبێ ڕاسپاردنی حکوومەت یا یارمەتیی ئەکادیمیایەکی عیراقی کێشاویە لە وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی ئەم تێزە بەهادارە بابەتییەدا، کە یەکێک لە گرنگترین سەردەمە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی وڵات دەگرێتەوە، دەسکەوتێکی جێگەی سوپاسە و کارێکە شایانی ستایش و ڕێزلێنانە. دەستپێشخەرییە بەنرخەکەی ئەو نەبووایە، ئەم تێزە ماوەیەکی درێژ لەناو تاقەکانی کتێبخانەکانی زانکۆی هارڤارددا دەمایەوە، وەک خۆی پێشتر -جگە لە وەرگێڕان- پتر لە ٥٧ ساڵی بەردەوام بەبێ ڕانوواندن یا توێژینەوە یا لێکۆڵینەوەی ئەکادیمییەکانی عیراق مایەوە. بەوە دەرسێکی وامان لە بەدواداچوون و دەستپێشخەری و پەرۆشی بۆ ئەو بەرهەمە فیکری و ڕۆشنبیرییانە دەداتێ کە پێوەندییان بە مێژوو و حاڵوبار و تەرزە کۆمەڵایەتییەکانی عیراقەوە هەیە؛ زۆر ڕۆشنبیر و ئوستادی زانکۆکان لەسەر ئەوە حەسوودیی پێدەبەن. چۆن؟ خۆ کارەکە هیی ئوستادی لێکۆڵەرەوە و توێژەرەوەی پێشەنگ خودابەخشیو حەننا بەتاتۆیە، کە عیراقییەکانی خۆشویستووە، کاتێک کتێبی "چینە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان و جووڵانەوە شۆڕشگێڕییەکانی لە عیراق"ی پێشکەشی گەلی عیراق کردووە. عیراقییەکانیش -لە لایەکیترەوە- خۆشیانویستووە، لەبەر بابەتیبوون و پەرۆشی و ئەو کۆششە کە خەرجی و ساڵان و ئەرکێکی زۆری

لەسەر کەوتوون و چەند شاکارێکی نەمر و ناوازەی بەرهەمهێناوە، لە ڕووی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن و دەرهێنانەوە، باڵاترین میتۆدی فیکری و زانستیی تێدا تۆمارکردووە؛ تا چەندین سەدە وەک سەرچاوەی دەستی یەکەمی لێکۆڵینەوە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییە ئەکادیمییەکان دەمێنێتەوە.

دواجار دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بەوە بدەم کە تێزە ئەسڵییەکە هێشتا بەند یا فەسڵ یا باسەکانی لێک جوێنەکرابوونەوە، وەرگێڕ بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە داینان و ڕێکیخستن.

**دکتۆر سەلمان ڕەشید محەمەد هیلالی**

عیراق- زیقار، ٢٠١٨/٢/٢٠

## سوپاس و ڕێزلێنانی وەرگێڕی عەرەبی

حەزدەکەم سەرەتا بێگەردترین سوپاس و ڕێزلێنانم پێشکەشی بەشی ئەرشیفی زانکۆی هارڤارد Harvard University Archives بکەم، بەتایبەت سەرۆکی بەشەکە، خاتوو ڤێرجینیا هەنت Verginia Hunt و ئەوانە کە نوسخەیەکی تێزەکەی دکتۆر حەننا بەتاتۆیان بۆ دابینکردم و ڕەزامەندیی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەییان دامێ. ئەوە نەبووایە، ئەم تێزە بە عەرەبی ڕووناکیی نەدەبینی. بۆیە هەموو سوپاس و ڕێزلێنانێکیان پێشکەشدەکەم.

هەروەها سوپاسی زۆری ئوستادی دکتۆر سەلمان محەمەد ڕەشید هیلالی دەکەم، کە دەورێکی بنچینەیی لە پێداچوونەوەی وەرگێڕانەکە و پێشەکیینووسینی کتێبەکەدا هەبوو، هەموو خۆشەویستی و سوپاس و ڕێزلێنانێکی پێشکەشە. دکتۆر هیلالی ناساندنی پێناوێ، توێژەرەوەیەکی بایەخداوە بە مێژووی نوێی عیراق و گەلێک توێژینەوەی لەم لایەنەوە هەیە، لەوانە: "ظاهرة السادة في المجتمع العراقي"، "تطور مفهوم الوطنية في العراق"، "المجتمع العراقي بين الشروكية والإنكشارية" و توێژینەوەی بەهاداریتر لەم مەیدانەدا. لە دانراوەکانیشی: "عزيز السيد جاسم ودوره الفكري والسياسي في العراق"، "التيارات الفكرية في العراق" و هیتریدی.

هەروەها سوپاسی بڵاوکەرەوە، مامۆستا ستار عەلیی خاوەنی "دار السطور للنشر" و ئوستاد بیلال موحسین بەغدادیی بەڕێوەبەری خانەی بڵاوکردنەوەکە دەکەم، کە دەرهێنان و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەیان بەم شێوەیە و دابەشکردنیان لە ناوەوە و دەرەوەی عیراق گرتە ئەستۆ؛ لە منەوە سوپاس و ڕێزلێنانیان پێشکەشبێ.

دواجار ئاواتەخوازم لەبیرم نەچێ سوپاسی هەندێ ناوی گرنگ بکەم، لەوانە ئوستادی ئەندازیار حەیدەر عەبد عەلی ڕوکابی و ئوستادی دکتۆر عەلاء عەبدولحسێن هاشم عیبادیی سەرۆکی بەشی زمانی ئینگلیزی لە کۆلیجی پەروەردەی زانکۆی بەسرە و ئوستادی دکتۆر عەلی فەوزی ئیبراهیمی ڕاوێژکار لە ئەنجومەنی شوورای دەوڵەت و ئوستادی دکتۆر ناجی عەباس ڕوکابیی ئوستادی زمانی عەرەبی لە زانکۆی زیقاڕ و دکتۆر عەبدولکازم ئەسەدیی ئوستاد لە زانکۆی

مرۆڤایەتی و پەروەردەکەری هێژا ئوستاد عەلی حەسەن قەرەغۆلی؛ هەموو خۆشەویستی و سوپاس و ڕێزلێنانێکیان لە منەوە پێشکەش بێ.

سادق عەبد عەلی ترێخم

بەغدا، ٢٠١٨

sadiqrikabi@yahoo.co.uk

## سوپاس و ڕێزلێنانی دانەر

هاوینی ١٩٥٧ و کاتێک ئەو توێژینەوەیە کە کاری تێدا دەکەم، بەهۆی کەموکووڕیی سەرچاوەکانەوە سەبارەت بەو وڵاتە، بە بنبەست گەیشت، عەبدولحەمید دامرجی کە هاوڕێمە و خوێندکارێکی عیراقیی خەڵکی بەغدایە، دەستپێشخەریی نوواند خۆی خەرجیی گەشتی ڕۆژهەڵاتی نزیکم بکێشێ. ئەم دەستپێشخەرییە جوامێرانەیە، سەرباری بەخشیشی ئەنجومەنی توێژینەوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و یارمەتیی دارایی ناوەندی توێژینەوەی ڕووسی و ناوەندی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە هەردوو سەر بە زانکۆی هارڤاردن، لەو ساڵە و ساڵانی پێشتردا؛ کارێکیانکرد ئەم لێکۆڵینەوەیە کە لە بەردەستتاندایە، بەرهەمبێ.

ماوەی مانەوەم لە هارڤارد و لە قۆناغێکی دەستنیشانکراوی بەجێهێنانی ئەم توێژینەوەیەدا، پشتیوانی و هاندانم لە ئوستاد هـ. ئا. ڕ. گیب H. A. R. Gibb و میریل فەینسۆد Merele Fainsod و ئادام ئولام Adam Ulam و مارشاڵ د. شولمان MarShall D. Shulman و جۆرج کیرک George Kirk و دێروود و. لۆکارد Derwood W. Lockard و هەروەها لە خاتوو هێلین و. پارسۆنس Helen W. Parsons پێگەیی؛ لە دڵەوە سوپاسگوزاریم پێشکەشی هەموویان دەکەم.

هەروەها من زۆر قەرزداری گەلێک عیراقیم، لەوانە کە ساڵانی ١٩٥٧-١٩٥٨ یا کاریان لای حکوومەت یا لە بەندیخانەکان دەکرد، یان خەڵکانێکی فەرامۆشکراون و ئەوانە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕازیبوون دەستی یارمەتیم بۆ درێژبکەن، لەبەرئەوە زانیاریی زۆریان خستە سەر تێگەیشتنم لە وڵات و گەلەکەیان.

## پێشەکیی دانەر

سەرۆکهۆز تا شۆڕشی ١٩٥٨ بە کردەوە حاکمی دێهاتی خێڵەکی بوو، کە زۆربەی گەلی عیراقی لێدەژیا. بەڵام -وێڕای ئەوە- ئێستە دەسەڵاتەکەی لەناوبراوە، لە کاتێکدا ئەو عەقڵمەندییە کە بەرهەمی شێوازی ژیانی سەرۆکهۆزە، هێشتا ماوە. ئەم بنەما ڕەچاوکراوانە، سەرەڕای ئەم بابەتە، بایەخێکی پێویستیان پێنەدراوە، هەروەها ئێمە زانیاریی گرانبەهامان لەو ڕاپۆرتانەی ئینگلیزدا کە بە شێوەیەکی سنووردار دەستاودەستیان پێدەکرێ و لە فایلە نهێنییەکانی هەواڵگری و فایلە کارگێڕییەکاندا بەرچاوکەوت؛ هەموو ئەمانە هانیاندایین ئەم توێژینەوەیە بە ئەنجام بگەیێنین.

ئەم تێزە بە هەوڵی چوونە بنچوبناوانی دەسەڵاتی سەرۆکهۆز دەستی پێکرد. پەردەمان لەسەر پێوەندیی پێچەوانەی نێوان پشکەکانی دەسکەوتی هەر یەکە لە سەرۆکهۆز و شار هەڵدایەوە. سەرۆکهۆز، وەک دیاردەیەکی کاتی پشێوییەکان، لە دۆڵی دیجلە و فوراتدا دەرکەوت و دەسەڵاتەکەی ئەنجامی تێشکانی درێژمەودای شارەکانی دوابەدوای هەرەسهێنانی خەلافەتی عەباسی بوو و ماوەی نێوان سەدەی سیازدەیەم و سەدەی هەژدەیەمیش باڵادەستبوو. ئەم ماوەیە بۆ سەرۆکهۆزەکان و خێڵەکانیان، ماوەی پەلاماری بەردەوام و گۆڕانکاریی خێرا بوو. دۆخەکە، لە کاتی خۆیدا، جەختی لەسەر بەهاکانی ئازایەتی و جەربەزەیی و جموجووڵی خێرا دەکردەوە. لێرەوە هەم بنەڕەتی سەرۆکهۆز وەک جەنگاوەرێک دەستی پێکرد و هەم مەراقی خولقاندنی هۆزگەلی شەڕکەری دەستهەڵێن، بەتایبەت لە خەڵکانی خاوەنوشتر، بۆ ئەوەی دەستێکی باڵایان بەسەر هەموو پیاوانیتری هۆزەکاندا هەبێ. ئەمڕۆ سەرەتای دابەشبوونی کۆمەڵایەتیی ناو هەندێ هۆز، دەبرێتەوە بۆ ئەم باڵادەستییەی دەشیەکیی جەنگاوەر بەسەر جووتیاردا. ئەم دابەشبوونە، بە هاتنی تاپۆ بۆ ناو دنیای هۆزەکان لە دوایین چارەکی سەدەی نۆزدەیەمدا و پاشان هاتنەناوەوەی سیستەمی لەزمە لەم دواییانەدا، کە لە سیستەمی موڵکایەتیی تایبەت دەچێ، بە ڕوونی دەرکەوت.

ئەم توێژینەوەیە، باسی سیستەمی سەرۆکهۆزەکان و چۆنایەتیی کارکردنیی، پێش سەرهەڵدانی پێوەندییە تازەکان لەگەڵ زەوی، تێدا کراوە. هەروەها شەقڵە سەربازی و ئابووری و باوکسالاری و کۆمەڵایەتییەکانیشی وەسفکراون. ئەمجا نیشانماندراوە کاتێک شارەکان دەوریان گێڕا و نەخش و جێوڕێی خۆیان بەدەستهێنایەوە، ئەوە چ کارێکیکردە سەر ئەم سیستەمە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە سەریهەڵدا و سەرەتاکانی بە پێکدادانی ئیمپریالیزمی ڕۆژاوایی و ئیمپراتۆریی عوسمانی دەستیان پێکرد. ڕاستییەکەی، ئەوسا دەسەڵاتی سەرۆکهۆز ڕووی لە کزی کرد و هۆزی سەرچاوەی قەوارەکەی خۆیشی بەرەو لەبەریەکهەڵوەشان چوو.

لەم قۆناغەدا، ئەو دیاردە نائاساییەی دوابەدوای ئەومان ڕوونکردووەتەوە، کە بریتییە لە دەرکەوتنی شێوە زەویوزارێکی پان و بەرین لە سایەی حوکمی ئینگلیزی و پاشایەتیی عیراقدا، ئێستە سەرۆکهۆزێک حوکمیدەکا، پێش چەند دەیەیەکی کەم بێهێزبوو؛ حاڵی حازر حوکمدارێکی کەسلەعۆدەنەهاتووە وەک موڵکدارێکی زەوی و بەرهەمهێنێکی کاڵا بۆ بازاڕی بازرگانی و سەرگەورەی جووتیاران، کە لەم سەروەختەدا کردوونی بە نیمچەکۆیلەیەک. ئەمە هاوزەمانی گەشەکردنی شاران و گەیاندن و حکوومەتی ناوەندی بوو.

ڕاپۆرتە بڵاونەکراوەکانی ئینگلیز بە درێژی ئەوەیان تۆمارکردووە کە: بۆچی و چۆن دەسەڵاتی سەرۆکهۆز بووژایەوە و سیستەمی هۆزایەتیش لەسەر دەستی ئینگلیزەکان گوڕ و تینی تێهاتەوە؟ هەروەها لە سیاسەتی حکوومەتی پاشایەتیی عیراق، بە هەموو لادان و دەرکەوتنێکیەوە، کۆڵراوتەوە. ڕوونمانکردووەتەوە چۆن حکوومەتی عیراقی نوێنەرەوەی بنەمای ناوەندێتی، ساڵانی بیست و سی هەوڵی دا سەرۆکهۆزەکان بێهێزبکا و چۆن ساڵانی چل و پەنجا دەستی خستە ناو دەستیان بۆ بەرەنگاریی هەڕەشەیەکی سەرهەڵداو، کە هاتنە مەیدانی هێزێکی تازەی کۆمەڵایەتی بوو، ئەو تا ڕادەیەکی زۆر نەخشی لە خوڵقاندنیدا هەبوو، ئەویش چینی دەستبژاردەی تازەی ڕۆشنبیر بوو.

کە کەوتووینە لێکۆڵینەوەی بناغەی جێوڕێ و پایەی سەرۆکهۆز، بایەخێکی تایبەتمان بە زەوی داوە، چونکە زەوی لە سایەی سیستەمی حوکمی پاشایەتیدا تەوەری سەرۆکایەتیی هۆزە. لە کاتێکدا دلێریی سەربازی لە سەدەکانی پێشوودا

پلەی یەکەمینی هەبوو، ئیتر ئەوەودوا ئامانجی بنچینەیی سەرۆکهۆز بوو بە خاوەنایەتیی مەڵبەند (مقاطعة)ێکی پان‌وپۆڕ و دەوڵەمەند. ئەوەی ڕاستی‌بێ، دەکرێ لە بەر ڕووناکیی ئارەزووی سەرۆکهۆزەکان‌دا بۆ بەدەستهێنانی زەویی زیاتر، لە ڕەفتاری سیاسییان تێبگەین.

هەروەها نیشانمان‌داوە چۆن موڵکایەتیی زەوی‌وزار لە لیواکان‌دا دابەش‌کرا، لە کاتێک‌دا سەرۆکهۆزە گەورەکان -بەتایبەت لە عەمارە- بوونە خاوەنی زەوی‌وزارێکی زۆر؛ چۆنیش ئەوە بە تێپەڕینی ساڵان پەرەی‌سەندووە و سیاسەتەکانی تورک و ئینگلیز و حکوومەتانی عیراقیشمان بەراوردکردوون.

دواجار لەوەمان کۆڵیوەتەوە کە سیستەمی سەرۆکایەتیی هۆز چ شوێنەوارێکی لە کۆمەڵی عیراقی‌دا هەبووە. ئاوڕیشمان‌داوەتەوە لە باس‌وخواسی وێرانیی زەوی و تێکشکاندنی جووتیار و گوند بەجێ‌هێشتن و کۆچکردن و زیادبوونی دانیشتووان لە شارە سەرەکییەکان‌دا و تێکچوونی ئابووری و نزمبوونەوەی ئاستی گوزەرانی خەڵکی شارەکان و ئەو ڕووداوانەیشمان ڕوونکردووەتەوە کە کێشایانەوە بۆ شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨.

# باسی یەکەم

## بایەخی سەرۆکهۆز

ڕەنگە هەڵەبێ پێمان وابێ لێکۆڵینەوە لە سەرۆکهۆز لەم کاتەدا، تەنیا بایەخێکی شوێنەواریی هەیە، لە کاتێکدا سەرۆکهۆز تا سەروبەندی شۆڕشی ١٩٥٨ باڵی بەسەر ژیانی زۆربەی جووتیارانی عیراقدا کێشابوو. سەرەڕای ئەوە، مێژووی عیراق -لایەنی کەم- تا ناوەڕاستی ساڵانی سی و کاتێک ناوەندی قورسایی سیاسی گواسترایەوە بۆ بەغدا، تا ڕادەیەکی زۆر مێژووی سەرۆکهۆزان و هۆزەکانیان بوو.*

عیراقی تازە، زادەی کۆمەڵێکە کە سەرۆکهۆز و شێوازی ژیان و بەهاکانی، کاریگەرییەکی قووڵیان تێدا بەجێهێشتووە. ئاخۆ کاریگەریی نەریتە کۆنەکان، تا چ مەودایەک بەردەوامدەبێ؟ دەتوانین لەو ڕاستییەوە پەیی پێببەین کە چۆن ئەو هەزاران جووتیارەی هۆزەکان، کاتێک پێوەندییان بە سەرۆکهۆزەکانیانەوە پچڕا و کۆچیانکرد بۆ بەغدا، تا ژیانێکی تازە دەستپێبکەن، قانوونەکانی شاریان ڕەتکردنەوە و پشتگوێیانخستن؛ تا تێکەڵ بە چەندین هاوپەیمانیی نووسراو ببن و بەپێی نەریتە کۆنەکانی هۆزەکەیان خۆیان پابەندی ڕێکخستنی ئاکار و یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکانیان بکەن، چونکە شێوازەکانی سیستەمی کۆن و حاڵوبارە دەروونییەکەی هێشتا ڕەگیان لە ژیانی زۆرینەی گەلدا داکوتابوو. زەحمەتییەکانی سڕینەوەی کاریگەریی چەندەها سەدە، هەر دەبێ کاریکردبێتە سەر

---

* حەننا بەتاتۆ، لە کتێبەکەیدا "چینە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان و بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لە عیراق" کە ساڵی ١٩٧٨ بڵاویکردووەتەوە و ١٩٩٤ لە لایەن عەفیف ڕەزازەوە بە ناونیشانی "العراق"ەوە کراوە بە عەرەبی و بە سێ بەرگ لەچاپدراوە: بەرگی یەکەم، "چینە کۆمەڵایەتییەکان و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕییەکانی سەردەمی عوسمانی تا دامەزراندنی کۆمار" بەرگی دووەم، "حیزبی شیوعی،" بەرگی سێیەم، "شیوعییەکان و بەعسییەکان و ئەفسەرانی ئازاد؛" بە درێژی لەوە دوواوە کە گوتوویە: «سەرکوتکردنی ڕاپەڕینە خێڵەکییەکانی ساڵانی ١٩٣٥-١٩٣٦ لە فوراتی ناوەڕاست و ناسرییە، نیشانەی بڕانەوەی سەردەمی سەرۆکهۆزەکان بوو. پێش ئەوە، مێژووی عیراق تا ڕادەیەکی زۆر مێژووی سەرۆکهۆزەکان و خێڵەکان بوو.» بڕوانە: حنا بطاطو، العراق، الكتاب الأول، الطبقات الإجتماعية والحركات الثورية في العهد العثماني حتى قيام الجمهورية، ترجمة: عفيف الرزاز، منشورات فرصاد، قم، ٢٠٠٥، ص١٤٧. (و.ع)

هێزە تازەکان لە عیراق، کە تێدەکۆشن چارەسەری زۆر لایەنی گرنگی بیناتنانی کۆمەڵی تازە بکەن. ئەوەی کە ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بە ئاسانی تێکوپێکدرا، مەسەلەیەکە ڕیشەی لە مێژووی گەلی عیراقدا نییە، لە کاتێکدا حوکمی پاشایەتی بە بەشێکی ڕژێمی کۆن نازانرێ[1] و دەزگایەکی نوێیە، لە هەناوی کۆمەڵیشەوە پێنەگەییوە و قراژێنەبووە، بەڵکوو شتێکە کۆمەڵ پێی نامۆیە و -لە ڕاستیدا- جگە لە بەدەستهێنانی لایەنگرییەکی سەرپێیی، نەیتوانیوە سەرکردایەتیی هیچ شتێک بکا.*

ئەگەرچی ئەو تێڕوانینە لە ژیاندا بنجبەستەی کە سەرۆکهۆز ئاماژەی بۆ دەکا، تا مەودایەکی درێژ بەردەوامدەبێ، بەڵام ناشێ ئەوە لەبارەی سەرۆکهۆز خۆیەوە بگوترێ. عیراق، ماوەیەکی دیاریکراوی پێش شۆڕشی ١٩٥٨، قۆناغی کۆتاییی سەردەمی سەرۆکهۆزەکانی بەخۆوەدی، چونکە هۆز کە دەسەڵاتی خۆیی لێوەردەگرت، پێش دەرکەوتنی پاشایەتی بەرەو لەبەریەکهەڵوەشان دەچوو. حکوومەتی بریتانیا و دواتر شانشینی عیراقیش هەوڵیان دا بە تەنگەتاوکردنێکی دەستکرد و چاودێری و قایمکردنی جێپێی سەرۆکهۆز، ئەم پرۆسەیە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، بەڵام هەر کاریگەرییەکی کاتیی هەبوو. هێزەکانیتریش -هاوزەمان- پێوەندیی نێوان سەرۆکهۆز و هۆزەکەییان هەڵتەکاند. بەستنەوەی کشتوکاڵی عیراقی بە بازاڕی جیهانییەوە و تێکەڵیی هۆز بە بواری بازرگانی، کەسێتیی سەرۆکهۆزیان گۆڕی. ئەوی باوک و سەرپەرشت و پارێزگاری هۆز بوو، بووە کەسێکی مشەخۆری ڕووتێنەرەوەی هۆز. ئەویش زیاتر هاتە سەر باری پشتبەستن بە داروودەستەکەی -کە پۆلیسە چەکدارەکانی خۆی بوو- بۆ سەپاندنی گوێڕایەڵی و ملکەچی بەسەر تاکەتاکەی هۆزەکەیدا. ئیتر وای لێهات هەستکردن بە بێزاری، هەمووانی گرتەوە و پێوەندیی هۆزایەتیش بە لای جووتیارەوە، نەک هەر بە پێوەندییەکی تازەکەرەوەی ژیان نەدەژمێردرا، بەڵکوو بووە کۆتوپێوەندی

---

[1] حوکمی پاشایەتی لە ١٩٢١دا دامەزرێندرا.

* دەوڵەتی نوێی عیراق کە ساڵی ١٩٢١ دامەزرێندرا، بە دەوڵەتێکی ناوازە وەسفکراوە، چونکە دەوڵەتێکی نوێی خاوەند داوودەزگای هاوچەرخ و لیبراڵی و کۆمەڵێکی کۆنی سەرەتایی بوو. واتە سیستەم و داوودەزگاکان و پێخوێندن و ڕۆشنبیری و هیتر، شەقڵێکی مەدەنی و هاوچەرخیان بەسەردا زاڵبووە، بەڵام باڵاتربوو لە ئاستی کۆمەڵی نەریتیی عیراقی کە لەژێر باری پاشکەوتوویی و خێڵایەتی و تیرەگەری و ...دا دەیناڵاند. لەم ڕووەوە بڕوانە: عامر حسن الفياض، جذور الفكر الديمقراطي في العراق الحديث ١٩١٤-١٩٣٩، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠٢، ص٦٥. (و.ع)

شەتەکدانی بە دۆخێکی بەشخوراوی و کلۆلییەوە. جا لێرەوە ئارەزووی هەلاتن دەستیپێکرد. گۆرانییەکی پیاوانی هۆزی ئەلبومحەمەد* دەڵێ:

"أرد أشرد لبغداد من هالعشيره

لا تجبر المكسور ولا عدها غيره"

دەمەوێ لەم خێڵە هەڵێم بۆ بەغدا،

نە شکاو هەڵدەبەستێ و نە غیرەتی هەیە.**

ئێستە و پاش ئەوەی شۆڕش کۆڵەکەی دەرەکیی پشتیوانیی سەرۆکهۆزی تێکشکاند، دەرکەوت رێیتێناچێ سەرۆکهۆز تا ماوەیەکی درێژخایێن خۆی ڕابگرێ. ڕاستە مێژوو حەزی لێیە غافڵگیرمانبکا و چارەنووسی شۆڕشگێڕانیش کە هەر خۆیان دابەش و ناتەبان، زانراونییە، بەڵام ڕووداوە هەرە بەردەوامەکانی دەیان ساڵی ڕابوردوو، وەک گەشەکردنی شاران، پەرەسەندنی ڕێگەکانی گەیاندن، بڵاوبوونەوەی خوێندەواری، سەرهەڵدانی چینی ناوەڕاست و هۆشیاریی تاوسەندووی جەماوەری گەل لە عیراق؛ هەموو ئەوانە لەکاردان دژ بە بەردەوامیی بوونی سەرۆکهۆز. تەنیا دوو بژاردە هەن، سەرۆکهۆز هەلێکی زیادەی تێدا دەستبکەوێ، بەڵام ژیانیکی کاتیی تێدایە: یەکەم- دەستتێوەردانی چەند هێزێکی دەرەکی، تا عیراق پێملبکەن دەسەڵات بخاتە چنگی ئەو هێزە ناوەکیيانە کە کەڵکی بەرژەوەندەکانی دەگرن. دووەم- چەند هێزێکی کۆنەپارێزی شۆڕشگێڕانی ١٩٥٨ بکەونە بەهێزکردنی جێورێی خۆیان، لە ڕێگەی هەوڵدانەوە بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتیی هێزە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان.

---

* هۆزی ئەلبومحەمەد، سەر بە زوبێدن و لە عەمارە دادەنیشن. ناوەکەیان لە باپیرەگەورەیانەوە هاتووە کە ناوی محەمەدە، کەموزۆر نۆ پشت لەمەوبەر کۆچیکردووە بۆ عەمارە. زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەم ناوچەیە (سەنییە)یە، واتە هیی سوڵتانی عوسمانییە و بە تاپۆ نەدراوە. گرنگترین شێخیان محەمەد عریبی و فالح سەیهوود و مەجید خەلیفەیە. عەمارە، لە هەموو لیواکانی عیراق زیاتر، گیرۆدەی باڵادەستیی شێخان و دەربەگەکان بووە. بڕوانە: عبدالجليل الطاهر، العشائر العراقية، الجزء الاول، دار لبنان، بيروت، ١٩٧٢، ص٢٧٢. (و.ع)

** ئەم تەرزە شیعرە میللییە عەرەبییە عیراقییە، پێی دەگوترێ دارمی «الدارمي» و هەندێکیش ناوی دەنێن «شیعری کچان». (و.ع) [دارمی: ڕەنگێکی گرنگی شیعری میللیی بڵاوی باشووری عیراقە، بابەتەکانی خۆشەویستی و گلەیی و ئاواتەخوازییە. ناوەکەی لە -گوایە- دەوارمی لکێکی هۆزی بەنیتەمیمەوە هاتووە. (و.ک)]

سەرباری ئەوەی کە شۆڕشگێڕانی ١٩٥٨ دابەشبووبوون، بەڵام هەموویان ژێربەژێر پابەندی چەند بنەمایەکی گشتیی دیاریکراو بوون، یەکێک لەوانە: دوورخستنەوەی سەرۆکهۆزەکان بوو وەک چینێک. ئەمە کاتێک دەردەکەوێ کە هەڵوێستی سەرۆکهۆزان و هەڵوێستی شۆڕشگێڕان بەراوردەکەین. سەرۆکهۆزەکان، بنەمای کۆمەڵێکی فرەڕەنگی پارچەپارچە (چەندین هۆز) دەنوێنن، لە کاتێکدا شۆڕشگێڕان هەوڵدەدەن کۆمەڵێکی یەکپارچە: یەکنەتەوە، یەکگەل دابمەزرێنن.[٢] بە واتایەکیتر، سەرۆکهۆز بە داکۆکیکەر لە نەریتی هۆزایەتی یا سوننەتی هۆزایەتی[٣] دادەنرێ، لە کاتێکدا شۆڕشگێڕان بە داکۆکیکەر و پشتیوانی قانوونی یەکگرتووی نیشتیمانی دادەنرێن.[٤]

شتێکیتریش چەمکی سەرۆکهۆزە سەبارەت بە هێزی گەل، کە پێی وایە دەبێ دەسەڵات دابەشکرابێ. هەرچی چەمکی شۆڕشگێڕانیشە سەبارەت بە هێزی گەل، ئەوەیە کە دەسەڵات لە دەستی نوێنەرانی ڕاستەقینەی بەرژەوەندەکانی گەلدا کۆببێتەوە و زۆریشیان بە ڕاستگۆییەوە هەر خۆی بە نوێنەری ڕاستەقینەی بەرژەوەندەکانی گەل دادەنێ! دواجاریش شۆڕشگێڕان سەرۆکهۆزەکان بە کۆسپی سیاسیی بەردەم بنیاتنانی کۆمەڵ دادەنێن. بەڵام بەوەدا کە سەرۆکهۆز لە ماوەی نێوان ١٩١٧-١٩٥٨دا، چنگی بێخێروبێری خۆی بەهێز و گیر کرد لە زەوی و سایەی خۆی بەسەر جووتیارانی هەژاردا کێشا، بوو بە بەشێکی سروشتی سیستەمی بێدادی ئابووری و نیشانەی ئەو ستەمە ئابوورییە توندەی کە کۆسپی نایە بەر

---

[٢] ئەو کۆمەڵە شۆڕشگێڕە کە هەموو مەسەلەکانی جێی بایەخی لە عیراق و گەلی عیراقدا کۆبووەتەوە، بانگەواز بۆ بنەمای «یەکگەل» دەکا، لە کاتێکدا ئەو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕان کە خۆی بە بەشێکی گەلێکی گەورەتر دادەنێ، جا گەلی عەرەب بێ یا گەلی کورد، بانگەواز بۆ بنەمای «یەکنەتەوە» دەکا.

[٣] دابی هۆزایەتی، یا ڕێوڕەسمی هۆزایەتی، بریتییە لە نەریتە هۆزایەتییەکان. دیارە سەرۆکهۆز پارێزگاری ئەم دابانە نییە و وەک خاوێنیی یەکەمجاریان نایانهێڵێتەوە، چونکە هەمیشە خۆبەخۆ چۆنی ویستووە وا گۆڕیونی.

[٤] ئاشکرایە هیچ ڕێککەوتنێک لە نێوان شۆڕشگێڕاندا نییە. لەو ڕووەوە کە دەبێ ئەم قانوونە یەکگرتووە چۆن بێ.

کامڵبوونی کۆمەڵ و لە هۆزایەتی خۆی زیاتر، کە بە سۆنگەی ئەم ستەمکارییەوە هەڵتەکی، نەیهێشت جووتیاران پێ بنێنە ناو ژیانی نیشتیمانی.*

* پێکەوەبەستنەوەیەکی نایابی حەننا بەتاتۆ، ئەوەیە کە هێز و باڵادەستی و زاڵیی سەرۆکهۆزەکانی بەسەر ڕۆڵەکانی خێڵەکانیانەوە، بە مایەی ئاکامی پێچەوانە داناوە، کە ئەویش هەڵتەکاندنی سیستەمی هۆزایەتی و نزیکخستنەوەی هەرەسپێهێنانی بووە، نەک بە پێچەوانەوە. گواستنەوە لە تەرزی باوکسالارییەوە بۆ تەرزی حکوومی و بازرگانی، ڕاستەوخۆ نەخشی هەبووە لە هەڵوەشاندنەوەی پێوەندییە هۆزایەتییەکان و زیادبوونی کۆچی خەڵکی دێهاتیدا بۆ شار. ئەمە ڕاست ئەو شتەیە کە هیگڵ بە «مەکری مێژوو»ی لەقەڵەمداوە. واتە مێژوو تەرز و قانوونەکانی خۆی، بەبێ هەڵاواردن، بەسەر کۆمەڵدا دەسەپێنێ، تەنانەت ئەگەر سەرەنجام بکێشێتەوە بۆ لەناوچوون و بێهێزبوونیشی. (و.ع)

## باسی دووەم

# ڕیشەی دەسەڵاتی سەرۆکهۆز

ململانێی نێوان سەرۆکهۆزان و شۆڕشگێڕان، بە شێوەیەکی دیاریکراو، دوایین قۆناغی ئەو ململانێیە کۆنە بوو، ئەو ململانێیەی کە لە دەشتەکانی دۆڵی دیجلە و فورات لە نێوان شارانی سەر ڕووبار و بیاباندا پەیدابوو. ئەم ململانێیە، بە هەرەسهێنانی خەلافەتی عەباسی و تاڵانکاریی مەغۆل و بەتایبەت بە وێرانکردنی بەنداوەکان، تاویسەند و توندوتیژتر بوو. ماوەی سەدە درێژەکانی دوابەدوای ئەوە، واتە لە سەدەی سیازدەیەمەوە تا سەدەی هەژدەیەم، کە چەندەها پەلاماری مەغۆل و تورکمان و جەنگی پچڕپچڕی درێژخایێنی تورکی - فارسییان بەخۆوە دی، ڕاستییەکی بەرچاو مێژووی عیراقی گرتەوە، ئەویش دارمانی شارە. ئەنجامی بێچەندوچۆنی ئەوەیش، پێبەپێ پێشکەوتنی هێزە دەشتەکییەکان بوو.* پایەی حاڵی حازری سەرۆکهۆز، تا ڕادەیێک، ئاکامێکی ئەو ڕاستییەیە. بەڵام سەرۆکهۆزی ئێستە، زۆر لە سەرۆکهۆزی سەدەکانی پێشوو ناچێ، چەند مۆرکێکی تازەی لێدراوە کە زۆری دەسەڵاتەکان و وەزیفە و هۆزی سەرچاوەی بوونی خۆی گۆڕیون. ئەمە سەرەنجامی هەڵگەڕانەوەی پرۆسە مێژووییەکە بوو، واتە شار لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە و لەبەر چوونە ناو ژیانی تازە و بیر و بۆچوون و شێوازە نوێیەکانی شارنشینی، نەخش و دەوری خۆی بەدەستهێنانەوە.**

---

* دارمانی سیستەمی ئاودێری لە عیراق و تێکدانی بەنداوەکان و پشتگوێخرانی جۆگەکان، پاش ئەوەی مەغۆل ساڵی ١٢٥٦ پێی نایە ناو عیراق، دەورێکی بنچینەییان لە نەمانی شارەکان و پاشەکشەی بەهاکانی شارستانی و هەڵکشانی ڕێکخستنی دەشتەکی (بدوي) و خەملینی هاوپەیمانییە هۆزایەتی و خێڵەکییەکاندا بینی. بڕوانە: علي الوردي، دراسة في طبيعة المجتمع العراقي، منشورات سعيد بن جبير، قم، ٢٠٠٠، ص٩٩. (و.ع)

** پاش ئەوەی مەدحەتپاشا جڵەوی والیتیی عیراقی بەدەستەوە گرت ١٨٦٩-١٨٧٢، کەوتە گۆڕانکاری بۆ چاککردنی بنیاتی کۆمەڵ، لەوانە: زەویی کشتوکاڵی بە تاپۆ بسپێردرێ بە خەڵک، بۆ نیشتەجێ و جێگیر کردنی هۆزەکان و پاشان بە ئاسانی ڕکێفکردنیان. سەرۆکهۆزانی ئالسەعدوون و ئالمەنناع و نەجیبزادە و پیاوماقووڵان و بازرگانانی لە وێنەی بنەماڵەکانی سەرکیس و دانیاڵ و ... کەڵکیان لەم قانوونە وەرگرت. پاشتر سەرۆکهۆز لە تەرزی باوکسالارییەوە گۆڕا بۆ تەرزی

## باسی سێیەم

# تێشکانی شار و گەشەکردنی دەسەڵاتی سەرۆکهۆز

### (لە سەرەتای سەدەی سیازدەیەمەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم)

ناشێ پەرەگرتنی کشتوکاڵ لە دەشتودەری بێبارانی عیراقدا، بەبێ دەسەڵاتێکی بەهێزی شار بەسەر ڕووبارەکاندا بۆ ڕێکخستنی بڕی لەبەرڕۆیینیان، درێژەبکێشێ.* کەوتنی درێژمەودای شار و هاوکات هەرەسهێنانی تۆڕەکانی ئاودێری، بەریان بۆ ڕووبارەکان بەرەڵاکرد و هیچ بەربەستێکیان لەبەردەمدا نەهێشتن. بۆیە ڕووبارەکان پڕبوون لە قوڕ و لیتە و داڕژانە سەر هێندێ زەویی کشتوکاڵی و هێندێکیتریش دوچاری وشکەساڵی بوون. ئەم پاشاگەردانیی سروشتە، پاشاگەردانییەکیتری لەگەڵ بوو، دەشتەکی هۆکاری بوو. جا ئەم دۆخە، سێ نموونەی ژیانی لە دەشتەکانی عیراقدا لێکەوتەوە:

نموونەی یەکەم: چەند ناوچەیەکی بچووک بۆ نیشتەجێبوونێکی بەردەوام، وەک شار و شارۆچکەکانی سەر چەم و ڕووبار، بە مەزرا و باخەکانی دەوروبەریانەوە. ئەوەیش لە ناکاو دۆخێکی لەدەستدانی ئاسایشی بەسەرداهات، لەبەر ژینگەی نیمچەجێگیری خێڵەکیی دەوری سەرۆکهۆز و جووتیارانی جەنگاوەری هۆزەکەی، کە نموونەی دووەمە. جیهانی دەشتەکێتی لەو بیابانە شێواوەدا، تەنگی بە هەردوو ناوچەکە هەڵچنی و ئەمەیش نموونەی سێیەمە.

---

بازرگانی. بۆ ئەو چاکسازییانە، بڕوانە: محمد عصفور سلمان، العراق في عهد مدحت باشا، مؤسسة مصر مرتضى للكتاب العراقي، بغداد، ٢٠١٠. (و.ع)

* مارکس ناوی تەرزی ئاسیایی بەرهەمهێنانی لێناوە و ئاماژەی پێداوە کە دەشتەکانی عیراق و میسر و هیندستان و چین پێویستیان بە دەوڵەتێکی بەهێزی ستەمکار هەیە، تا ئاودێری ڕێکبخا. ئەمەیش نابێتە هۆی نەشونماکردنی چینی سەربەخۆی ئابووری. هەروەها ئەم تەرزە ناچێتە خانەی پۆلێنی پێنجینەی مارکسی بۆ مێژووی مرۆڤایەتی (کۆمەڵی سەرەتایی، بەندایەتی، دەرەبەگایەتی، بۆرجوازی و سۆشیالیستی). بڕوانە: عادل عبدالمهدي، الثوابت والمتغيرات في التاريخ الإقتصادي للبلاد الإسلامية، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت، ٢٠٠٩، ص٣٤٠. (و.ع)

باکووری ڕۆژهەڵاتیش کە چیا و دۆڵەکانی کوردستانە و کشتوکاڵی تێدا پشت بە بارانێکی کەموکووڕ و ڕێکنەخراو دەبەستێ، نەک ئاوی ڕەوانی سەر زەوی، وەک لە دۆڵی دیجلە و فورات هەیە، هەمان نموونەی شێوازی ژیانی تێدا دەرکەوتن: ناوچە جێگیرەکان و ناوچە نیمچەجێگیرەکان و پاشان ناوچە کۆچەرەکان و لێرەدا تەنگپێهەڵچنینەکە لە کۆچەری چیاکانەوە دەبێ. شەقڵی هەڵاواردەی ئەم نموونەیە، بەتایبەت لە ناوچە دەشتاییەکاندا، ناسەقامگیرییە. بە زەحمەت هۆزێک دەبینی ماوەیەکی درێژ لە شوێنی خۆی مابێتەوە. هۆیەکی ئەوە، دۆخی هەمیشەیی و بەردەوامی پەلامار و دژەپەلامارە. جاروباریش تەقینەوەیەکی کوتوپڕی وزەی دەشتەکێتی لەناو بیاباندا ڕوودەدا و هەموو هۆزەکانی سەر ڕێگەی خۆی ڕادەماڵێ و دابەشکردنێکی تازەی هۆزایەتی لە دۆڵی میزۆپۆتامیادا جێدەکاتەوە، پاشانیش ئاڵوگۆڕی توندی چەم و ڕووبارەکانی بەدوادادێ، چونکە -بۆ نموونە- وشککردنی لقێکی ڕووبارەکان، لەوانەیە هەموو هۆزەکە ناچاربکا، یا کۆچبکەن، یا دابەش، یان پەڕاگەندە ببن.

ئەگەر ئەو دۆخی ناسەقامگیرییە لەبەرچاوبگرین، دەتوانین دابەشبوونی گشتیی ناوچە جێگیر و بە چڕی ڕەنێوهێنراوەکان و دانیشتووانی میرایەتییەکان و دەستەبەندییە هۆزایەتییەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم و پێش سەرهەڵدانی ئەو هێزە تازانە کە دووبارە گوڕ و تینێکیان دایەوە بە شار و هاوسەنگییەکەیان دژ بە قازانجی هۆز هەڵگێڕایەوە، ببینین.

سنووری ناوچەکانی ژیانی جێگیر، یا ناوچەکانی کشتوکاڵی چڕوپڕ،[٥] دەکەوێتە نێوان ئەو ناوچانە کە ناودەبرێن -لە لایەکەوە- بە ناوچەکانی ئاودان بە ناعووری

---

[٥] دابەشکردنەکە بە شێوەیەکی گشتی پشتبەستووە بە کتێبی Carsten Niebuhr, La Description de L'Arabie, Amsterdam, 1774, لاپەڕەکانی ٢٧٧-٢٧٩، ٢٣٤-٢٣٨ و توێژینەوەی دکتۆر سالح حەیدەر "زەوی و خێڵ لە عیراق- الأرض والعشيرة في العراق"، لاپەڕە ١٢، بە ستێنسڵ لە چوارچێوەی بەڵگەنامەکانی ڕێکخراوی کشتوکاڵ و خۆراکی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکاندا سەبارەت بە گیروگرفتەکانی زەویوزار لە ڕۆژهەڵاتی نزیک، سەلاحەدین، عیراق، تشرینی یەکەمی ١٩٥٥، لەچاپدراوە.

سەرووی فورات لە دەوری شارەکانی هیت و حەدیسە و عانە و دۆڵی خاڵس[6] و دۆڵی باشووری دیالە و کشتوکاڵەکەیان بە سایەی مانەوەی تۆڕە کۆنەکانی ئاودێرییەوەیە، -لە لایەکیترەوە- ناوچەی بەرپێژەوی نێوان هەم کەرکووک و هەولێر و مووسڵ و دیاربەکری دراوسێی ڕێگەی پاسکراوی پۆستە بۆ ئەستەمووڵ و هەم دواهەمیشیان سەر کەناری شەتاوی عەرەب (شط العرب) لە ناوچەی بەسرە. دەسەڵاتی ڕاستەقینەی حوکمبەدەستانی دانیشتووی شارە سەرەکییەکان، کە هەر بەناو ملکەچی بابی عالیی عوسمانین، تەنیا درێژدەبێتەوە بۆ ئەم ناوچانە. پاشماوەی ناوچەکانیتر، دەسەڵاتێکی تا ڕادەیێکی زۆر سەربەخۆی خێڵەکییان هەیە. ناوچەی شاخاویی کوردنشینی ڕۆژهەڵاتی ڕێگەی پۆستەیش، هۆزی بابانی لە سلێمانی لێکۆبووەتەوە، حوکمی ناوچەی نێوان دیالە و ڕووباری زێی گچکە[7] دەکا. سۆرانییەکان* حوکمی ناوچەی نێوان زێی گچکە و زێی گەورە و بادینانییەکانیش** حوکمی ناوچە شاخاوییەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی شاری مووسڵ دەکەن. دەسەڵاتی بەنیلام، لە دەشتە عەرەبنشینەکانی گوێڕووباردا، لە قوڕنەوە دەکشێ بۆ بەری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیالە.[8]

---

[6] Stephen H. Longrigg, Four Centuries of Modern Iraq (Oxford: Clarendon Press, 1925) p. 9.

[7] بۆ ئاگاداربوون لە سنووری وردی میرایەتییەکان، بڕوانە:
C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs (London: Oxford University Press, 1957) pp. 53-54.

* سۆرانییەکان: خاوەنی ئەو میرایەتییە کوردییەن کە ساڵی ١٨١٦ لە باکووری عیراق دامەزرێندرا و کاتێک هەولێر و کەرکووک و مووسڵی گرتەوە تا گەیشتە زێی بچووک، بەوپەڕی هێزی خۆی گەیی، ساڵی ١٨٣٨یش بە دەستی عوسمانییەکان ڕووخێندرا. زانراوە سۆرانی شێوەزمانێکی سەرەکیی کوردییە. سەبارەت بە مێژووی کورد، بڕوانە: دیفید ماکداول، تاريخ الأكراد الحديث، ترجمة راج آل محمد، دار الفارابي، بيروت، ٢٠٠٤، ص٨٣ (و.ع)

** بادینانییەکان: خاوەندی میرایەتیی کوردیی عەباسین کە ساڵی ١٣٧٦ لە باکووری عیراق دامەزرێندرا. بەهائەدین کوڕی مەلیک خەلیل عیزەدینی عەباسیی یەکێک لە نەوەکانی خەلیفە موستەعصەمبیللا دایمەزراند و ئامێدی و ئاکرێ و زاخۆی گرتنەوە و ساڵی ١٨٣٤ لە لایەن میرایەتیی سۆرانەوە ڕووخێندرا، زانراویشە کە بادینانی شێوەزمانێکی بنچینەیی کوردییە. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو. (و.ع)

[8] عباس العزاوي، عشائر العراق، بغداد، شركة التجارة والطبع المحدودة، الجزء ٣، ص٢١١.




نەخشەی ١
دابەشبوونی هۆز و خێڵات لە سەرتاسەری عیراق

هۆزەکانی مونتەفیق دەستیان بەسەر ناوچەی چەمی غەڕاف و خوارووی فورات و خەزاعیلیش فوراتی ناوەڕاستدا گرتووە.[9] ناوچەی دەسەڵاتی هۆزی زەید، لە ڕووباری دیجلەوە دەکشێ بۆ ڕووباری فورات و بەری ڕاستی ڕووبارە

[9] British Government of Occupation, Reports of Administration for 1918 of Divisions and Districts of the Territories in Mesopotamia, Vol. 1, p. 72, delimited their zone precisely.

کۆنەکە تا باشووری ڕووباری دیالە و لە بەری دەستەچەپی ڕووباری دیالەیشەوە، تا باکوور و باشووری حلە و دلێمیش سەراوردی فوراتی ناوەڕاست داگیردەکا، لە کاتێکدا عوبێد بەشی سەرووی دیجلەی لە نێوان تکریت و مووسڵدا و هۆزی تەی (طي) ناوچەی نێوان مووسڵ و ماردین و دواهەمیشیان شەمەر ناوچەی جەزیرەی گرتووە.

سەبارەت بە هەڵکەوت و پەیکەری ناوخۆ و ئەرکەکانی ئەم دەستەبەندی (فیدراسیۆن)یە هۆزایەتییانە، وەک سەرنجدەدەین پێوەندی لە نێوان خەڵکە پێکهێنەرەکانیاندا بێسەروبەرە و گیانی یەکگرتنیان تێدا شکنابرێ. بۆ نموونە، مونتەفیق یەکێکە لە هەرە بەهێزترین دەستەبەندییە هۆزایەتییە نیمچە جێگیرەکان، لە سێ تاقمی هۆزایەتی پێکدێ: بەنیمالیک، ئەجوەد و بەنیسەعید،* کە هۆز نین، بەڵکە چەند تاقمە خێڵێکن خۆبەخۆ تاقمی بچووکتریان لەخۆگرتووە، بەڵام چەند یەکێتییەکی بەهێزی هۆزایەتییان پێکەوەناوە، وەک بەنیخیکان و مەجەرە لەناو تاقمی هۆزایەتیی بەنیمالیک. ململانێی نەبراوەی نێوان ئەم دەستەبەندییانە،[10] ئاماژە بۆ فشۆڵیی یەکێتیی دەستەبەندیی مونتەفیق دەکا. بەرەنگاربوونەوەی خوێناوی لە نێوان دەستەبەندیی هۆزە پەشێوەکانی بەنیلامیشدا[11] هەیە. هەر لەناو هۆزی شەمەردا، تاقمە خێڵەکییەکانی ژێر چەتری ناسناوی سایح (الصايح)، دوژمنایەتییان هەبوو لەگەڵ لقی خێڵی جەربە، کە بەسەر هۆزەکەدا زاڵە.[12]

---

* دەستەبەندیی مونتەفیق: سێ خێڵی گەورە دەگرێتەوە، کە بریتین لە بەنیمالیک و ئەجوەد و بەنیسەعید. ناودارترین لقی بەنیمالیک، ئالئیبراهیم و ئالبوسالح و حەجام و ناودارترین لقی بەنیسەعیدیش ئالبەزوون و ئالعیسا و ناودارترین لقی ئەجوەدیش حوسەینات و ئالئوزێرج و شریفات و بەنیڕوکاب و عصوومە. حبوودە و ئالحومەید و خەفاجە و ئالعززی و ئالبووسەعدیش لەگەڵ ئەجوەد هاوبەیداخە و سەدەی شازدەیەم لە سایەی پێشەوایەتیی ئالسەعدوونی نزیک لە دەوڵەتی عوسمانیدا پێکهات. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، العراق قديما وحديثا، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٥٨، ص١٦٣. (و.ع)

[10] Ibid, pp. 2, 3 and 65.

[11] عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، الجزء ٤، ص١٩٦.

[12] Arab Bureau, Baghdad: Arab Tribes of the Baghdad Vilayat, (calctta: Superintendent Government Printing, 1919) pp. 194-195.

لە میرایەتیی بابانیش‌دا،* دابەشبوونەکان توندوتیژبوون، بە چەشنێک کە یەکێک لە گەورەترین سەرۆکهۆزەکانی لە نێوان ١٧٨٩-١٨١٣دا -لایەنی کەم- پێنج‌جار لێ‌خرا.[13] هەموو ئەوانە ئاماژە بۆ هەڵکەوت و وەزیفەی ئەم دەستەبەندییانە دەکەن، کە دەستەبەندی بوون لەپێناوی جەنگدا، چونکە لەبەر جەنگ و بەرگری لەئارادابوون. تەنانەت ئەو یەکە بچووککراوانەی کە پێکیان‌هێنابوون، لەسەر بنچینەیەکی سەربازی ڕێکخرابوون. دینیس ڕیڤیر Danis de Rivoyre کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم‌دا سەری لە مونتەفیق داوە، سەرنجی‌داوە هەموو شتێک لە ڕوانگە و لەسەر بنچینەی جەنگ بنیات‌نراوە، چونکە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی -بەر لە هەموو شتێک- ڕێکخستنێکی سەربازی بووە.[14] بۆیە بەهای باڵای ناو ئەم جۆرە کۆمەڵانە، بە شێوەیەکی ئاسایی دلێریی سەربازییە و جەنگاوەرانی هۆزەکان جێ‌وڕێیەکی باڵایان هەیە و سەروەریی سیاسیش بە دیاریکراوی دەکەوێتە چنگی چینی جەنگاوەر، کە وا دیارە لە تاقمێکی تایبەتی پیاوانی هۆزەکان پێکدێ. پیاوانی هۆزەکان لە عیراق، یا خەڵکی خاوەن‌وشتر، یا خەڵکی خاوەن مەڕوماڵات، یا جووتیار، یا دانیشتووانی هۆزەکانن، یان پێیان دەگوترێ معێدی. ئەمانەی دوایی گامێش‌بەخێوکەرن. سنووری لێکدابڕانی نێوان ئەم تاقمانە دیار و یەکلاکەرەوە نییە، بەڵکوو جووتیاری وا هەیە گامێش و مەڕوماڵاتیش بەخێودەکا. خاوەن‌وشترەکان، لە هەموو بارێک‌دا، بە چاوێکی سووکەوە دەڕواننە هەموو تاقمەکانی‌تر و ژنیان لێ‌ناهێنن. ئەوانە لەم کاتی پشێوییانەدا کە باسیان‌دەکەین، هەمیشە خۆیان بە سەرکردە دادەنێن. لەبەرئەوە، بەپێی زانیارییەکانی بەردەست، پێمان وایە: لە هەموو دۆخەکانی دەستەبەندییە تێکەڵەکانی نێوان هۆزە دەشتەکییەکان و هۆزە نیمچە جێگیرەکان‌دا، هۆز یا بنەماڵەی

---

* میرایەتیی بابان: میرایەتییەکی کوردییە، ساڵی ١٦٤٩ لە باکووری عیراق دامەزرێندرا و ١٨٥١ بە دەستی عوسمانییەکان ڕووخێندرا. ساڵی ١٧٨١ سلێمانی‌یان بنیاتنا و کردیانە پایتەختی خۆیان و عوسمانییەکانیش پاڵپشتیان‌کردن بۆ بەرەنگاریی سەفەوییەکان. بڕوانە: جمال بابان، أصول أسماء المدن والمواقع العراقية، ج١، مطبعة الأجيال، بغداد، ١٩٧٨، ص١٥٤. (و.ع)

[13] Edmonds, p. 52.

[دانەر، مەبەستی عەبدوڕەحمان‌پاشای بابانە، کە پێنج جار هاتووەتە سەر کار و لێ‌خراوە و لە شەشەم‌جاردا مردووە (بڕوانە: الدکتور عماد عبدالسلام رؤوف، ادارة العراق: الأسر الحاکمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتأخرة، دار الحکمة للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩٢، ص٢٥٩). (و.ک)]

[14] Danis de Rivoyre, Les Varis Arabes et Pays, p. 175.

هۆزایەتی کە سەرۆکایەتیی ئەم دەستەبەندییانە دەکا، دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتیی بیابان؛ بە واتایەکی وردتر، بۆ لای خەڵکانی خاوەن‌وشتر.* هۆزی بەنی‌لام بەم شێوەیە زیاتر بەسەر دەستەبەندییەکەدا زاڵبوو و بە هۆی بنچینەی دەشتەکێتی و دلێرییە سەربازییەکەیەوە، ناوی خۆیی بەسەردا بڕی.[15] بنەماڵەی سەعدوونیش، وەک بەنی‌لام، حوکمداری مونتەفیق بوون، ئەوانیش خەڵکی خاوەن‌وشتر بوون و لێهاتوویی سەربازییان هەبوو، تا دوادواکانی ١٩١٩ هەر بۆ کۆکردنەوەی کرێکانیان لە دۆڵی ڕووباردا دەردەکەوتن، ئەوجا لە قووڵایی بیابان‌دا ون‌دەبوون و بە خێوەتە ڕەشەکانیانەوە دەکەوتنە گەڕان بۆ لەوەڕاندنی وشترەکانیان.[16] ڕاستە ئەو هۆزە نیمچەجێگیرانەی کە بنەماڵەی سەعدوون حوکمیان‌دەکردن، خۆیان وەک ئەوان لە دوورگەی عەرەبییەوە کۆچیان‌کردبوو، بەڵام ئەوە لە کاتێکی پێشتردا بووە و ئەوانە زیاتر بە شارستانێتیی میزۆپۆتامیاوە بەسترانەوە. هۆزی خەزاعیلیش،[17] خەڵکی دەشتەکیی خاوەن‌وشتر بوون، ئەوانیش بە ڕێگەیەکی هاوچەشنی شێوازی ژیانی دانیشتووانی فوراتی ناوەڕاست و خواروو، حوکمی جووتیارانی هۆزەکانیان دەکرد. ئەم ناوچەیەی دوایی لە دۆڵی دیجلە زیاتر جووتیارە خێڵەکییەکانی لێ‌خڕبووەتەوە، چونکە ئاودێری لە ئاوی فوراتەوە زۆر لە

---

* دکتۆر عەلی وەردی، پشتیوانیی لە تیزەکەی بیرمەند ئۆبنهایم کردووە کە گوتوویە: هێرشی دەشتەکییەکان بۆ سەر گوندەکانی دەشتی نیشتووی عیراق، نەخشی لە دامەزراندنی یەکەمین دەوڵەت‌دا هەبووە لە مێژوودا. عیراقیش لەو یەکەمین دەوڵەتانەیە کە دوو چین سەری تێدا هەڵدا: چینێکی حوکمدار و چینێکی حوکمکراو. بە واتایەکی‌تر، زۆرینەیەکی دەشتەکیی حوکمداری نیشتەجێی ڕۆژاوا و ژێردەستەیەکی حوکمکراوی نیشتەجێی دەشتی نیشتوو و ئەم هاوکێشەیە هەزاران ساڵ بەردەوامبووە. بڕوانە: علي الوردي، شخصية الفرد العراقي، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥١، ص٤٣. (و.ع)

[15] عباس العزاوي، عشائر العراق، الجزء ٣، ص٢١٠.

[16] Arab Bureau. The Muntafik, pp. 2-3 and Administration Report of the Muntafik Division for Year 1919. (Baghdad Government Press, 1920) p. 124.

هێندێ کەسی کەمی ئالسەعدوون کە خوێندنی بەرزیان لە ئەستەموول تەواوکردووە، وەک عەبدولموحسین سەعدوون کە پاشتر بوو بە سەرۆکوەزیرانی عیراق، لەم بۆچوونە بەدەرە.

[17] Arab Bureau, Arab Tribes of the Baghdad Wilayat, p. 147 and Administration Report for Shamiya for 1918 in Reports of Administration for 1918, p. 66.

ئاودێریی ئاوی دیجلە ئاسانترە، لەبەر هەڵکەوتی لێژیی خاک و هەبوونی تۆڕەکانی ئاودێری لە سەدەکانی ڕابوردووەوە.[١٨]

بۆیە وا دیارە جووتیاران لە کۆمەڵی خێڵەکیی ئەو ڕۆژگارەدا، لەو هۆزانە بوون کە یا بێهێزتربوون، یا ملیان پێکەچکرابوو. بەم پێیە -بۆ نموونە- دەبینین هۆزی خەزاعیل تەنانەت لە ١٩١٨دا، لە چەندین تیرەی هەمان بنەماڵە پێکدەهات، هەر تیرەیەکیش خزمەتکار و شوێنکەوتە و جووتیاری خۆی هەبوون، زۆربەیان بە بنەچە خەزعەلی نەبوون.[١٩] بە هەمان شێوە، هۆزی ئەلبومحەمەد،[٢٠] کە یەکێکە لە هۆزە بەهێزەکانی دۆڵی دیجلە لە سەدەی نۆزدەیەمدا و لقێکی زوبێدە، کەسانێکی هۆزە بێهێزەکانی[٢١] لە مەزرای گەنم و مەرەزەدا بەکاردەهێنا، وەک پاڵە کاری قورسی وەک دروێنە و گێرەی پێدەکردن. هەرچەندە ئەم حاڵوبارە لە ١٩١٧دا بووە، بەڵام هەلومەرج و کردەوەی سەردەمانێکی پێشووتر نیشاندەدا کە ئاماژەن بۆ ئەوەی وا هۆزی ئەلبومحەمەد لە ڕێگەی سەرشۆڕکردن بە هۆزەکانی دەوروبەریانەوە، گەشەیکردووە و گەورەبووە؛ بەتایبەت کاتێک شێخ فەیسەڵ کوڕی خەلیفە* پێشەوایەتیی دەکرد، کە هێزێکی چەکداری سازوتەیاری لە سەدەی نۆزدەیەمدا پێکهێنا، ٢١ تۆپی بۆ دابینکرد، دوو ئاسنگەری بەغدا بە تایبەتکاری بۆیان دروستکردبوو، چەکهەڵگرتنیشی لە هەموو پیاوانی هۆزەکانی ملکەچی دەسەڵاتەکەی قەدەغەکرد.[٢٢] ئاشکرایە ئەو جووتیار و خزمەتکارانە هەر دەبێ لەم هۆزانە کەوتبنەوە کە ملیان پێکەچکرا، یا لە هۆزە بێهێزەکان بووبن کە بە چوونە ژێر ڕکێفی بەهێزی ئەلبومحەمەد، دەگەڕان بەدوای پارێزگاریدا، یا بەشوێن

---

[18] Great Britain, Colonial Office, Special Report on the Progress of Iraq, 1920-1931, (London: His Majesty`s Office, 1931) p. 238.

[19] Arab Bureau, Arab tribes of the Baghdad Wilayat, p. 147.

[20] Arab Bureau, Tribes of the Tigris, Al Asairij, Albu Mohammad, Albu Darraj, etc. (Calcutta: Superintendent Government Printing, 1917) p. 9.

[٢١] وەک سەراج و بەنیمالیک و سۆدان و سەواعید.

* فەیسەڵ کوڕی خەلیفە: شێخێکی ئەلبومحەمەدە لە عەمارە، ناسناوی "ئەبوتەواب- أبوالطواب" (واتە بەرگریکەر) و ساڵانی ١٨٤٠-١٨٥٥ میری عەمارە بوو. (و.ع)

[٢٢] بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە مێژووی ئەلبومحەمەد و هۆزەکانیتری پارێزگای عەمارە، بڕوانە زنجیرە وتارێکی ناونیشان "مأساة لواء العمارة" لە ژمارە ٣٦٧، ساڵی سێیەم، ١٩٣٤/٧/٤ی ڕۆژنامەی "الأهالي"دا. سەبارەت بەم بڕگەیەیش، بڕوانە: الأهالي، ژمارە ٣٨٠، ساڵی سێیەم، ١٩٣٤/٧/٨.

ژیان و گوزەرانەدا، پاش ئەوەی هەڵگێڕوداگێڕی ڕووبار هۆیەکانی گوزەرانی لێسەندنەوە. لە ١٩١٧دا -وەک دەردەکەوێ- بەنیمالیک لە جووتیاران بوون و بە هەموو لایەکدا بڵاوبووبوونەوە، لە کەنارەکانی فورات کاریاندەکرد و لە باشووری دیجلە بەروبوومی زستانەیان لە زەوییەکانی هۆزی ئەلبومحەمەددا بەرهەمدەهێنا، لە هۆرەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەیش دەبینران.[23] ئەم پەراگەندەبییە، کە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ هەڵگێڕوداگێڕی هەردوو ڕووبارەکە، ئاماژە بۆ بێهێزیشیان دەکا. کەسانی لە ڕووی سەربازییەوە ئازاتری تاقمی خێڵەکیی بەنیمالیک، بەنوخیکان و مەجەڕەن، بە بنەچە ناچنەوە سەر بەرەبابی بەنیمالیک.[24] تیرەیەکی بەنوخیکان بە عەساکیرە ناودەبرێ،[25] ناویان بەڵگەی وەزیفەی پێشوویانە. ئەنجامگیری ئەوەیە: وێڕای ئەوەی هۆزەکان لە هەردوو سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەمدا، بە هۆی ئەو ناسەقامگیرییەوە کە مۆرکێکی سەردەمەکە بوو، لەسەر بنچینەی جەنگ و بەرگری ڕێکخرابوون و هەموو هۆزێکیش لە پێشهاتە ناوەختەکاندا خۆی سازدەدا بۆ بەرگری لە قەڵەمڕەوی هۆزایەتیی خۆی؛ بەڵام ئەمە -لە بەر ڕووناکیی سەرنجەکانی پێشوومانەدا- وا ناگەیێنێ کە هەموو کەسێکی هۆزەکە، وەک لە لقەکانی دەستەبەندیی مونتەفیقدا وایە کە ڕیفیر سەری لێدان، سەربازێکی ناو هۆزەکەیە.[26]

وا دیارە نموونەی باو لەناو کۆمەڵە خێڵەکییەکانی کوردانی چیاکانیشدا، هەر باڵادەستیی جەنگاوەران بووبێ بەسەر جووتیاراندا. دەبینین گەلی کورد دابەشبووە بۆ چینی جەنگاوەرانی پیاوماقووڵ کە تەنیا ڕانی مەڕوماڵات شکدەبەن و چینی جووتیاران کە لە چینی کۆیلە یا زەویبەندە (القن) دەچێ و پێی دەگوترێ ڕەعیەت یا گۆران.[27] باسیل نیکیتین، پێی وایە ئەم دوو بەشە تەنیا لەناو چەند هۆزێکی دیاریکراودا هەیە، نەک هەموو هۆزەکان. لە کاتێکدا ئەدمۆندز پێی وایە گۆران، کە بە ناوی "مسکێن"یشەوە ناسراوە، زەویبەندەی

---

[23] The Arab Bureau, The Muntafik, p. 2; and the Tribes of the Tigris- Azairij, Albu Muhammad, etc., p. 9; and Tribes Round the Junction of the Euphrates and Tigris, p. 2.

[24] Arab Bureau, (Conf.) The Muntafik, pp. 62-65.

[25] Ibid, p. 62.

[26] Denis de Rivoyre, p. 175.

[27] Basil Nikitine, *Les Kurdes, Etude Sociologique et Historique* (Paris: Imprimarie Nationale, 1956) pp. 124-125.

وەرزێری نیمچەخێڵەکین، کشتوکاڵ لەو زەوییانەدا دەکەن کە هیی خاوەنی گوندن، ئاغای ناوە،* یا سەرۆکهۆزی بنەماڵەیەکی خێڵەکییە.[٢٨]

وا دیارە جووتیاری خێڵەکیی عەرەب، وەک جووتیاری کورد، دانەکەوتووە بۆ دۆخی کۆیلایەتی یا زەویبەندەیی، چونکە ڕامالینی خاک یا نیشتووی ڕووبارەکان یا لافاوەکان، یان زیادبوونی شۆریی خاک و پەلامارە خێڵەکییەکان، بەردەوام هۆزە عەرەبییەکانیان پەرەوازەکردوون، یا هاوسەنگیی هێزیان گۆڕیون. ئەمەیش تینوتوانێکی زیاتری جووڵەی بۆ جووتیار فەراهەم و لە بەندایەتی ڕزگاری کردووە، بەڵام -بێگومان- لە دۆخە ئابوورییە داوەشاوەکەی ڕزگاریینەکردووە!

ئێستە دەتوانین خاڵێکی بنچینەیی ببینین: سەرەتاکانی ئەم دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەی ناو هۆز لە حاڵی حازردا، دەبرێتەوە بۆ هەم سیستەمی جەنگیی دەشتەکێتی، کە ڕووی لە خولقاندنی چینی سەرۆکهۆزە حوکمبەدەستەکان (واتە سەرگەورەی سەرۆکهۆزان و نموونەکەیشی سەرۆکانی دەستەبەندیی خێڵەکانە) و چینی سەرۆکانی هۆزە دامەزرێنەرەکان و ماڵانی سەرۆکهۆزەکانە؛ هەم -سەرباری ئەوە- هەڵاواردنی نێوان دەشتەکیی جەنگاوەر و ئەو وەرزێرە کە بە زۆری پێوەندیی پێیەوە نییە. مۆرکی ئەم دابەشبوونە شێوەیەکی دیاریکراو و شەقڵێکی بەرچاوی هەبوو، سیستەمێکی نیمچە تاکەکەسیی موڵکایەتیی لە دوایین بەشی سەدەی نۆزدەیەمدا پێشکەش بە جیهانی هۆزەکان کرد، ناوی تاپۆی لێنرابوو، کە ئەم ڕۆژانە لە سیستەمی لەزمە (اللزمة) دەچێ (لە شوێنێکیتری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، وتووێژی لەبارەوە دەکەین). بەڵام سەرنجمان بۆ لایەکیتری بنیاتی هۆز لە ماوەی نێوان سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای بیستەمدا ڕادەکێشێ، کە ئەویش پێوەندیی نێوان ئاوایی (الديرة) و بنەمای موڵکایەتیی هاوبەشە.

لەو دەشتانەدا کە بە ئاوی سەرزەوی ئاودەدرێن، هەر هۆزێک لەو هۆزانە کە دەستەبەندییان دامەزراندووە، خاوەنی ئاواییەکە، کە ڕووبەرێکی زەوییە، جا ئیتر شیاوی کشتوکاڵ بێ یان نا، هۆز بە شێوەیەکی ئاسایی بەکاریدێنێ؛ یا

---

* ئاغا: لە زمانی تورکیدا واتە سەرگەورە یا سەرۆک، ناسناوێکە لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەکارهاتووە، بۆ نموونە: ئاغای دیوان و ئاغای کورسی. ناوی ئاغا لە پێشەوای تیرەی ئیسماعیلیش نراوە. بڕوانە: مصطفى بركات، الألقاب والوظائف العثمانية، دار غريب للطباعة، القاهرة، ٢٠٠٠، ص٣١٢. (و.ع)

28 Edmonds, p. 12.

هۆز مادامێکی دەتوانێ پارێزگاریی لێبکا، دەتوانێ لە دەستی خۆیدا بیهێڵێتەوە. ئەم زەوییە لە نێوان تیرە جیاجیاکانی هۆزدا دابەشدەکرێ و سەرگەورەی سەرۆکهۆزان بەشێکی بەرهەمی ئەم زەوییە وەک باج وەردەگرێ. سەرۆکهۆزیش، یا پارچەیەکی باشی زەوی وەردەگرێ، یا پشکێک لە بەروبووم. ئەم بەش یا پشکە نە پێوەندیی بە سەرۆکهۆز خۆیەوە هەیە، نە ئەو خاوەنیەتی، بە مانای ئەو موڵکایەتییە کە ئەمڕۆ لێی تێدەگەین، بەڵکوو پشکی میوانخانە،[29] یا ماڵی میواندارییە کە بە ناوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسیی هۆز دادەنرێ؛ سەرۆکهۆزەکان و سەرۆکتیرەکان لەوێ پرسوڕاوێژدەکەن و لە پێشوازیی میوانان و نێردراوانی هۆزەکانیتردا دەبن. پشکی میوانخانە، وەک ڕیڤێر ناویناوە، سندووقی هاوبەشی هۆزە.[30] داب و نەریت بڕیار لەوە دەدا کە هەموو یەکێکی هۆز هاوبەشی لەم سندووقەدا بکا و سەرگەورەی سەرۆکهۆزان، یا سەرۆکهۆز، یان سەرۆکتیرە، مافی هەیە چەندی لێڕابکێشێ. خەرجیی مشتوماڵدانی بورجە قایمکراوەکان کە پێیاندەڵێن مەفتوول* و پێویستییەکانی هێزی چەکداری هۆزیش، لەم سندووقە هاوبەشە دەکێشرێن. ئەو خاڵە کە دەبێ جەختی لێبکرێتەوە، ئەوەیە کە ئەم زەوییە موڵکی هاوبەشی هەموو هۆزە و هەموو یەکێکی هۆز پشکێکی ئەوەندەی پشکی خودی سەرۆکهۆزی لە زەویی ئاواییدا هەیە.

بنەمای دووەمی سیستەمی ئاواییی هاوبەش، ئابووریی خۆژیاندن (الکفاف)ە،** چونکە مەسەلەی قازانجی تێدانییە و بەرهەمهێنان بەپێی پێویستییەکانی

[29] Dr. Saleh Haider, The Land and the Tribe. A Paper Delivered at the Salahaddin Conference in October 1955. (Food and Agriculture Organization of the U. N. Center on Land Problems in the Near East, Salahaddin, Iraq, October 1955, Paper p- 12, p. 3.

[30] De Rivoyre, p. 174.

* مەفتوول: بریتییە لەو بورجانە کە خێڵات لە قەڵەمڕەوی زەوی یا دەسترۆیییاندا لە خشت یا قوڕ دروستیدەکەن، بۆ پارێزگاری و بەربەستی پەلاماری خێڵەکی. ئەرکی سەرەکیی، یەکەم- پاسەوانییە بەرامبەر بەو هێرشە کوتوپڕانە کە دەکرێنە سەر ئاوایی (دیرە) و دووەم- خۆتێداقایمکردنە بۆ شەڕ و بەرەنگاری پاش تفەنگ بەکارهێنان. (و.ع)

** ئابووریی خۆژیاندن یا Subsistence Economy: ئابوورییەکی نادارایییە، پشت بە سامانی سروشتی دەبەستێ بۆ دابینکردنی پێویستییە بنچینەییەکان، لە ڕێگەی ڕاووشکار یا کۆکردنەوە یان کشتوکاڵەوە. مەبەست لە خۆژیاندن، بەدیهێنانی لایەنی کەمی پێویستییەکانی مرۆڤە. زیادەی

سەرۆکهۆز و هۆزەکەی دەبێ. جاروباریش وەزیر دەیەوێ پشکی خۆی بکێشێتەوە؛ سەرکێشیدەکا، بە سوپایەکی حکوومەتییەوە لە بەغدا دێتەدەرێ بۆ کۆکردنەوەی بەشەهەقی حکوومەت،[31] یا -بە ڕاشکاوییەکی زیاتر- تا کەسیتر پێشینەکەوێ و خۆی بکەوێتە تالانکاری.[32]

شایانی سەرنجدان ئەوەیە کە هۆز تا ئەو کاتە سیستەمی باوکسالاریی خۆی لەدەستنەداوە، چونکە یەکەی بنچینەیی لە هۆزدا بنەماڵەیە، بە سەرۆکەکەی دەگوترێ دەمڕاست (گلێت-کلیط)[33] و دەسەلاتێکی ڕەهای وەک دەسەلاتی سەرۆکهۆزی بەسەر بنەماڵەکەیەوە هەیە: هەموو وردودرشتێکی ژیانی دیاریدەکا و تاکە نوێنەر و پارێزگاری بەرژەوەندەکانیەتی. کە هەڵەیەک دەکرێ، یا کێشەیەکی گرنگ سەرهەڵدەدا، سەرۆکهۆز ڕاوێژ بە گلێتەکان* دەکا. ئەم کۆڕەیش ڕیشسپیی تێدا دادەنیشێ، کە کەسێتییەکی ئایینیی** شارەزای ئایین و ڕێوڕەسمەکانی هۆزە و بیروڕاکانی زۆر ڕێزیان لێدەگیرێ. سەرۆکهۆز هەمیشە هەوڵدەدا دڵی ڕیشسپی ڕابگرێ، چونکە کاریگەرییەکی ئەخلاقیی بەسەر جووتیارانەوە هەیە. بەڵام هیچ بەڵگەیەک نییە ئاماژە بەوە بدا کە ئەم کەسێتییە ڕۆژێک لە ڕۆژان ویراویەتی بەرهەڵستیی سەرۆکهۆز بکا، لە هەر شتێکدا ئەو ویستبێتی.

---

ئابووری لە ئابووریی خۆبژێویدا لە کەمترین ڕادەدایە و تەنیا بۆ ئاڵوگۆڕی کاڵا بنچینەییەکان بەکاردەهێنرێ و پیشەسازیشی تێدانییە. (و.ع)

[31] بەشەهەقی زەوی، لە ڕووی تیۆرییەوە، دەچێتەوە بۆ حکوومەت.

[32] بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە وەزیرە تالانکەرەکانی سەدەی هەژدەیەم، -بۆ نموونە- بڕوانە: عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، المجلد الخامس، ص١٦٥-١٧٢.

[33] من سەبارەت بە زانیارییەکانی ناو ئەم برگەیە، قەرزاربارێ دەستنووسێکی کۆمۆنیستیی بلاونەکراوەم، بەم ناونیشانە: "معلومات عن ريف العمارة"، ص٣-٤. دەستنووسەکە لە بەندیخانەی باقووبە دۆزراوەتەوە.

* گلێتەکان: تاکەتاکەی گلێتە. ئەو کەسەیە کە کار دەکاتە سەر خێڵەکەی و زۆربەی ئامۆزاکانی و ڕێزێکی گشتیی لای سەرۆکهۆز هەیە و مەجلیسی خێڵ بەردەوام لەم گلێتانە پێکدێ. (و.ع)

** ڕیشسپی، مەرج نییە بە ناچاری کەسێکی ئایینی بێ، بەڵکوو کەسێتییەکی کۆمەڵایەتیی ڕێزلێگیراوە، شارەزایی و لێزانی و زیرەکیی لە چارەسەری کێشە خێڵەکییەکاندا هەن. خەڵک بۆ چارەسەری ئەو گیروگرفتانە کە بەڵگەی ئاشکرایان نییە بۆ سەلماندن، پەنای بۆ دەبەن. (و.ع)

### ئەنجامگیری

لەم قۆناغەدا و پێش ئەوەی لەگەڵ سەرۆکهۆز بچینە ناو قۆناغێکی تازەی مێژووی عیراق، ئەوە بەئەنجامدێنین کە سەرۆکهۆزانی دۆڵی دیجلە و فورات، دیاردەیەکن ماوەی پشێوییەکانیان پێدەناسرێتەوە. ئەوان لە بیاباندان، لە چوارچێوەی ژینگە و دەوروبەرە سروشتییەکەیاندا، بەڵام لە دۆڵی دووڕووباردا، ئەوان دۆخێکی ناوازەن. ئەوان لە ماوەی پشێوییەکانی نێوان سەدەی سیازدەیەم و سەدەی هەژدەیەمدا، ئەرکێکی کۆمەڵایەتییان بەجێهێنا. سەرۆکهۆز داواکراو بوو، خۆی -کەموزۆر- کارێکیکرد پێویستیان پێی بێ. ماوەی پشێوییەکانی دوابەدوای پەلامار و داگیرکاریی مەغۆلی، سەرۆکهۆزەکان پشێوییەکی زیاتریان نایەوە. بەڵام لەبەرئەوەی شار بێهێز بوو، ئەو تاکە لایەن بوو بتوانێ پارێزگاری دابینبکا. هۆز، ئەو تاکە تاقمە کۆمەڵایەتییە ڕێکخراوەیە کە نەهێڵێ زەرەر و زیان ڕووبدا و ئەگەر ڕووی دا، دەتوانێ تۆڵەی بستێنێتەوە. تەنانەت دانیشتووانی شارۆچکە و ناوچە بچووکەکانیش دەچنە پاڵ نزیکترین هۆزی دەوری خۆیان، ئەگەرچی سەر بەویش نەبن.[٣٤] سەرۆکهۆز، بێگومان بە لای جووتیاری هۆز و هۆز خۆیشیەوە، شتێکی ناچاری و پێویستییە. بەڵام کە شار ڕاستدەبێتەوە و سەقامگیریی داواکراو دابیندەکا، ئەو سەرۆکهۆزە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان پارێزگار بوو، دەبێتە بەڵا و بارێکی قورسی ئابووری. لێرەدا کێشەیەکی گرنگ دەورووژێنرێ، ئەویش ئەوەیە: ئایا پاشماوەکانی ڕابوردوو و میراتی سەردەمانی پێشوو، بوون بە بەشێکی مێژوو، بە شێوەیەک کە پێوەندییان بە ئێستەوە نەبێ؟ دەبێ لە لاپەڕەیەکی تازەی مێژووی سەرۆکهۆزەکان بکۆڵینەوە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە.

---

[٣٤] بۆ نموونە، بڕوانە:
Administration Report of the Muntafik Division for the Year 1919, p. 109.

# باسی چوارەم

## یەکەم بزاوتی شار و کاریگەریی لەسەر دەسەڵاتی سەرۆکهۆز (١٨٣١-١٩١٧)

چەمک و شێوازە تازەکانی سەدەی نۆزدەیەم کێشایانەوە بۆ لەقکردنی جێپێی سەرۆکهۆز و هێنانەدەرێی لە دوورەپەرێزییەکەی و لەبەریەکهەڵوەشاندنی هاوپەیمانییە سەربازییەکانی و داڕووخاندنی بوارە هاوبەشەکەی خۆژیاندنی.

هێزە تازەکان لە شارێکەوە کە سەرلەنوێ بێداربووەوە، سەریانهەڵدا و جۆشوخرۆشیان لەو گیانی چەکسازییەوە دەستی پێکرد، کە ئەستەمووڵی عوسمانیی گرتەوە و بووە هۆی بڕاندنەوەی یەنیچەری[٣٥] لە ١٨٢٦دا و دامەزراندنی سوپایێکی تازەی زۆربگیر (ئیلزامی) و کۆتاییهێنان بە بنەماڵەی -بە کردەوە- سەربەخۆی [بە ئەسڵ] جۆرجیی مەملووکی لە بەغدا ساڵی ١٨٣١ و دووبارە لکاندنەوەی هەرێمی عیراق بە ئیمپراتۆریی دایکەوە و خستنەکاری کەشتییەوانیی هەڵمین لە ڕووباری دیجلە ساڵی ١٨٣٩ و دەرکردنی قانوونە تازەکانی زەویوزار ساڵی ١٨٥٨ و بنیاتنانی تۆڕی پێوەندیی تەلگراف لە ١٨٦١-١٨٦٤دا و دانانی سیستەمی تازەی ناوەندگریی ویلایەتەکان و دەرکەوتنی مەدحەتپاشا (١٨٦٩-١٨٧١)ی والیی چالاک و سەرکێشی بەغدا و شۆڕشی کۆمەڵەی تورکیای لاو لە ١٩٠٨دا.*

سەرۆکهۆز، لە ڕێگەی تەنگەتاوکردنی ڕاستەوخۆ و بەردەوامی حکوومەتی تورکیاوە، بۆ هەڵتەکاندنی جێوڕێیەکەی و لێکهەڵوەشاندنی یەکگرتوویی

---

[٣٥] یەنیچەری، پێکهاتەیێکی سەربازیی پیادەی تورکییە؛ تەوەری سەرەکیی سوپای هەمیشەیی پێکدەهێنا و بە زۆری لە منداڵانی مەسیحیی ژێردەستەکراو پێکەوەنرابوو.

* هەندێک کەس ئیدارەی داودپاشا کە ساڵی ١٨٣٠ لێخرا، بە سەرەتای پرۆسەی نوێکردنەوە دادەنێن. هەندێکیتریش ١٨٦٩، ساڵی بوونە والیی عیراقی مەدحەتپاشا، بەو سەرەتایە دەزانن. ئەم ئاڵوگۆڕە ڕووڵەچاکییانە و کاریگەرییە بەرچاوانە، بە شێوەیێک لە شێوەکان نەخشیان هەبوو لە گەیاندنی عیراقدا بە کاروانی مێژوو. براونە: محمد جبار ابراهیم الجمال، بنیة العراق الحدیثة وتأثیرها الفکري والسیاسي ١٨٦٩-١٩١٤، مطبعة ایلاف، بغداد، ٢٠١٠، ص٢٩ و بەدواوە. (و.ع)

هۆزەکەی و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆیش، لە ڕێگەی کاریگەریی توندی چەند هێزێکی دەرەوەی ناوچەکەیەوە کە بە زەبری ئامرازە نوێیەکانی گواستنەوەی ناو ڕووبار، وایان لێهات لێی نزیکببنەوە، هەستی بەم پەرەسانە (تطورات) کرد.

سیاسەتی تورکی بەرامبەر بە هۆزەکان، لەسەر بناغەی دابەشکردن هەڵچنراوە، بە بەهێزکردنی ململانێی ناومالّی سەرگەورەی سەرۆکهۆزان و کۆکردنەوەی نەیار لە دژی و دژ بە هەر سەرۆکهۆزێکی هۆزە دامەزرێنەرەکان و هۆزەکانیتر و پشتگوێخستنی هەموویان و ڕاستەوڕاست مامەڵەکردن لەگەڵ سەرۆکە بچووکەکانی تیرەکان. تورکان، چەکی زەویوزاریان بە چەشنێکی کارا بەکارهێنا، بۆ بەجێهێنانی ئەم سیاسەتە.

هەموو زەویوزارەکان، بەپێی چەمکەکانی عوسمانی، جگە لە هەندێ موڵکایەتیی تایبەتی نزیک و دەوری شارەکان و هەندێ هەڵاواردنی تایبەت، بە زەویوزاری میری دەژمێردرێن، واتە دەوڵەت موڵکداریانە و بەکارهێنەرەکانیشیان لە دەوڵەتیان بەکرێگرتوون. ساڵی ١٨٥٨ قانوونی تازەی زەویوزار دەرچوو، ئەم چەمکانەی خستنە قاڵبی قانوونەوە و هاوکات چەمکێکی تازەی موڵکایەتیی زەویی هێنایە ناوەوە، بە تاپۆ ناسرا، کە مافی موڵکایەتیی تاسەری زەویی بۆ دەوڵەت هێشتەوە، بەڵام مافێکی قانوونیی شیاوی میراتگریی بە تاکەکان بەخشی، ئەویش مافی قازانجە.*

قانوونە تازەکە بە هەمان ئاڕاستە سەریهەڵدا کە شەقڵی سیاسەتی عوسمانیی بەرامبەر بە هۆزەکان لێدرابوو و هەوڵیدەدا بکەوێتە بەعوسمانیکردنی جیهانی هۆزەکان، واتە بەهێزکردنی ئیدارەی ناوەندیی عوسمانی لەسەر حیسابی دەستڕۆیی سەرۆکهۆزەکان. قانوونەکە بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستە، ڕێگەیەکی تازەی بۆ دابینکردن، ئەویش پێکهێنانی کەمینەیەکی موڵکداری ناو ئەو ژمارە زۆرەی پیاوانی هۆزەکان بوو. بەڵام مەسەلەکان بە کردەوە پێچەوانە کەوتنەوە،

---

* زەویوزار لە دەوڵەتی عوسمانیدا، بەپێی قانوونی ١٨٥٨ کرا بە پێنج پۆلەوە: ١. زەویی خاوەنموڵک، ٢. زەویی میری کە میراتەکەی هیی بەیتولماله و حەواڵەکران و پێسپاردنی بە ڕەزامەندیی دەوڵەت و قەواڵەی تاپۆ دەبێ، ٣. زەویی وەقفکراو، ٤. زەویی دەستلێنەدراو، ٥. زەویی چۆڵەوانی بێخێر. بڕوانە: عماد احمد الجواهري، تأريخ مشكلة الاراضي في العراق ١٩١٤-١٩٣٢، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٨، ص٢٨. (و.ع)

هەرچەندە تورکان ئەوپەڕی هەوڵیان دا هۆزایەتی لە بناغەوە هەڵتەکێنن. تورکان، سەبارەت بە دەستەبەندیی بەهێزی مونتەفیق، تێکۆشان بە گۆڕینی بەردەوامی سەرۆکهۆزانی سەعدوون (السعدون) و بەگژداکردنەوەی یەکێکیان دژ بە یەکێکیتر، بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان. پاشان سیستەمێکیان هێنایە ناوەوە تا دێهاتی مونتەفیق بدەنە هەر کەسێکی هۆزی سەعدوون کە زۆرترین پارە بدا. دواجاریش ساڵی ١٨٧١ مەدحەتپاشای والیی مەزنی تورک، هەوڵی دا بنەماڵەی حوکمداری سەعدوون بە قبووڵکردنی سیاسەتی تازەی بەعوسمانیکردن فریوبدا. ڕێوشوێنی بەکارهێنراویش ئەوە بوو، لە کۆمەڵە سەرۆکهۆزێکی پاداشتوەرگرەوە بیانکاتە خاوەنتاپۆی زەویوزاری هۆزەکانی مونتەفیق.[٣٦] ئەوە ڕیزەکانی ئالسەعدوونی لە نێوان بەعوسمانیبووەکان و لایەنگرانی بنەما کۆنە هۆزایەتییەکاندا دووکەرتکرد، بەڵام کاری ترسناکتر، ژێربەژێر زەوتکردنی زەویوزاری کشتوکاڵیی پیاوانی هۆزەکان بوو، کە هەمووان مافێکی هاوبەشیان تێدا هەبوو و کردنشیان بوو هەر بە بەکرێگر (ئیجارەکەر).*

بەم پێیە چەندەها ڕووبەری پان و بەرینی ئەو زەوییانە کە چەندین هۆزیان لەسەر دەژیا، بوونە موڵکی دەرەبەگیی بنەماڵەی سەعدوون. پاش ئەوەی بنەماڵەی سەعدوون، بە پێچەوانەی سەرۆکانی هۆزەکانیترەوە، بوونە موڵکداری زەوی، ئیدی بە بەکرێدانی زەوییەکانیان دەوڵەمەندبوون، کە هەر تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم بەردەوامبوو، کاتێک ژمارەیەکی زۆری جووتیارانی هۆزەکان بوونە خاوەنی تفەنگی نوێ و ڕازینەبوون هیچ بدەن بە سەرۆکهۆزەکان. لەم قۆناغەدا، بنەماڵەی سەعدوون کەوتە خۆ دووبەرەکی بخاتە ناو ڕیزی هۆزەکان، ئەویش بە بەکرێدانی زەوی بە سەرۆکە لاوەکییەکانی تیرەکان، دوور لە سەرگەورەی

---

[36] Arab Bureau, (conf.) The Muntafik. pp. 3-6.

* دەتوانین بڵێین: پاش پێسپاردنی زەویی کشتوکاڵی بەو تاپۆیە کە مەدحەتپاشا دوای ساڵی ١٨٦٩ دەستیپێکرد، جۆرە دووفاقییەک لای ئێمە لە موڵکایەتیی زەویدا ڕووی دا: موڵکایەتیی نەریتی و مێژوویی کە خێڵات لە سەدان ساڵەوە هەیانە و لەژێر دەستیاندایە و موڵکایەتیی قانوونی، کە لە ڕێی زیادکردنی ئاشکراوە لە بەغدا دەستی بەسەردا گیرا. بنەماڵەکانی ئالسەعدوون و مەنناع و هیتر لە پیاوماقوولان و پیرانی بەغدایی، کە ناوی لۆردە گومناوەکانیان لێنرا و ساڵانە بەبێ ماندوویێتی یا ڕەنجکێشان هەقی موڵکایەتییان وەردەگرت، کەڵکیان لەم پێسپاردنە بینی. ئەم کارەیش بە سەرەتای دامەزراندنی سیستەمی دەرەبەگایەتی لە عیراق دانرا. (و.ع)

سەرۆکانی هۆز (شیخ المشایخ) و بەمەیش تا ساڵانێکی نزیکی بەر لە هەڵایسانی یەکەم جەنگی جیهانی، کاتێک پیاوانی هۆزەکان قایلنەبوون هیچ بڕە پارەیەکیان پێبدەن، بەشێکی کرێیەکانی خۆیان بەدەستهێنا.[٣٧] ئەم هۆیانە هەموویان بوون بە مایەی هەڵوەشاندنەوەی دەستەبەندیی مونتەفیق بۆ چەندین هۆزی ناتەبا و لەناو خۆیاندا ناکۆک و چەندین پارچە و بەش و لقیان لێبووەوە.*

هەروەها ئەم دەستپێشخەرییەی عوسمانی، بووە هۆی تێکدانی دەستەبەندیی خەزاعیل، هەرچەندە وشکداهاتنی لقی حلله کە سەرچاوەکەی لە فوراتەوەیە و جووتیاران لە کشتوکاڵیاندا پشتی پێدەبەستن، هۆیەکیتری هەژارکەوتنیان بوو. سەبارەت بە دەسکەوتەکانی عوسمانی، بەڵگەنامەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە حاکمی عوسمانی لە نەجەف، یەکێک لە دیارترین سەرۆکهۆزانی خەزاعیلی ژەهرخواردووکردووە، کە ئەویش شێخ دەربە و نەوەکەیشیی ناچارکردووە بچێتە ریزی شەڕی جیهادی دژ بە ڕووسیا؛ لەوێ کوژراوە و نەوە گەورەکەیشی لە مووسڵ -هەر لەوەبەتر- ژەهرخواردکراوە.[٣٨]

ئەو شێوازەیتر کە عوسمانییەکان خستیانەگەڕ، هۆزی نامۆ و دوژمنی وەک بنەماڵەی فەتلە و بەنوحەسەن هێنانە سەر زەویوزاری شامییە و فوراتی ناوەڕاست بوو، لە کاتێکدا پێشتر هەر خەزاعیل قۆرخیکردبوو. بنەماڵەی فەتلە، کە پاشتر دەورێکی بەرچاوی لە مێژووی نوێی عیراقدا گێڕا، لە کۆمەڵە جووتیارێکی چالاکی تا ڕادەیێک پابەندی قانوون و ملکەچی -کەموزۆر- دەسەڵاتی دەوڵەت پێکهاتبوو؛[٣٩] دەرکەوتنیان لە شامییە، بووە سەرەتای قۆناغی ململانێیەکی درێژخایەنیان لەگەڵ خەزاعیل. عوسمانییەکانیش ژمارەی موڵکدارانی

[37] Administration Report of the Muntifak Division for 1919. pp. 123-124.

* پاش ئەوەی ئینگلیز ١٩١٤-١٩١٧ عیراقی داگیرکرد، زۆربەی سەرۆکخێڵەکان ڕازینەبوون موڵکانە بدەنە بنەماڵەی ئالسەعدوون. هۆیەکەیشی، نەمان و ڕووخانی دەسەڵاتی عوسمانی بوو. بنەماڵەی ئالسەعدوونیش چەند داوایەکی قەزاییی لە دژیان بەرزکردەوە. بەڵام ئینگلیزەکان لایەنگریی سەرۆکخێڵەکانیان کرد دژ بە بنەماڵەی ئالسەعدوون، تا بەلای خۆیاندا ڕایانبکێشن و دەسەڵاتیان بنجبەستبکەن و بترسن لێیان هەڵگەڕێنەوە. ئەو داوایانە لە دادگادا بەردەوامبوون، تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨. دکتۆر عەبدوڵا فەییاز (عبدالله الفیاض)، لە کتێبەکەیدا: "مشکلات الأراضي في لواء المنتفك" بە درێژی لێیدوواوە. (و.ع)

[38] Arab Bureau, Baghdad, Arab Tribes of the Baghdad Wilayat, p. 147.

[39] Ibid, p. 83.

به ئەسڵ سەیدیان لەم مەڵبەندەدا زیادکرد.[40] ئەو سەیدانە سەرنجی زۆری جووتیارانی هۆزە جیاجیاکانیان بە لای خۆیاندا ڕاکێشا، تا بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە زەویوزارە بەربڵاوە دەربەگییەکانیاندا کاربکەن و بەوە بە یەکجاری لە هۆزە سەرەکییەکانی خۆیان دووریانخستنەوە.[41] زەویی بەخشراو بە سەرۆکهۆزان و سەیدە تازەکان، تا ڕادەیەکی زۆر زەویی میری بوو،[42] ئەوانە هەر لە ڕووی تیۆرییەوە بەشی حکوومەتیان لێدەدا، کە (٤٠٪)ی بەرهەمی ساڵانە بوو. نەدانی ئەو بەشەیش، واتە ئەم زەوییانەیان لێدەکێشرایەوە. بەڵام دوایین بژاردە ڕێی تێنەدەچوو، چونکە خاکەکەی ئەوپەڕی بەپیتبوو و ئەو سەرۆکهۆزەیش کە زەویوزارێکی پان و بەرینی هەبوو و نەیدەتوانی بایەخی پێبدا و دەترسا حکوومەت بەشە بەیارەکەی بداتە کەسانیتر، زەوییەکانی بەسەر سەرۆکی ماڵەکانی ژێر دەستی خۆیدا دەبەشییەوە و بەشێکی بۆ خۆی تێدا دەهێشتەوە.[43] سەرۆکی ئەم ماڵانە هەمان ئەو مافانەیان هەبوو کە سەرۆکهۆزەکانیان لە زەوییەکاندا هەیانبوو؛ زۆریان بوونە موڵکداری زەوی و هاوکات جووتیاری سەر زەوییەکە. لێرەوە دیاردەی موڵکداری جووتیار لە شامییە سەریهەڵدا، کە دیاردەیەکی تا ساڵی ١٩٥٨ لە عیراقدا هەڵاواردە بوو.

چارەنووسی دەستەبەندیی بەنیلام لەسەر ڕووباری دیجلە لە ناوچەی عەمارە، وەک هیی خەزاعیل پڕکارەسات نەبوو. هۆزی بەنیلام دەسەڵاتی بەسەر هۆزی ئەلبومحەمەددا نەما و هەردوو هۆز کەوتنە داوی جەنگێکی هۆزایەتی.[44] زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەو ناوچەیە، هەر وەک میری مانەوە. پاش ١٨٨٣ بەشێکی گەورەیان لێ بوو بە موڵکی تاجی عوسمانی، یا ئەوە کە پێی گوتراوە «سەنییە.»[45] عوسمانییەکانیش نەیانتوانی ئەم مەڵبەندانە، جگە لە سەرۆکهۆزەکان، بە کرێ بدەن بە کەسێکیتر. لە لایەکیترەوە، بۆیان سەرچوو بە چەندەها جار و بەردەوام دابەشکردنی ئەم زەوییانە، دەسەڵاتی ئەم سەرۆکهۆزانە بەسەر ئەندامانی بنەماڵە

---

[40] سادات: ئەوانەن کە لە نەوەی پێغەمبەر، محەمەد (د.خ)، کەوتوونەوە.

[41] Administration Report for 1918, P. 66.

[42] واتە ئەو زەوییانە کە موڵکی دەوڵەتن.

[43] Ibid, PP. 72-73.

[44] Arab Bureau, Tribes of the Tigris, Azarij, Albu Muhammad, P. 12.

[45] زاراوەی سەنییە، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە موڵکی سوڵتان عەبدولحەمید خۆیەتی.

حوکمدارەکان‌دا بێ‌هێزبکەن.[٤٦] ئەمە ڕق و کینەیەکی تاڵی لە دڵی خەڵکانی هۆزەکان‌دا چاند و نەیهێشت یەکبگرن و پشێوییەکی بێ‌برانەوەیشی نایەوە.

ئەم دابەشبوون و دووبەرەکییە، زوبێد و تا ڕادەیەکی کەمتریش دەستەبەندییەکانی شەمەر و دلێمیان گرتەوە،[٤٧] لە کاتێکدا پێکهاتە هۆزایەتییەکانیان و لقە سەرەکییەکانیان کەوتنەخۆ و ئارەزوویان بوو بە کردەوە سەربەخۆبن. لە ناوچەی کوردنشینی باکووری ڕۆژهەڵاتی عیراقیش‌دا، میرایەتییەکانی بادینان و سۆران و بابان لە نێوان ساڵانی ١٨٣٧-١٨٥٢دا پارچەپارچەبوون و حوکمێکی ڕاستەوخۆی لەرزۆکی عوسمانی جێی گرتنەوە،[٤٨] بەڵام زەوی‌وزارەکان درانە بنەماڵە هۆزایەتییە حوکمدارەکان؛ بۆ نموونە، ڕووبەرێکی بەرینی زەوی‌وزار لە تاپۆدا بە ناوی بنەماڵەی بابان و بەگزادەی بنەماڵەی جاف و بنەماڵەکانی تاڵەبانی و داودەوە تۆمارکران.* ئەم بنەماڵانە سەرۆکایەتیی ئەو هۆزانەیان دەکرد کە میرایەتییان لێ پێکهاتبوو.[٤٩] ئاغایانی هۆزە بچووکەکانیش، کە تەنیا باجگری سەر جووتیاران بوون، زەوی‌وزاری گوندیان بە ناوی خۆیانەوە نووسی. هەرچی زەوییەتری تاپۆیشە کە هێندێ جووتیار چەند پارچەیەکیان لێ دەستکەوتبوو، سەرۆکهۆزەکان لێیان کڕین.[٥٠]

ئامرازە تازەکانی گەیاندنی ناو ڕووبار، بەتایبەت پاش کردنەوەی کەناڵی سویس لە ١٨٦٩دا، دەستپێشخەرییەکی تورکی بوون، کارێکی هەرەگەورەیان کردە سەر سەرۆکهۆز و هۆز. هۆزەکانی شەتاوی عەرەب و دیجلەی نزیک بە کەنداوی

---

46 *Ibid*, P. 10.

٤٧ بۆ وردەکاریی زیاتر سەبارەت بە چارەنووسی زوبێد و شەمەر و دلێم، بڕوانە:
Arab Bureau, Arab Tribes of the Baghdad Wilayat, PP. 263, 194-195 and 58 respedbively.

48 Edmonds, p. 8.

* حەننا بەتاتۆ لە کتێبەکەی‌دا "عیراق" (کتێبی یەکەم، بەپێی چاپی عەرەبی)، ناوی ئەم خێزانانەی لە خشتەی ئەو کەس و خێزانانەدا کە زەویی گەورەی کشتوکاڵییان لە عیراق‌دا هەیە، ڕیزکردووە و خێزانی جافی خستووەتە سەراووردی موڵکداران و خێزانی تاڵەبانیشی لە ڕیزەکەدا بە یازدەیەم و بابانیشی بە هەژدەیەم داناوە. بڕوانە: حنا بطاطو، العراق، الکتاب الاول، ص١٨، جدول رقم ٣-٥. (و.ع)

49 Reports of Administration for 1918, I, PP. 417-418.

50 Ibid, P. 418.

فارسی، هۆزەکانی بەسرە بە شێوەیەکی تایبەت و هۆزەکانی لیوای عەمارەیش بە ڕادەیەکی کەمتر، لەو یەکەمین هۆزانە بوون کە ئەوە کاری تێکردن. هەرچی ڕووباری فوراتیشە، دەرکەوت بە کەڵکی کەشتییەوانیی خێرای نیزامی نایێ. لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەیەمدا، تەوقی گۆشەگیریی ئابووریی ئەم هۆزانە شکێندرا و ئابووریی خۆژیاندنیش وردە وردە شوێنی خۆی چۆڵکرد بۆ ئابووریی بازاڕ. بەوپێیە، ئەم هۆزانە لە بەرەوە بەسترانەوە بە بازاڕی جیهانی و وایان لێهات هەست بە هەموو ئاڵوگۆڕ و شێوازەکانی فریودانی بازاڕ بکەن؛ چونکە ئەو سەرۆکهۆزە کە پێشتر نە هەلی بۆ ڕەخسابوو و نە ئارەزووی دەکرد پیاوانی هۆز برووتێنێتەوە، لەم دۆخە تازەیەدا وەک خاوەنتاپۆ و بەکرێدەر، وای لێهات بە شێوەیەکی تازە برواننێتە ئەوان و بە سەرچاوەی قازانجیان دابنێ. جووتیاری خێڵەکیش وای لێهات لە جەنگاوەرێکی خێڵەکی زیاتر بەهای هەبێ. جووتیار خۆشبەخت بوو کە لە ڕووی قانوونییەوە نەبەسترابووەوە بە زەوی، چونکە ئەگەر ئاسوودە نەبووایە، بۆ کارکردن دەچووە لای سەرۆکهۆزێکیتر،[٥١] یا موڵکدارێکیتری زەوی لە بەسرە، کە لە زەوییە کشتوکاڵییەکەیدا نیشتەجێنەبووبێ؛ یا بە دووی کارێکدا دەگەڕا لە شاری تازەی عەمارە (ساڵی ١٨٦١ دامەزرێندراوە)، یا هەر شاری بەسرە خۆی. بەم شێوەیە دیاردەیەکی پێشتر نامۆ کەوتە ڕوو، کە ململانێی سەرۆکهۆزە گەورەکان بوو لەسەر جووتیاران. ئەمەیش کێشایەوە بۆ تێکەڵبوونی هۆزەکان و هەلێکی زیاتری ڕەخساند تا سەرۆکهۆزێک پەیدابێ شوێنکەوتەکانی لە هۆزەکانیتر بن. هەروەها ئیتر دەگونجا تاکەتاکەی پیاوی هۆز، بەتایبەت لە لیوای بەسرە، بەشەبەرهەمی خۆی بفرۆشێ و پێویستییە بنچینەییەکانی لە بازاڕی ناوخۆ بکڕێ؛ لە کاتێکدا لە ڕابوردوودا نەیدەتوانی، لە ڕێگەی سەرۆکهۆزەوە نەبێ، ساقی و باقی بە بەروبوومەکەیەوە بکا. دەمڕاست (گڵێت)یش، مادامێکی چیتر مافی نەبوو سەربەسەر گۆڕینەوە یا فرۆشتنی بەرهەمیان قۆرخبکا، باڵادەستیی ئابووریی بەسەر ئەندامانی خێڵەکەیەوە نەما؛ ئەم گۆڕانکارییەیش کارێکی زۆری کردە سەر جێوڕێیە کۆمەڵایەتییەکەی.[٥٢] کاتێکیش ئینگلیزەکان ساڵی ١٩١٤ بەسرەیان داگیرکرد، ئەم پەرەسانە زۆر خێراتربوون. ئەوان لە دووئاوانی دیجلە و فورات و درێژیی شەتاوی عەرەبدا لە باکووری بەسرە، هیچ هۆزێکیان نەدیبوو، بەڵکوو

[٥١] بۆ نموونە، بڕوانە: Reports of Administration for 1918, I, P. 313.

[٥٢] سەرچاوە: دەستنووسی بڵاونەکراوەی: معلومات عن ريف العمارة، ص٦-٧.

تێکەڵەیەکی چەند لقێکی هۆزایەتییان دیبوو؛ زەویی تاپۆکراویان هەبوو، یا زەویی موڵکی پوخت (صرف) ئەو موڵکدارانەیان بەدەستەوەبوو. کە خۆیان لەسەری نەبوون، وەک ئەندامانی هۆزی سەعدوون؛ یان لە بنەماڵە ناوبەدەرەوەکانی بەسرە بوون و سەرۆکهۆزەکانیان لە شەرەفێکی بەناو زیاتر، هیچ شتێکیان لە ئاستیاندا نەبوو.[53] لەبەرئەوە پێوەندیی ناوچەیی لەم لیوایە و ناوچەکانی دەوروبەری شاران و قەزایاندا، لە پێوەندیی هۆزایەتی بەهێزتر بوو.*

ئەنجامگیری:

تورکەکان، سیستەمێکی هۆزایەتیی روو لە بێهێزی و هەڵوەشانەوەیان، لە ناوچەی شەتاوی عەرەب و ناوچەکانی دەوروبەری شار و قەزاکان، لەپاش خۆیان بەجێهێشت. گلۆڵەی دەسترۆیی سیاسی و سەربازیی سەرۆکهۆز، بە ڕوونی ڕووی لە لێژی کرد. ئەوە بوو دەستەبەندییە سەربازییەکان لێکبڵاوبوون و کۆمەڵە هۆز و خێڵێکی ناکۆک جێیانگرتنەوە. هەر لە ویلایەتی بەغدا خۆی، کە یەکێک لە سێ ویلایەتەکەی عیراقی پێکدەهێنا، ساڵی ١٩١٨ نزیکەی ١١٠ هۆزی سەربەخۆ هەبوو، لە ١١٨٦ خێڵ پێکهاتبوو.[54]

گەلێک لەم خێڵانە –لە ڕاستیدا– لە دەسەڵاتی هۆزی سەرەکی ڕزگاربووبوون. لە لایەکیترەوە، بناغەیەک بۆ گەشەکردنی ئابووریی سەرۆکهۆز دانرا، لە ڕێگەی تێکشکاندنی سیستەمی موڵکایەتیی هاوبەشی هۆزەوە لە زۆری ناوچەکاندا و بەخشین یا بەکرێدانی ئەو ڕووبەرە فراوانانەیش کە ئەم هۆزانەی لەسەریان دەژیان، بە سەرۆکهۆز، بەبێ هیچ ڕەچاوکردنێکی مافی جووتیار. شامییە، تاکە ناوچەی

---

[53] Arab Bureau, Tribes Round the Junction, ... pp. 1-3.

* دکتۆر عەلی وەردی، لە باسی دابەشکردنی تەرزە هۆزایەتییەکانی عیراق و ڕادەی هێز و پابەندبوونیاندا بە بەهاکانی ژیانی دەشتەکێتییەوە، ئاماژەی بۆ بێهێزیی پێوەندیی هۆزایەتی کردووە. ئەو تەرزانەی دابەشکردووە بەسەر چوار تەرزی بنچینەییدا: دەشتەکێتی، لەوپەڕی باکووری ڕۆژئاوا کە پێی دەگوترێ جەزیرە؛ دێهاتی، کە لە بان (هضبة)ەوە تا لێواری هۆرەکان درێژدەبێتەوە؛ ئەمجا ناوچەی هۆرەکان خۆی و دواجاریش بەسرە کە یەکگرتنی هۆزایەتی و بەهای دەشتەکێتیی تێدا زۆر بێهێزدەبن. بڕوانە: علي الوردي، دراسة في طبيعة المجتمع العراقي، ص١٢٦. (و.ع)

[54] ئەم ژمارە وەرگیراوانەی ئاماری هۆز و خێڵەکان، لەم سەرچاوەیەدا هاتوون:
Arab bureau, Arab Tribes of the Baghdad Wilayat.

لەم دۆخە بەدەر بوو، کە سیستەمی جووتیاری موڵکداری زەویی تێدا لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا دەرکەوت.

ئەم هێزە ئابوورییە تازەیەی سەرۆکهۆز، لە ناوەڕۆکی خۆی هەڕەشە بوو بۆ بوونی مێژوویی خۆی، چونکە دووری‌دەخستەوە لە سەرچاوەی ڕاستەقینەی هێزی خۆی، کە هۆزەکەی بوو. ئیدی پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان جێی پێوەندییەکانی خوێن و سیستەمی باوکسالارییان گرتنەوە و ئەوە دواجار بوو بە هۆی تێکدانی جێوڕێی سەرۆکهۆز.

# باسی پێنجەم

## شار و سەرۆکهۆزانی تازە ۱۹۱۷-۱۹۵۸.

## پەرەسەی پێچەوانە

ئەگەر بڕوانینە ڕابوردووی دوور، مێژووی سەرۆکهۆزان دەریدەخا کە هێزی سەرۆکهۆز لەگەڵ بێهێزیی شار ڕاستەوانە دێتەوە؛ تا هێزی شار زیادبکا، جێپێی سەرۆکهۆز لەقدەبێ. بەغدایش تا بێهێز و دەستەپاچە و تۆڕەکانی ڕووبارەکان وێران و گواستنەوە بە پشتی ئاژاڵ یا بە بەلەمی بەگوریسڕاکێشراو و بازرگانی سست و نووچداو و چینی ناوەڕاست مردوو بووایە، لەم جۆرە هەلومەرجانەدا سەرۆکهۆز دەبووژایەوە و لەوەرگەکانی پەلیاندەهاوێشت و داب و نەریت و ئاژاوەگێرییەکەی زیاتردەبوون. بەڵام یەکەم بزاوتی بەغدا و جەربەزەیی و زەبری هێندێ والی و زیادبوونی ژمارەی کەشتییەکانی هەڵمین کە ناوبەناو دەکەوتنە ناو ڕووبارەکان و کەمەکێک هێڵی تەلگراف و ژیانەوەی سنووورداری بازرگانی، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، دەستەبەری لەدەستدانی هاوسەنگیی سەرۆکهۆزیان کرد و لە بەشێکی ئەو ناوچانەدا کە مرۆڤ بە ئاسانی دەیانگاتێ، هاوبەشییان لە پارچەپارچەکردن و تێکشکاندنی قەوارەی هۆزدا کرد. وێڕای ئەوە، کە دەکەوینە باسی ماوەی جێگەی باسی نێوان ۱۹۱۷-۱۹۵۸، دیاردەیەکی نائاساییمان ڕووبەڕوودەبێتەوە، ئەویش هەبوونی شارێکی پڕ لە هاتوهاواری چینێکی ناوەندیی گورجوگۆڵی ڕوو لە گەشەکردن و پێخوێندنێکی نوێیە، هەرچەندە هێشتا بە ناوەڕۆک بێداروبارە، بەڵام بە سۆنگەی بڵاوبوونەوەی ڕێگەوبانی قیرتاوکراو و هێڵی ئاسن و زیادبوونی جموجووڵی فڕۆکەکان لە ناوچەکانی وڵاتدا و بازرگانییەکی هەڵبەزودابەزکەری ڕوو لە چالاکییەوە، خەریکە پەلدەهاوێ. پێبەپێی هەموو ئەوانە، چینێکی تازەی نیمچەدەرەبەگیش پەیدابووە، سەرۆکهۆزی سالانێکی لەمەوبەر بێهێز ڕێبەریی‌دەکا و ئێستە بووەتە موڵکداری زەوی و بەرهەمهێنی بەروبوومەکانی

بازاڕ و سەرگەورەی ڕەهای کشتوکاڵ و جووتیارانیش بوونەتە شێوە زەویبەندەیەک.*

بە واتایەکیتر، ئەگەر پەرەسەندنی شار و سەرهەڵدانی حکوومەتی ناوەندی و گەشەکردنی بازرگانی و گەیاندن، بە حوکمی سروشتی شتەکان، هەر دەبێ بووبنە مایەی خێراتر ڕووخاندنی سەرۆکهۆز، لە کاتێکدا لە ئەوروپا کێشایانەوە بۆ داڕووخانی سیستەمی دەرەبەگی Manorial System، بەڵام لێرە بوونە هۆی بووژاندنەوەی سیستەمی بازرگانیی نیمچەدەرەبەگیی سەرۆکهۆزەکان. مەسەلەی شایانی سەرنجدان لەم پەرەسە نائاساییەدا، ئەوەیە کە لە گەوهەری خۆیدا پێچەوانەی بزاوتی مێژووە. بەر لە پێشکەشکردنی هەر ڕوونکردنەوەیەک، پێویستە هێندێ جیاوازی و خاڵ ڕوونبکەینەوە و بیانخەینە بەرچاو.

**جیاوازیی سەرۆکهۆزەکان:**

کۆمەڵێک سەرۆکهۆز لە زەوییە دەشتاییەکانی عیراق و کۆمەڵێکیتریش لە زەوییە شاخاوییەکاندا هەن. لەم لێکۆڵینەوەیەدا، لەم سەرۆکهۆزانەی دوایی نادوێین کە ناویان ئاغایە و کوردن. دەبێ سەرۆکهۆزانی عەرەب و سەرۆکهۆزانی کورد کە لە شانۆی سیاسیی مێژووی نوێی عیراقدا دەرکەوتن، وەک شێخ مەحموود بەرزنجی** و ئەحمەدئاغای بارزانی،*** لێک جویبکەینەوە. ئەم دوو سەرۆکهۆزە

---

* زەویبەندە (القن): کۆیلەی سەر زەویی گەورەپیاوێکی دەرەبەگە و خاوەنایەتییەکەی لەم سەرگەورەیەوە دەچێتە چنگی سەرگەورەیەکیتر، کە ڕەنگە مولکایەتیی ئەو زەوییەی بۆ بگەڕێتەوە. ئەم سیستەمە لە ئەوروپا پەیدابوو و تا سەدەی نۆزدەیەم لە هێندێ ناوچەیدا کاری پێکرا. زەویبەندە، بە ئازادکردن یا کڕینی ئازادی بە پارە یا خزمەتی سەربازی یان مردن نەبێ، ئازادیی خۆی بەدەستناهێنێ. (و.ع)

** شێخ مەحموود بەرزنجی (حەفید)، ساڵی ١٨٨١ لە سلێمانی لەدایکبووە. پێشەوایەکی سیاسیی کوردە لە باکووری عیراق ژیاوە. ساڵی ١٩١٩ سەربەخۆیی ویلایەتی مووسڵی لە سایەی بەڕێوەبردنەکەی خۆیدا ڕاگەیاند، پاشتر لە لایەن ئینگلیزەوە ڕووخێندرا. خۆی بە پادشای کوردستان ناساند و دەستگیرکرا. دوورخرایەوە بۆ ڕومادی، پاشان گەڕایەوە بۆ سلێمانی. ساڵی ١٩٥٦ سەرینایەوە. بڕوانە: عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد والنفوذ البريطاني في كردستان، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠٥. (و.ع)

*** ئەحمەدئاغای بارزانی، برای مستەفا بارزانییە و شێخێکی ناسراوی بارزانە. پاش لەسێدارەدانی عەبدوسەلامی برای بە دەستی دەستەڵاتدارانی عوسمانی ساڵی ١٩١٤ لە مووسڵ، لەبەر داواکردنی

جڵەوی سەرکردایەتیی سیاسی و ئایینیی هۆزەکانی خۆیان بەدەستەوە گرتووە. بۆ نموونە، شێخ مەحموود بە سەرگەورەی سەرۆکانی هۆزەکانی سلێمانی و گەورەترین موڵکداری زەوی دادەنرێ، هاوکات شوێنکەوتەکانی بەوپەڕی پیرۆزیی دینییەوە لێی دەڕوانن.[55] وێدەچێ بنەماڵەکەی، بەهۆی جێوڕێ و کاریگەرییە دینییەکەیەوە، دەسەڵاتی هۆزایەتیی گرتبێتە دەست و سامانێکی زۆری ماددیی پێکەوەنابێ، لە کاتێکدا باوکی شێخ مەحموود بە وەلییەکی بۆخوداسوڵحاو دادەنرا لە سلێمانی. بە هەمان شێوە، جێوڕێی هۆزایەتیی شێخ ئەحمەد بارزانی دەگەڕێتەوە بۆ شان‌وشکۆ و پلەوپایە دینییەکەی باوکی.[٥٦]

هەرچی سەرۆکایەتیی هۆزی عەرەبییە، هیچ پێوەندییەکی دینیی تێدانییە. بەڵام لە باشووری عەرەبنشیندا، بەتایبەت قەزای شامییە، کە نزیکی هەردوو شاری پیرۆزی نەجەف و کەربەلایە، چینێکی خێڵەکیی ساداتی لێیە، دەشێ حاڵوباریان تا ڕادەیێک لەگەڵ حاڵوباری سەرۆکهۆزانی کورد بەراوردبکرێ.* ڕاستییەکەی ئەم چینە هۆزی تایبەت بە خۆی نییە، چونکە جووتیارەکانیان سەر بە چەندین هۆزن.[٥٧] ئەوانە لافیان لێداوە کە لە نەوەی پێغەمبەرن، لە ئەنجامدا توانیویانە دەسەڵاتێک لە ناوەندی دینداراندا بەدەستبێنن و دەستڕۆبن. بەڵام ئەم دەستڕۆییە ناگاتە ئاستی ئەو

---

بەردەوامی مافەکانی کورد، جڵەوی شێخایەتیی گرتە دەست. بیر و بۆچوونێکی دینیی چاکسازیخوازی کراوەی هەبوو. ئیسلامییەکان لەسەر ئەوە ڕەخنەیان لێگرت. لەبەرئەوە گۆشەگیر کەوت و مەلا مستەفا بارزانیی برای بەرپرسیی لەئەستۆگرت. بڕوانە: حسن مصطفى، جركة بارزان، در الطليعة، بيروت، (د.ت). (و.ع) [ئەم زاتە ئاغا نەبووە و بە شێخ ناسراوە، ئەو پایەیەی لە شێخایەتیی نەقشبەندییەوە بۆ ماوەتەوە. (و.ک)]

[55] Office of the civil Commission, (Secret) Personalities in Kurdistan (Beghdad: Government Press 1919, 42; and Personalities –Mosul, Arbil, Kirkuk, and Sulaimaniya, 1922-1923, p. 57.

(ئەو نوسخەیە کە من دیومە، هیی مێجەر جەی. ئێف. ویلکنسە، ژمارەیەکی زۆر ڕاستکردنەوەی بەسەرەوەیە، دوایین مێژووی ١٩٤٤ە.)

[56] Office of Civil commissioner, Personalities in Kurdistan, P. 4; and Personalities -Mosul, Arbil, etc, p12.

* ڕاستی لە بنەماڵەکانی ناسناو شێخ بەدەر، کە یا دەسەڵاتەکانی دنیایی و دینی یان هەر دینییان هەیە، بنەماڵە ئاغا و بەگ و موڵکدارە گەورەکانیتر کە شێخ نین، دەسەڵاتی دینییان نییە. ئەمە بەشێکی زۆری خێڵ و هۆزەکانی کوردەواریی وەک جاف و بڵباس و هەمەوەند و ... دەگرێتەوە. (و.ک)

[57] Reports of Administration for 1918, p.66.

دەسەڵات و دەستڕۆیییە کە سەرۆکهۆزانی کورد هەیانن. ڕەنگە موحسین ئەبوتمەن، لە ساڵانی بیست و سیی سەدەی بیستەمدا لە هەموو ئەو سەیدانە زیاتر دەستڕۆ و کاریگەرتر بووبێ؛* لەگەڵ جەعفەری برای ڕووبەرێکی پان و بەرینی زەوی‌وزاریان لە ناحیەی غەماسی شامییە و سەماوە و سەر شەتاوی عەرەب هەیە. دوو کەسێتیی‌تری دەستڕۆ، بەڵام خاوەن‌زەویی دەرەبەگیی بچووکتر، نوور سەید عەزیز یاسری** و عەلوان سەید عەباسە،*** هەردووکیان لە شامییە و عەرەبی شیعەن.[58] بەڵام سەرۆکهۆزانی ناوچە دەشتاییەکان، یا سەرۆکانی هۆزە جێگیرەکانی سەر کەناری چەم و ڕووبارەکانن، یا سەرۆکهۆزی دەشتەکی، یان نیمچەدەشتەکی. هۆزە دەشتەکییەکانیش بریتین لە سەرۆکهۆزانی زەفیر (ضفیر) و عەنزە و شەمەر جەربە (بڕوانە: هێڵکێشی ژمارە ٢). ئەمەی دوایی لەم ئاخروئۆخریەدا ڕووی لە جێگیربوون کرد و زەوی‌وزارێکی فراوانی لە شنگاری ویلایەتی مووسڵ پێ‌بەخشرا.

دەکرێ سەرۆکانی هۆزە جێگیرەکانی سەر کەناری چەم و ڕووبارەکان دابەش‌بکەین بە دوو تاقم: تاقمی یەکەم لەو سەرۆکهۆزە گەورانە پێکدێ کە زەوی‌وزارێکی یەکجار بەرینیان هەیە و بە زۆری لە قەراغی ڕووباری دیجلە، باشووری بەغدا و لیواکانی کووت و عەمارە و سەر قەراغی چەمی غەڕافی

---

* موحسین ئەبوتمەن و جەعفەری برای: لە ناودارانی خێزانی ناسراوی ئەبوتمەنن کە دەچنەوە سەر هۆزی ڕەبیعە، بەشدارییان لە جووڵانەوەی جیهادی ساڵی ١٩١٤ و شۆڕشی بیستدا هەبوو و محەمەد جەعفەر ئەبوتمەن بە ڕابەری جووڵانەوەی نیشتیمانیی عیراق دانراوە. (و.ع)

** نوور یاسری، لە ناودارانی سیاسیی ناوبەدەرەوەی عیراقە. ساڵی ١٨٣٤ لە میشخاب لەدایکبووە و ١٩٣٧ مردووە. نەخشێکی بەرچاو و گەورەی لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ی عیراقدا هەبوو. پەنای بردە بەر حیجاز و ساڵی ١٩٢١ لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ گەڕایەوە بۆ عیراق. (و.ع)

*** عەلوان یاسری، ساڵی ١٨٦٩ لە میشخاب لەدایکبووە. ئەویش دەورێکی گەورەی لە شۆڕشی ١٩٢٠ی عیراقدا هەبوو. پاش سەرنەگرتنی، پەنای بردە بەر حیجاز و ساڵی ١٩٢١ لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ گەڕایەوە بۆ عیراق. (و.ع)

[58] شیعە و سوننە: دوو تاقمی سەرەکیی ئیسلامن. دەشێ جیاوازیی بنچینەییی نێوانیان لەوەدا کورت‌بکەینەوە کە سوننە پێڕەویی تەفسیرەکانی شەریعەتی ئیسلام دەکەن، وەک چۆن یەکەمین زانایانی موسوڵمانی لە وێنەی ئیبن‌حەنبەل، شافیعی و ئەبوحەنیفە و مالیک دایانناون؛ بەڵام شیعە پێڕەویی تەفسیرەکانی ئیمامەکانی نەوەی عەلیی خەلیفەی چوارەمی ئیسلام و ئامۆزای محەمەدی پێغەمبەر و مێردی کچەکەی دەکەن، سەرباری تەفسیرەکانی موجتەهیدانی ئێستەیان. بەوپێیە، موجتەهیدان زۆر دەستیان بەسەر پێڕەوانیاندا دەڕوا، کە لە دەستڕۆییی زانایانی سوننە لە کاروباری دینییاندا زیاترە.

لقێکی دیجله له لیوای مونتەفیق و سەر کەناری چەمی حلله له ناوچەی فوراتی ناوەڕاست و له لیوای دیوانییه هەن و دەبینرێن. گرنگترینیان:




نەخشەی ٢
دابەشبوونی هۆزە هەرە گرنگە ناوبراوەکانی ناو ئەم کتێبه،
له ناوچەی ئاودێریی باشوور

١. له کەناری دیجله: سەرۆکهۆزی بەنیڕەبیعە، محەمەد ئەمیره* و بە میری ڕەبیعە ناودەبرێ. له بەنیلامیش، هەردوو ماڵی عەڕار و جەندەل و له ئەلبومحەمەد، ماڵەکانی خەلیفه، وادی، یاسر و سەیهوود.

* محەمەد ئەمیر (محمد الأمیر)، ئەوە محەمەد حەبیبی میری خێڵاتی ڕەبیعەیه له عیراق. ساڵی ١٨٩٢ لەدایکبووە و ١٩٧٠ مردووە، له گەورەترین موڵکدارانی زەوییه له عیراق. (و.ع)

٢. له کەناری چەمی غەڕاف، سەرۆکهۆزانی مەییاحی لقێکی بەنیڕەبیعە: عەبدوڵا و بەلاسم یاسین* و سەرۆکهۆزی حومەیید: مووحان خەیروڵا.**

٣. سەرۆکانی هۆزە جێگیرەکانی سەر کەناری شەتاوی حلله له ناوچەی فوراتی ناوەڕاست، ئەوانە سەرۆکهۆزانی ئەلبوسوڵتان*** (بێت جریان- بیت الجریان) و سەرۆکهۆزی بەنیزێرج (خەوام عەبد عەباس)ن.****

تاقمی دووەم لە سەرۆکانی هۆزە جێگیرەکانی گوێ چەم و ڕووبارەکان، سەرۆکهۆزی تا ڕادەیەک بچووکن، واتە ئەو سەرۆکهۆزانەن کە خاوەنی چەند مەڵبەندێکی ڕووبەر بچووکترن. گرنگترینیشیان لە ڕووی مێژوویییەوە، سەرۆکهۆزانی فوراتی نزیک و شەتاوی شامیە و هیندییەن لە فوراتی ناوەڕاست و بەتایبەت سەرۆکهۆزی فەتلە (الفتلة)، عەبدولواحید سوکەر.***** بەڵام سەرۆکهۆزە عەرەبە سوننەکانی فوراتی سەروو و و باکووری دیجلە، تا ڕادەیێک بایەخیان کەمترە و مێژوویەکی وایان نییە باس‌بکرێ؛ شێخ عەلی سولەیمانی شێخی ئەلبوڕدێنی نەبێ، کە یەکێکە لە خێڵەکانی دلێم و لە قۆناغی سەرهەڵوێستی «ئینتیداب»دا پشتیوانێکی بەردەوامی سیاسەتی بریتانیا بووە. یەکەم شت کە دەشێ لە کاتی

---

* عەبدوڵا محەمەد یاسین (عبدالله محمد الياسين)، ساڵی ١٨٩٥ له شاری حەی لەدایکبووە و ١٩٦٩ مردووە. یەکێک له گەورەترین سەرۆکانی خێڵاتی مەییاح و لەگەڵ شێخ بەلاسم ئەلیاسینی برای، کە ١٩٠٢ له شاری حەی لەدایکبووە و ساڵی ١٩٦٩ مردووە، له گەورەترین مولکدارانی زەوین. (و.ع)

** مووحان خەیروڵا مووحان الخيرالله)، سەرۆکهۆزی شوێلات و حومەیید (الحميد)ە، کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم لەدایکبووە و ١٩٥٦ مردووە. چەند جارێک بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق هەڵبژێردراوە و له گەورەترین مولکدارانی زەویی کشتوکاڵییە له عیراق. (و.ع)

*** ئەلبوسوڵتان (البوسلطان)، یەکێکە له هەرە بەناوبانگترین هۆزەکانی زوبێدی. ئەم ناوەیان له سوڵتانی باپیریانەوە کە پێش شەش‌سەد ساڵ هاتووەتە عیراق و له فوراتی ناوەڕاست گیرساوەتەوە، لێنراوە. گرنگترین مالیان، ماڵی هومەیس (الهميص) و بێت جریان (بیت الجريان)ە. (و.ع)

**** خەوام عەبد عەباس (خوام العبد العباس)، له سەرۆکهۆزانی بەنیزێرجە له سەماوە. دەورێکی گەورەی له شۆڕشی ١٩٢٠ی عیراقدا گێڕاوە. پاشتر لەگەڵ ئینگلیز کەوتە دان‌وستان بۆ براندنەوەی شەڕوشۆڕ. (و.ع)

***** عەبدولواحید سوکەر: ساڵی ١٨٨٠ هاتووەتە دنیاوە و ١٩٥٦ مردووە. یەکێک بووە له سەرۆکهۆزە گرنگەکانی ئالفەتلە. دەورێکی بنچینەیی و گەورەی له مێژووی هاوچەرخی عیراقدا هەبووە؛ گرنگترینیان، بەشداریی بووە له شۆڕشی ١٩٢٠ی عیراق و ڕووداوە خێڵەکییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٣٥-١٩٣٦ی فوراتی ناوەڕاستدا. (و.ع)

بەراوردکردنی سەرۆکهۆزانی گەورە و بچووکی جێگیری سەر کەنارەکانی چەم و ڕووبارەکان‌دا سەرنجمان ڕابکێشێ، دەرکەوتنی سەرۆکهۆزانی گەورەیە لەو ناوچانەدا کە تازە ساز و لەبار کراون بۆ کشتوکاڵ. بەنداوی کووت کە ساڵانی ١٩٣٧-١٩٣٩ بنیات‌نرا، بووە دەستەبەری ئاودێریی ناوچەی غەڕاف، کە سەرۆکهۆزە گەورەکان چەند مەڵبەندێکی فراوانیان تێدا هەبوو. بە هەمان شێوە، ئەو سەرۆکهۆزانە لە ناوچەی شەتاوی حلە بوونە خاوەنی زەوی‌وزارێکی فراوان، پاش ئەوەی بە دروستکردنی بەنداوی هیندیە لە ١٩١١-١٩١٣دا و نوێکردنەوەی لە ١٩٢١-١٩٢٥دا، کرانە زەویی لەبار بۆ کشتوکاڵ. یەکێک لە هۆیەکانی فراوانبوونی مەڵبەندەکانی موڵکی ئەو سەرۆکهۆزانە، چڕیی کەمتری دانیشتووانی کەنارەکانی دیجلەیە لەچاو ئەوانەی گوێ هەردوو شەتاوی هیندیە و شامییەدا. مەڵامەتی زیادبوونی چڕیی دانیشتووانیش لەو ناوچانەی دوایی‌دا، ئەوەیە کە ئاودێری لە ڕووباری فوراتەوە، بە هۆی لێژیی ڕووی خاکەکەیەوە، لە هی ڕووباری دیجلە ئاسانترە. ساڵی ١٩٤٧ چڕیی دانیشتووان لە ناوچەکانی هەرە قەرەباڵغی سەر شەتاوی هیندیە، گەیشتە ١٠١ لە یەک کیلۆمەتری چوارگۆشەدا و لەسەر شەتاوی شامییەیش گەیشتە ١٠٤، لە کاتێک‌دا لە قەرەباڵغترین ناوچەکانی کووت و غەڕاف خۆی دا لە ٢٢ و هەژدە کەسیش لە یەک کیلۆمەتری چوارگۆشەدا.*

لایەنێکی بایەخی مێژوویی سەرۆکهۆزانی گەورەی دیجلە و غەڕاف، بێ‌دەنگیی سیاسییانە لە ماوەی نێوان ١٩١٧-١٩٥٨دا.** ئەوانە لە پشتیوانانی سیاسەتی بریتانیا

---

* ڕووباری دیجلە بەوە ناسراوە کە گەلێک بارگۆڕ و تیژڕۆیە و لافاوی زۆرە، تەنانەت ناوی تیری لێ‌نراوە. ئەم مەسەلەیە کارێکی کردووە دانیشتووانەکەی سەرقاڵی دۆزینەوەی ڕێگەکانی بەرپەرچدانەوەی مەترسییەکانی بن. ئەوەیش هەر بە ملکەچی و هاوکاریی دەوڵەت دەبێ. لە کاتێک‌دا ڕووباری فورات بە هێمنی و هێواشیی ناسراوە و ئەم مەسەلەیەیش وای لە دانیشتووانی کردووە پێویستییەکی ناچارییان بە دەوڵەت نەبێ و هەمیشە لێی هەڵگەڕێنەوە. هەروەها هۆی بنچینەیی چڕیی دانیشتووانیش لەم بەشەدا، ئاسانیی دامەزراندنی جۆگەکانی ئاودێری و کەمیی لێژییەکەی و بڕی گونجاوی ئەو قوڕ و لیتە نیشتووەیە کە ساڵانە لەچاو ڕووباری دیجلەدا هەڵیدەگرێ. بۆ وردەکاری بڕوانە: شاكر شاهين، العقل في المجتمع العراقي، التنوير للطباعة والنشر، بيروت، ٢٠١٠، ص٢٣٤. (و.ع)

** سالم خەیوونی سەرۆکهۆزی خێلاتی بەنی‌ئەسەد، لە ساڵانی بیستی سەدەی ڕابردوودا، ڕاپەڕینێکی دژی حکوومەتی عیراق بەرپاکرد. بەوە کۆتایی پێ‌هات کە میوانخانەکەی

بوون لە سەروبەند و پاش ساڵانی داگیرکاریی عیراق لە لایەن بریتانیاوە و بەشدارییان‌نەکرد لە ڕاپەڕینی ١٩٢٠، یا ئەو جووڵانەوەیەدا کە پاشتر دژی ئینتیداب ڕێکخرا. هەروەها هیچ بەشدارییەکیان لە یاخیبوونی خێڵەکیی ١٩٣٥-١٩٣٧دا نەبوو. بە پێچەوانەی سەرۆک‌هۆزە بچووکەکانی فوراتی ناوەڕاست و فوراتی نزیکەوە، کە بڕبڕەی پشتی جووڵانەوەی بەرهەڵستیی ئینگلیزەکان و هەموو ئاژاوەنانەوەیەکی ساڵانی سی بوون؛ هێندێ سەرۆک‌هۆزی گەورەی شەتاوی حللەیش، شان‌بەشانی سەرۆک‌هۆزانی بچووک، بەشدارییان لەم ڕووداوانەدا کرد. بەڵام سەبارەت بە ڕاپەڕینی ١٩٢٠، سێر ئەرنۆڵد ویلسۆنی کۆمیسێری مەدەنیی ئەو کاتەی بریتانیا،[59] جەخت‌دەکاتەوە کە ئەو سەرۆک‌هۆزانە «لەبریی ئەوەی گوێ لە سەرکردایەتییان بگرن، گوێیان لە شوێنکەوتەکانیان دەگرت.» هۆی ئەوە، کاریگەریی زانایانی ئایینیی شیعەیە لە هەردوو شاری -بە لای پیاوانی هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست و خوارووەوە- پیرۆزی نەجەف و کەربەلا. لەبەرئەوە ئەو سەرۆک‌هۆزانە، بە چاوپۆشین لە جێ‌ورێیان، ناتوانن فەتوا و ڕاسپاردەی ئەو زانایانە پشت‌گوێ‌بخەن، لە کاتێکدا سەرۆک‌هۆزانی دیجلە و غەڕاف بەدەگمەن بەپیر فەتواکانی ئەو زانایانەوە دەچن.

مۆرکێکی هاوبەشی نێوان زۆربەی سەرۆک‌هۆزانی بچووکی شامیە و هیندیە و سەرۆک‌هۆزانی گەورەی ئەلبومحەمەدی سەر کەنارەکانی دیجلە، مەرەزەکردن و دەسەڵاتی ملهوڕانەیانەیە بەسەر جووتیارانەوە. لەوانەیە هۆی ئەم توندڕۆییە ئەوە بێ کە ژیان لەوێ سەختە و مەرەزەکردن پێویستی بە کاری ڕێکخراو و مشوورخۆریی هەمیشەییە. کاتێک لەگەڵ جووتیارانی بەرهەمهێنی گەنم و جۆ بەراوردەکرێن، ئەوان وا دەردەکەون کە زیاتر ئازاد و سەربەخۆ بن.

خاڵی هاوبەشی نێوان سەرۆک‌هۆزانی گەورەی غەڕاف و سەرۆک‌هۆزانی بچووکی فوراتی خواروو، ئەوەیە کە بەشێکی گەورەی ئەو زەوییانەی وا ڕەنێویان‌دێنن، بە تاپۆ موڵکی بنەماڵەی سەعدوونن، کە نیشتەجێی شوێنێکی‌ترن و ئەوەیان لە زەمانی تورکانەوە بە میرات بۆ ماوەتەوە. حکوومەتی ئەو سەردەمە ئەو

---

بۆردوومان‌کرا و خۆیشی گیرا و دوورخرایەوە بۆ مووسڵ، پاشان گەڕایەوە بۆ بەغدا و ساڵی ١٩٥٤ لەوێ مرد. (و.ع)

[59] Sir Arnold T. Wilson, Loyalties, Mesopotamia, 1914-1917, (London, Humphery Milford: Oxford University Press, 1930) p. 311.

سەرۆکهۆزانەی ناچارکرد لەو زەوییانە کە بەکرێیانگرتبوون، بەشەبەرهەمی بنەماڵەی سەعدوون بدەن.[٦٠] پاشان ئەمە بەرەبەرە وای لێهات نەبێ بە بار بەسەر سەرۆکهۆزانی گەورەی غەڕافەوە، چونکە بوونە خاوەنی چەندین ڕووبەری فراوانی زەوی بە ناوی خۆیانەوە و دەستدرێژییان کردە سەر زەوییەکانی حکوومەت، بەبێ ئەوەی هیچ پەڵپێکیان پێبگیرێ.*

خاڵێکی شایانی بایەخپێدان، ئەوەیە کە سەرۆکهۆزانی شامییە و هیندییە لە سەرۆکهۆزانی لیواکانی دیجلە زیاتر دەزانن بخوێننەوە و بنووسن. ڕەنگە هۆیەکەی ئەوەبێ کە ئەوانە نزیکی شاری پیرۆزی نەجەف بوون، کە لە ڕۆژگارێکی دوورەوە ناوەندی پێخوێندنی شیعەخوازی بووە و -لایەنی کەم- یەکێک لە سەرۆکهۆزانی شامییە کتێبێکی داناوە،[٦١] کە -بە لای سەرۆکهۆزەوە- دەسکەوتێکی هەڵاواردەیە.

## بنیاتی سیستەمی حوکمی سەرۆکهۆز

سەرۆکهۆز لە لوتکەی هەرەمەکەدا دادەنیشێ؛ لە بەشەزەوییەکانی خۆیدا، جڵەوی دەسەڵاتەکانی بەڕێوەبردن و دادوەری و بەجێهێنانی بەسەر پیاوانی هۆزەکەیەوە بەدەستەوە گرتووە. لە ڕاستیدا، ئەو خۆیشی خاوەنزەوییەکەیە.

---

[٦٠] بەکرێگرتنەکە، لە سایەی داگیرکاریی ئینگلیزدا، سەرەتا ٢٠٪ی بەرهەم بوو، پاشان کەمکرایەوە بۆ ١٥٪ بڕوانە: Administrative Report of the Muntafik Division for 1919, p. 3.

پاشتریش کەمکرایەوە بۆ ٧.٥٪ بڕوانە: عبدالله الفیاض، مشکلة الأراضي في لواء المنتفك، بغداد، مطبعة سلمان الأعظمي، ١٩٥٦، ص‌ص٧٦-٧٨.

* سەروبەندی باڵادەستیی عوسمانی بەسەر عیراقەوە، زۆری سەرۆکهۆزانی غەڕاف و مونتەفیک ناچاربوون ببنە سەرکاری لای بنەماڵەی سەعدوون کە زەوییە کشتوکاڵییەکانیان بە ناوی خۆیانەوە تۆمارکردبوو. پاش دەرکردنی قانوونی پێسپاردنی زەوی بە تاپۆ لە سەردەمی والێتیی مەدحەتپاشادا و پاش دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عیراق ساڵی ١٩٢١، ئەو سەرۆکهۆزانە بوونە خاوەنی زەویوزارێکی وا کە زۆر لە موڵکەکانی پێشووی بنەماڵەی سەعدوون گەورەتربوو و لێیان هەڵگەڕانەوە و ڕازینەبوون بەشە موڵکانە بدەن. دەکرێ لەم بارەیەوە بە کتێبی "داهێنانی عیراق"ی ڕۆبی دۆجدا بچنەوە، کە یەکێکە لەو داتراوە بەهادارانەی وا بە وردی و لێکدانەوەوە دەستیبردووە بۆ ئەم دیاردەیە. (و.ع)

[٦١] ئەوە شێخ فەریق مزهر (الشیخ فریق المزهر)ە لە بنەماڵەی فەتلە و ناونیشانی کتێبەکەی ئەمەیە: الحقائق الناصعة في الثورة العراقیة، بغداد، ١٩٥٢.

ئەمە دەمانباتەوە بۆ هەڵسەنگاندنی قسەی سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیەمان؛ سەرۆکهۆز وا لە دەسەڵات تێدەگا کە دەبێ دابەشکراوبێ و ئەم وێنەیە تەنیا بەستە بە سەرتاسەری عێراق. بەڵام لە بەشەزەوییی تایبەتی خۆیدا، حەزدەکا لە چنگی خۆیدا کۆیبکاتەوە؛ وەک چۆن کابرای شۆڕشگێڕ ئارەزووی شتێکی وەهای لە ئاستی نیشتیمانیدا هەیە. زەوییەکانی مەڵبەندەکەیش، بە شێوەیەکی ئاسایی، بە ناویەوە تۆمارکراودەبن،[٦٢] لە زۆربەی حاڵوبارەکاندا خۆی بەڕێوەیاندەبا، سەرەڕای ئەوەی کە زیاتر دەیەوێ کاتێکی درێژتر لە بەغدا بەسەرببا. وەک قازییەکیش، بە ڕواڵەت، دادپەروەری بەپێی قانوونی هۆزایەتی جێبەجێدەکا. بەڵام لەبەرئەوەی -لە لایەکەوە- پێوەندییەکانی هۆزایەتی ڕوویان لە کزی بوو و پێوەندییەکانی ئابووری جێگەیان گرتبوونەوە، -لە لایەکیترەوە- قانوونیش لە بەرەوە ملکەچی ویستی بێبنەمای ئەو دەبوو، ئیدی زیاتر پشتی دەبەست بە گزیر (حۆشییە)،[٦٣] کە پۆلیسە جێگیرەکانی بوون. ئەم مەسەلەیە، لە ڕووی توندوتیژییەوە، لە هۆزێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ. ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز لە عەمارە، سەرەتای ١٩٢١ نووسیویە: «سەرۆکهۆزەکان پتر لە جارێک پێیانگوتووە: ئەمان دەبێ پیاوانی هۆزەکان هەستبکەن لێیان دەترسن، تا قانوون و نیزام بپارێزن، ناوبەناویش ئەم مامەڵە توندە بە هەندێ پاداشتدان سووکتردەکەن.»[٦٤] لە لیوای دیوانییەیش، لە ١٩٢٢دا نووسیویە: سەرۆکهۆزانی هەندێ ناوچە، لەبەر کێشرانەوەی دەسەڵاتی حکوومەتی بەغدا، لەوە کەوتبوون بتوانن ڕێزی خۆیان بەسەر پیاوانی هۆزەکەیاندا بسەپێنن.[٦٥] ئەم جۆرە دۆخە بەهایەکی زیاتری بە حۆشییە* بەخشی لای سەرۆکهۆزەکان و کەوتنە سەر

---

[٦٢] تاکە هەڵاواردنێک لەوەدا، زەوییەکانی مونتەفیکە کە بە ناوی سەرۆکهۆزانی سەعدوونەوە تۆمارکرابوون و لەوێیش نیشتەجێنەبوون.

[٦٣] ناونانی ئەم هێزە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکیتر جیاوازە، لە هێندێ ناوچە بە فەداوییە و لە هێندێکیتر بە ڕوشاکە یا سبیان (صبیان) ناسراوە.

[64] Administration Reports of Amarah for 1920-1921, p. 7.

[65] Office of the secretary of the High Commissions, (Secret) Intelligence, Report No. 19 of 10 October 1922, Para. 939.

* گزیر (حۆشییە): پاسەوانان و پارێزگارانی تایبەتی سەرۆکهۆزن، ئەرکیان سزادانی سەرپێچیکەران یا کەسانی خۆهەڵبواردووە لە دانی باج و بەشەبەرهەم، یان یاخیبووانن لە خێڵ. گزیر، هێندێ ئەرکی ژێربەژێریشی هەبوو، وەک: بۆ نموونە، غافلکوژی. حۆشییە لە

خولیای بەخشینی مۆرکی هێزی زۆردارەکی بەم دەزگایە، چونکە ئەرکی گزیر پارێزگاری و بەجێهێنانی ویستی سەرۆکهۆز و سەرپەرشتیی جووتیارەکانی و پاراستنی موڵکوماڵەکەیەتی. ژمارەی گزیری میری ڕەبیعە لە ١٩١٧دا گەیشتە ٢٥٠ سوار،[٦٦] لە چەند تیرەیەکی دیاریکراوی هۆزەکە (تیرەی جەللوخ و شەواویش) هەڵدەبژێردران. ژمارەی ئەندامانی هۆزەکە کە ملکەچی دەسەڵاتی بوون، خۆی دەدا لە ٢٢٠٠-٣٠٠٠ پیاو. ساڵی ١٩٤٤، ژمارەی گزیری محەمەد عرێبیی* سەرۆکهۆزی ئەلبومحەمەد دەگەیشتە ٥٥٢،[٦٧] ژمارەی پیاوانی هۆزەکەیشی دەگەیشتە کەمێک پتر لە ٥٠٠٠ پیاو. وا دیارە ژمارەی گزیری ناوچەکەی خۆی، -لایەنی کەم- یەک گزیر بووە بۆ هەموو دە پیاوێک. پلەبەندییەکیش لە ڕیزەکانی گزیردا هەیە؛ هەندێکیان لەوانیتر بەرزترن و سەرۆکهۆز پەسەندتریان دەکا و دەزانرێ لایەنگرییەکی تایبەتیان بۆ ئەو هەیە. لەبەرئەوە دەبینی پاداشتی زیاتر وەردەگرن و ئەوانە -لە ڕاستیدا- هەڵبژاردەی گزیرن و ژمارەیان -بیسیودوو- کەمە. بیرۆکەیەکی ڕوونیشمان سەبارەت بە تێکڕای داهاتیان نییە. بەپێی ڕاپۆرتی موتەسەڕیفی عەمارەیش کە ساڵی ١٩٤٤ لەبارەی لیوای عەمارەوە نووسیویە،[٦٨] بە دوو شێوە قەرەبووی ئەو ٥٥٢ گزیرەی شێخ محەمەد عرێبی کراوەتەوە: ٣٠٨یان بڕی ٦٠٣ تەن چەڵتووکیان وەرگرتووە، هەریەکە بەپێی پلەوپایەکەی، لە کاتێکدا ئەوانیتر زەوییەکیان پێبەخشراوە ڕووبەرەکەی ٢١٧٥ مشارە (نزیکەی ١٣٤٩ ئەکر) بووە و هەریەکەیان ڕووبەرێکی هاوتای پلەکەی خۆی هەبووە. جووتیارانی سەرۆکهۆز ئەم

---

وشەی (حۆش)ەوە هاتووە. واتە ماڵ و پارێزگارانی سەرۆکهۆز. دەیشڵێن لە حۆشییەوەیە، کە جۆرە وشترێکە، بە هێز و ڕەسەنایەتی دەناسرێتەوە. بڕوانە: جاسم حسين صكر، شيخ العشيرة ودوره السياسي في العراق في سنوات الانتداب البريطاني ١٩٢٠-١٩٣٢، دار الفرات للطباعة، الحلة، ٢٠٠٩. (و.ع)

[66] The Arab Bureau, Tribes of the Tigris, the Bani Rabi`ah, (Calcutta: Superintenatent of Government Printing, 1917, P. 1.

* محەمەد عرێبی (محمد العريبي): سەرۆکهۆزی خێڵاتی ئەلبومحەمەدە لە عەمارە، لە سەردەمی پاشایەتیدا بووە ئەندامی ئەنجومەنی پیران. (و.ع)

[٦٧] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی موتەسەڕیفی عەمارە (بەڕێز سەعد ساڵح) بە ناونیشانی: "تركة العقود المباشرة وتأثيرها الصوري على لواء العمارة." ڕۆژی ٤ی مایسی ١٩٤٤، ل٢٤. (ژمارەی لاپەڕەکە هیی نوسخەی شێوە دەستنووسی ڕاپۆرتەکەیە کە لە کتێبخانەی ئەمنی بەغدایە.)

[٦٨] هەمان سەرچاوە، ل٢٤.

زەوییانەیان بۆ ڕەنێودێنن و هیچ موڵکانەیەکی دەرەبەگایەتیشیان بەسەردا ناسەپێندرێ بۆ سەرۆکهۆز. ئاشکرایە ئەم کۆمەڵەی دوایی پاداشتێکی باشتر وەردەگرێ، بەڵام خۆیشی تاقمێکی بچووکی پەسەندکراو و لەوانیدی بەرزتری لەناودایە. گزیر، دابەشدەبێ بۆ چەند تاقمێکی بچووک، هەریەکەیان وەزیفەیەکی دیاریکراوی هەیە؛ لەوانە -بۆ نموونە- بەلەمەوان[٦٩] کە تاقمی بەرپرسی بەلەمەکانی سەرۆکهۆز و بنەماڵەکەین؛ بارهەڵگر، تاقمی بەرپرسی پارێزگاری و پاسەوانیی بەروبوومە لە وەرزەکانی دروێنە و بەروبووم هەڵگرتندا، پارەی زیاتر لە پاداشتی وریایی و چالاکییاندا وەردەگرن بۆ هاندانیان. پاشان تاقمی بەندەیش هەیە، کە چەند ئەرکێکی دزێوی مایەی شەرمەزاریی لەسەرە، ئەویش بەجێهێنانی سزای جەستەییە دەرهەق بە تاوانبارکراوان.*

کەسێتییە گرنگەکەی دەڤەرەکەیش، کەسێتیی ڕیشسپییە،[٧٠] کە شێوەیەکی پیاوانی دینی و قازیی هۆزە، بە ڕێزێکی تایبەتەوە مامەڵەی لەتەک دەکرێ و برێکی گەورەی پاداشتی سەرۆکهۆزی بەنسیب دەبێ. سەرۆکهۆز هەوڵدەدا، بەهۆی ئەوەوە، ئەو شتانە بەدیبێنێ کە بە گزیر پێی بەدینەهاتوون؛ ئەویش ئەوەیە کە پیاوەکانی خۆویستانە ملکەچی حوکمەکەی بن. دۆخی وایش هەیە ئەم کەسێتییەی پێ دەبێتە حوکمبەدەستی ڕاستەقینەی هۆز، وەک دۆخی موحسین کوڕی حاجی حەبیب[٧١] کە ساڵانی بیست بە جۆرێکی وا بەهێز دەستی بەسەر تیرەیەکی ئەلبومحەمەددا دەڕۆی، ئینگلیزەکانی ناچارکرد ددان بە دەسەڵاتەکەیدا بنێن. دۆخی مایەی سەرنجڕاکێشانی عەلی ئەبوخەلیفەیش هەیە کە زۆر دەسەڵاتی بەسەر هۆزی بەنیمالیکەوە هەبوو و لە ئەستێرەناسیدا

---

[٦٩] دەستنووسی بڵاونەکراوەی ناونیشان: "معلومات عن ريف العمارة"، ل١٢.

* قانوونی داوای خێڵەکی کە ئینگلیز ساڵی ١٩١٦ پێشنیازیکرد و حکوومەتی عیراقیش ساڵی ١٩٢٢ بڕیاری لێدا، ڕێی دا سەرۆکخێڵەکان زەویوزار و ئاوایییە (دیرە)کەیان بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان و ناکۆکی و کێشەکان بەپێی نیزامنامە باوە خێڵەکییەکان چارەسەربکەن، نەک نیزامنامە قانوونییە کارپێکراوەکان. پاش شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨یش هەڵوەشێندرایەوە. بڕوانە: فاضل عوني، شرح دعاوي نظام العشائر المدنية والجزائية لسنة ١٩١٨، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٥٥، ص٢٢ و بەدواوە. (و.ع)

[٧٠] بڕوانە: لاپەڕە ١٩ی سەرچاوەی پێشوو.

[71] Major Willcins, "File No. 124 and Administration Reports for 1918", I. P. 315.

هەڵکەوتوو بوو، بە شێوەیەک کە ساڵی ١٩١٧ پێشبینیی ڕووخانی تورکەکانی کرد. لە ڕاپۆرتێکی بریتانیادا هاتووە: «کارێکی مەزنی لە ناوچەی غەڕاف بە قازانجی ئێمە کرد.»[٧٢] کەسێتییەکی دینیش لەسەر فورات هەیە، دەسەڵاتێکی ڕێکخراوتری لەدەستدایە، ئەویش کەسێتیی متمانەپێکراو (المعتمد)ە، نوێنەری سەرەکیی موجتەهیدی نەجەفە، کە بە پێشەوای دینیی شیعە دەژمێردرێ. بارەگاکەی وا باوە لە شار بێ، هەرچەندە لەناو سەرۆکهۆزەکاندا زۆر دەستی دەڕوا. سەروبەندی ڕاپەڕینی ١٩٢٠ و پشێوییە خێڵەکییەکانی ساڵانی سی، ئەڵقەی پێوەندیی نێوان هۆزەکان و موجتەهیدی سەرەکی بوو.[٧٣] موجتەهید، بریکارێکی لە هێندێ گونددا هەیە، ئیماندار (المؤمن)ی پێدەڵێن، بە زۆری دەرچووی قوتابخانەیەکی دینییە و پاشتر دەسەڵاتێکی دینیی پێدەبەخشرێ.[٧٤]

کەسێتییەکیتری ناوچەکە کە دەبێ سەرنجی بایەخپێدانی بۆ ڕابکێشرێ، سەرکارە.* سەرکار ئەو کەسەیە کە بە شێوەیەکی ئاسایی بەرپرسی کشتوکاڵە و جاروباریش خۆی وەک جووتیارانیتر خەریکی کشتوکاڵ دەبێ. هەموو ناوچەیەک ژمارەیەک سەرکاری تێدایە؛ بە زۆری دەبنە سەرۆکی تیرەکان لە هۆزدا و زەوی لە سەرۆکهۆز بەکرێدەگرن و سەربەخۆ بەڕێوەیدەبەن، یا دەبنە بریکاری

---

72 Major Willcins, File No. 521.

٧٣ بۆ نموونە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، المجلد السادس، الجزء الثاني، (صيدا، مطبعة العرفان، ١٩٥٣).

٧٤ الدكتور شاكر م. سالم، الچبايش: دراسة انثروبولوجية عن ريف العمارة في العراق (بغداد: مطبعة الرابطة، ١٩٥٧) المجلد الأول، ص١٥٤.

پێویستە سەرنجبدرێ کە چبایش گوندێکی نموونەیی خێڵەکی نییە، چونکە ملکەچی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی حکوومەت بوو.

* سەرکار، وشەیەکی لە بنەڕەتدا فارسییە، لە دووپارچەی (سەر) و (کار) پێکدێ و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار لە عەرەبیدا بووە بە سەرکال، واتە سەرۆکی کارەکە یا بەڕێوەبەرەکەی. سەرکار، بریکاری قانوونیی موڵکدارە بەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکانەوە و سەرپەرشتیی جووتیاران و وەرزێران دەکا و پشک یا ڕێژەیەکی لە بەروبوومدا هەیە و بە زۆری لەو سەرۆکخێڵانەن کە زەوییەکانیان بە قودرەتی قادر بە هۆی حکوومەتەوە بووە بە موڵکی موڵکدارانی قانوونی، بڕوانە: فيصل السامر، من تأريخ العراق الاقتصادي والاجتماعي الحديث، مجلة آفاق عربية، العدد الخامس، كانون الثاني ١٩٧٨، ص٣٥. (و.ع) [ئەم زاراوەیە کوردیشە و بە هەمان مانا لە کوردەواریدا بەکاردێ. (و.ک)]

سەرۆکهۆز و ڕێژەیەکی بەروبوومی دەدەنێ. لە ڕاستیدا ئەو سەرکارانە، لەوانیش زیاتر جووتیاران، بەرهەمهێنی ڕاستەقینەن و بە کردەوە نوێنەری بەرژەوەندە کشتوکاڵییەکانی مەڵبەندەکەن.

**بنچینەکانی دەسەڵاتی سەرۆکهۆز:**

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بچینەوە سەر ئەو پرسیارە کە هێشتا وەڵاممان نەداوەتەوە: پاش هەموو هەوڵێکی بێپسانەوەی تورک بۆ لێکهەڵوەشاندنی سیستەمی هۆزایەتی، پێبەپێی گەشەکردنی ژیانی شار و سەرهەڵدانی حکوومەتی ناوەندی، ئاخۆ بنیاتی زەویوزارە نیمچەدەرەبەگییەکانی سەرۆکهۆز چۆن پەرەیسەندووە؟* یەکێک لە هۆیە سەرەکییە ناتەواوەکان، ئەوەیە کە هێزێکی تازەی دەرەکی -واتە ئینگلیزەکان- ساڵی ١٩١٤ هاتە مەیدانی ململانێی نێوان شار و سەرۆکهۆزەکان (لە لاپەڕەکانی پێشوودا قسەمان لەبارەوە کرد) و بە توندی لایەنی سەرۆکهۆزانی گرت.

**سیاسەتی حکوومەتی بریتانیا:**

داگیرکاریی بریتانیا، لە هێندێ لایەنەوە بازدانێکی بەرەو پێشەوە، لە هێندێ لایەنیتری ژیانی گەلی عیراقیشەوە، تێکشکانێکی بەرەودواوە دەنوێنێ. عیراق، لە ڕووخانی خەلافەتی عەباسییەوە، گەلێک داگیرکەری بەخۆوە دیون، لەوانە:

---

* ناکۆکییەک لە نێوان توێژەرەوەکاندا لە مێژووی هاوچەرخی عیراقدا هەیە سەبارەت بە ناونانی سیستەمی دەرەبەگی، یا نیمچەدەرەبەگی، یا خێڵەکی لە قۆناغی سەردەمی پاشایەتیی عیراقدا. دکتۆر عەلی وەردی ناوی نەناوە دەرەبەگی و ڕەتیدەکاتەوە و ناوی خێڵەکیی باوکسالاریی لێناوە، چونکە پێی وایە مەرجە پێویستەکانی ناونانی بە دەرەبەگی، وەک لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپادا هەبووە، لێرە شکنابرێن. لە کاتێکدا مارکسییەکان و لە سەروویانەوە ئیبراهیم کوببە، وەک نەریتیانە چەمکە مارکسییەکان دەقاودەق بخوازن، پێداگرییانکرد کە ناوی دەرەبەگی لێبنێن. بەڵام عەلی وەردی پاشتر بەدوایداچووەوە و گوتی: ئەم سیستەمە پاش بڕیارلێدانی قانوونەکانی ساڵی ١٩٣٢ کە زەمینەی بۆ سەرۆکهۆزەکان خۆشکرد زەویوزار بە ناوی خۆیانەوە تۆماربکەن، گۆڕا بە دەرەبەگی. ئەمەیش هەلی ژێرکێفخستنی دەیان هەزار دۆنمی بۆ ڕەخساندن. بڕوانە: سعدون خليل، علي الوردي في النفس والمجتمع العراقي، دار السعدون، بغداد، (د.ن)، ص٣٢١؛ ابراهيم كبة، الإقطاع في العراق بين نوري السعيد وخبراء العالم الحر، بغداد، ١٩٥٧. (و.ع)

بوەیهییەکان لە سەدەی دەیەمدا، سەلجووقییەکان لە سەدەی یازدەیەمدا و مەغۆلی ئیلخانی لە سەدەی سیازدەیەمدا، جەلائیری و قەرەقۆینلوو و ئاققۆینلووی تورکمان لە سەدەی چواردەیەمدا، مەغۆلی تەیمووری لە سەدەی پازدەیەمدا، پاشان سەفەوییەکان و دواجار عوسمانییەکان لە سەدەی شازدەیەمدا. ئەنجامی کۆتاییی ئەم هەموو داگیرکارییەیش، یا کارەساتێکی قەوماوی ڕاستەقینە، یا ڕووخانێکی بێهەستانەوەی عیراق بووە. ناکرێ ئەمە لەگەڵ ئەنجامەکانی هاتنەناوەوەی ئینگلیزەکان بەراوردبکرێ، هەرچەندە ناشێ نکوولیبکرێ لە شوێنەوارە باشەکانی وریابوونەوەی تورکیای عوسمانی لە سەروبەندی دوایین چارەکی سەدەی نۆزدەیەمدا، کە هۆیەکی یاریدەدەری بەدیهاتنی پێشکەوتنی ئەوەبەدوا بوو. بێگومان ئەو ڕادە ئاسایش و سەقامگیرییەی کە ئینگلیزەکان هێنایان، عیراق چەندین سەدە بوو بە خۆیەوە نەدیبوو و ئاسایش و سەقامگیریش -وەک دەزانین- مەسەلەیەکی بنچینەییی بەرقەراربوونی پێشکەوتنن. زانراویشە بیر و بۆچوون و شارەزاییی تازەی ئینگلیزەکان لە بەڕێوەبردن و ئاودێری و کشتوکاڵ و بوارەکانیتری ژیاندا، یارمەتیی عیراقیان دا و خستیانە سەر ڕاستەڕێیەکی تازە. بەڵام ئاشکرایە بوونی ئینگلیز لە عیراقدا، بۆ ئەوە نەبوو حەزبکەن سەقامگیری و پێشکەوتن بۆ گەلەکەی بەدەستبێنن، بەڵکوو ئەمە پێبەپێی هەوڵدانیان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیتری خۆیان، مەسەلەیەکی لابەلای ڕاگوزەر بووە؛ هەرچەندە حوکمدارانی ئینگلیز وەک چۆن باسی بەرپرسییەکانی خۆیان کردووە، بە دەگمەن لە بەرژەوەندەکانیان دوواون. پێم وانییە پێویستبکا جەخت لەوە بکەینەوە کە داگیرکاریی ئینگلیز پێوەندیی بە نەوتی زۆروزەبەندی عیراق و بە جێوڕێیەکەیەوە لەسەر ڕێگەی هیندستان هەیە، نەک نیگەرانیی ئینگلیز بۆ خۆشگوزەرانیی گەلی عیراق. دیاریشە کە بەرژەوەندەکانی ئیمپراتوری، یەکەم شتە لای ئینگلیزەکان و ئەمە کۆسپی ناوەتە بەر گەشەکردنی گەلی عیراق؛ ئەوەیش بە ڕوونی لە سیاسەتی ئینگلیزدا بەرامبەر بە هۆزەکان و بووژاندنەوەی ناوەختی دەسەڵاتی سەرۆکهۆزدا دەکەوێتەڕوو.

**بۆچی دەسەڵاتی سەرۆکهۆز بووژێندرایەوە و بەهێزکرا؟**

لەوانەیە کە ئینگلیزەکان ئارەزوویانبووە سەرۆکهۆز لە چارەنووسە مسۆگەرەکەی ڕزگاربکەن، بەشێکی لەبەرئەوە بووبێ کە نەریتیانە و حەز لە پارێزگاری دەکەن. ئەوە بە ڕوونی لای گەلێکیان، بەڵام نەک لای هەموو

فەرمانبەرانیان لە عیراق، دەبینین. ڕەنگە، تا ڕادەیەکی دیاریکراو، جۆرە سەختگیرییەک دژ بە دانیشتووانی شارەکان بەدی‌بکەین. بەرپرسێکی ئینگلیز ساڵی ۱۹۱۸ نووسیویە: «چەندە بتوانین سیستەمی هۆزایەتی بۆ ماوەیەکی درێژتر بهێڵینەوە، ئەوەندە باشتردەبێ. کاتێکیش لە کۆتاییدا لە ئەنجامی چەند هۆیەکی ئاساییەوە سەرناگرێ و ژێردەکەوێ، ئاواتەخوازین ڕێ بە هیچ بەغدادییەکی هیچوپووچ نەدرێ پێشوەخت بە بێشەرمی سەما لەسەر لاشەکەی بکا.»[٧٥]

گێرتروود بێڵی سکرتێری ڕۆژهەڵاتیی کۆمیسێری باڵای بریتانیایش لە نامەیەکی ۱۹۲۲یدا سەبارەت بە سەرۆکهۆزەکان، بۆ باوکیی نووسیوە: «ئەوانە ئەو خەڵکەن کە خۆشم‌دەوێن. من هەموو سەرۆکهۆزێک دەناسم، جا ئیتر ڕادەی بایەخی لەمسەروئەوسەری عیراقدا هەرچۆنێک بێ و پێم وایە ئەوانە بڕبڕەی پشتی وڵاتن.»[٧٦] لە کاتێکدا هێندێ ئینگلیزیدیی زیاتر پێوەندیدار بە عیراقەوە، بۆچوونێکی‌تریان هەیە. ئەفسەری سیاسی لە ناوچەی عەمارە، ئەمەی لە تشرینی دووەمی ۱۹۲۰دا نووسیوە: «ئێمە ئارەزوومانە حیسابیان بۆ بکەین و بە هەندیان بگرین.» «سەرۆکهۆز بایەخێکی گەورەی لە پاراستنی نیزام و ڕێکوپێکیی مەڵبەندەکەی خۆیدا هەیە؛ بەڵام ـلە ڕاستیدا- بەبێ پشتیوانیی حکوومەت، هەر سەرۆکێکی ڕواڵەتیی بێهێزە. کەسێتیی سەرۆکهۆز، هیچ بایەخێکی لەم ناوچەیەدا نییە. تێکەوتین و نرخێکی زۆر لە خۆی پترمان لەقەبەڵنا و زیاتریش لەوەی شایستەی بوو، پرس و ڕاوێژمان پێکرد. لە کاتێکدا خوێندەواران و دووربینانی ناو چینەکانی‌ترمان دوورخستنەوە. کوێراییمان داهات و ئەو ڕاستییەمان نەبینی کە سەرۆکهۆز ـلە ڕوانگەی سەرکار[٧٧] یا جووتیارەوە- نوێنەرایەتیی بەرژەوەندە کشتوکاڵییەکان ناکا.»[٧٨]

---

[75] Reports of Administration for 1918, 1, P. 134.

[76] Lady Bell, The Letters of Gertrude Bell, (New York: Boni and Liveright) Publishers II, P. 647.

[٧٧] سەرکار، بە شێوەیەکی ئاسایی سەرۆکی تاقمە خێڵەکییەکەیە و لە لیوای عەمارە ئەوان زەوی لە کەسوکاری سەرۆکهۆز بەکرێ‌دەگرن و بۆ قازانجی خۆیان ڕەنێوی‌دێنن، بۆیە دووبارە بەرامبەر بە ڕێژەیەکی بەروبووم بەکرێی‌دەدەنەوە بە جووتیاران. لە چەند لیوایەکی‌تریش، هەر بریکاری سەرۆکهۆزەکانن.

[78] Administration Report of the Amarat Division for the year 1920-1921, P. 25.

ئەفسەری سیاسی لە حلله بە شێوەیەکیتر نووسیویە، بەڵام پەردەی لەسەر دۆخێکی هاوشێوەی ئەوەی عەمارە لاداوە؛ ئەویش بێزاریی پیاوانی هۆزەکانە لە ملکەچیی دەسەڵاتی سەرۆکهۆزەکانیان.[79] ئەفسەری سیاسیی شامییەیش[80] نووسیویە: یەکێتییە هۆزایەتییە گەورەکە، لەبەریەکهەڵوەشاوە و ناجۆر و ناچوونیەکە، «ئەمە ڕەنگدانەوەی ئارەزووی خەڵک خۆیانە کە بە ڕاشکاوی ڕقیان لە ملهوڕییەکەی دەبێتەوە،» چونکە «دەسەڵاتێکی گەورە دەخاتە چنگی سەرۆکهۆزێک کە بە دەگمەن دەیبینن، ئەو دەسەڵاتەیش بە شێوەیەکی ئاسایی بۆ گیرفانپڕکردنی خۆی بەکاردێنێ. ئەوان پەییان پێبردووە، ئەگەر پشتیوانیی حکوومەت نەبووایە، ئەوەی دەستنەدەکەوت.»[81] ئەفسەرێکیدی گوتوویە: «تا ڕادەیەکی زیاتری نیزام و ئاسایش سەقامگیربکرێ، سەرۆکهۆز و هۆز لای تاکەکەس بەهای خۆیان لەدەستدەدەن.»[82]

ئەگەر پیاوانی هۆزەکان دەسەڵاتی سەرۆکهۆزیان نەوێ و حەزی پێنەکەن و ناچارینەبێ بۆ ژیانیان، کەواتە بۆچی ئینگلیزەکان هەوڵیان دا دووبارە بنیاتیبنێنەوە و بەهێزیبکەن؟

لەوانەیە سوودی سەرۆکهۆز بۆ دەسەڵاتدارانی بریتانیا، سوودێکی قازانجویستی بەرژەوەندخوازانە بووبێ، چونکە ئەو ناوەندە ئامادە و حازربەدەستە بوو کە دەکرا لە ڕێگەیەوە ناوچە دێهاتییەکان بەڕێوەببرێ.* جێگرەوەکەیتر، فەرمانبەرانی گەندەڵ و ناشایستەی متمانە بوون، کە لای حکوومەتی پێشووی

---

79 Reports of Administration for 1918, I, P.133.

80 Ibid., I, p. 72.

81 Ibid., I, p. 72.

82 Ibid., p. 120.

* زۆربەی کۆمەڵی عێراقی، لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، خەڵکی دێهات بوو، بگرە شارەکانیش مۆرکی دێهاتی و خێڵەکییان بەسەردا زاڵبوو. بریتانیایش بۆی دەرکەوت خستنەژێرڕکێفی عێراق، لە ڕێگەی جڵەوکردنی سەرۆکخێڵەکانەوە دەبێ، چونکە پێشتر زانیی جووڵانەوەی جیهادی ساڵی ١٩١٤ی ژێر ڕێبەریی سەید حەبووبی (السيد الحبوبي) و شۆڕشی بیست، خێڵەکانی تێدا ئامرازێکی کارا بوون، لەبەرئەوە پاشتر هەوڵی دا بە لای خۆیدا ڕایانبکێشێ، یا هیچ نەبێ بێلایەنیانبکا. مس بێل لەم بوارەدا پێشەنگ بوو. بڕوانە وردەکاریی ئەو بانگەوازە: المس بيل، فصول من تأريخ العراق القريب، ترجمة: جعفر الخياط، دار الرافدين للطباعة، بيروت، ٢٠١٠، ص٦٥ و بەدواوە. (و.ع)

تورک کاریان‌دەکرد، یا هێندێ لاوی نیمچەخوێندەواری شارەکان،[83] کە ناخۆشەویست بوون لایان. هەمیشە هۆیەک هەیە وامان لێ‌دەکا بپرسین: ئەگەر سەرۆکهۆز گونجاوبووبێ بۆ حوکمکردنی ناوچە دێهاتییەکان، کەچی وەک ئەفسەرێکی ئینگلیز گوتوویە: «کەسێکی بە شێوەیەکی ئاسایی نەزان و بیرتەسک و کۆنەپەرست و ئەوپەڕی خۆپەرست بوو و هەڵپەیەکی نائاساییی بۆ پارە و سامان هەبوو، هیچ پرۆژەیەکیش پێشکەشی ئەندامانی‌تری کۆمەڵەکەی خۆی ناکا، جا سوودەکەی هەرچۆنێک بێ، ئەگەر بزانێ -بە هەر ڕادەیەک بووە- زیانی بۆ پارە و سامانەکەی یا کەرامەتی هەیە.»[84]

هەرچۆنێک بێ، ئەوەی کە وا دەست‌پێ‌کرا قازانج و بەرژەوەندیکی کارگێڕی بێ، سەرەنجام بەو بارەدا شکایەوە کە ببێتە ناچارییەکی سیاسی. ئەم ناچارییە لەو ڕاستییەوە پەیدابوو کە سیاسەتی ماوەی ساڵانی بیستی بریتانیا لە عیراق، تا ڕادەیەک پابەندی دوو کاریگەریی دژبەیەک بوو: لە لایەکەوە، لەندەن تەنگەتاوکردنێکی بەردەوامی ئابووریی هەبوو، کێشایەوە بۆ کەمکرنەوەیەکی لەڕادەبەدەری هێزە سەربازییەکانی بریتانیا؛* لە لایەکی‌ترەوە، ئینگلیزەکان بە ڕوونی ئارەزوویان نەبوو دەست لە باڵادەستیی کارای خۆیان بەسەر عیراقەوە هەڵگرن. ئەوە لە پەیماننامەی ١٩٢٢ و ڕێککەوتنەکانی ١٩٢٤دا بۆ هاوکاریی سەربازی و دادوەری و دارایی و کارمەندانی بریتانیا و لە پەیماننامەی ١٩٢٦یش‌دا ڕەنگی‌دایەوە.[85]

---

[83] Ibid., P. 134.

[84] Administration Report of Amarah for 1920-21, P.25.

* هێزەکانی بریتانیا لە ٣٣ کەتیبە و ٦ فەوجی سوارە و ١٦ بەتەرییە و ٤ سریەی زرێپۆش و ٤ پۆلی فڕۆکەوە لە مارتی ١٩٢١دا، کەم‌کرانەوە بۆ ٣ کەتیبە و ٣ سریەی عەرەبانەی زرێپۆش و ٤ پۆلی فڕۆکە لە تشرینی دووەمی ١٩٢٩دا. بڕوانە: بریتانیای مەزن، ڕاپۆرتێکی تایبەت سەبارەت بە پێشکەوتنی عیراق ١٩٢٠-١٩٣١، ل٤٧-٤٨.

دەبێ سەرنج‌بدەین کە لە ساڵانی بیست‌دا پشت بە چەکی ئاسمانیی بریتانیا بەسترا، تەنگ‌پێ‌هەڵچنینی ئابووری یەکێک بوو لە هۆیە سەرەکییەکانی بەسترانی کۆنگرەی قاهیرە لە مارتی ١٩٢١دا، کە میر فەیسەڵی تێدا بە پادشای پاشەڕۆژی عیراق هەڵبژێردرا. بڕوانە: ڕاپۆرتی سێر پێرسی کۆکس لە کتێبی: مس بێل، نامەکانی گێرتروود بێڵ، بەشی دووەم، ل٥٣١-٥٣٢. (و.ع)

[85] دەقی پەیماننامەی ١٩٢٢ لە کتێبی "تأریخ الوزارات العراقیة"ی عەبدوڕەزاق حەسەنی‌دا، بەرگی یەکەم، ل٩٤-٩٨ و ڕێککەوتنەکانی ١٩٢٤ لە هەمان بەش‌دا (ل٢٢٣-٢٢٨) و دەقی پەیماننامەی ١٩٢٦ لە دووەم بەش‌دا (ل٣٧-٣٩) دەبینن. گرنگترین بەندەکانی ئەم ڕێککەوتنانە، ئەوەیە کە لە ماددەی

کێشەی ئینگلیزەکان ئەوە بوو چۆن بەو بێهێزییە سەربازییەی خۆیانەوە، زیاتر عیراق بخەنە ژێر باڵی خۆیان. مادامێکی نەدەتوانرا هێز پەیدابکرێ لە ئینگلتەرە، کە هۆکارە ئابوورییەکان هەڵیاندەسووڕاند، کەواتە دەبوو لە عیراق خۆیەوە و بە شێوەیەکی سەرەکیش بە خوڵقاندنی هاوسەنگییەکی گونجاوی نێوان هێزە سیاسییە ناوەکییەکان بەدەستبهێنرێ. بۆ ئەوەی هێزێکی گەورە و پڕخەرجیی سەربازیش دانەنێ، دەبوو -تا دەکرا- باڵادەستیی بریتانیا کەمتر ڕوون و ئاشکرا بێ. لەبەر ئەم هۆیە مەلیک و سوپایەک دران بە عیراق. وێڕای ئەوە، نەدەبوو وا چاوەڕوانبکرێ مەلیک لەباتیی ئەوان حوکمبکا، هەرچەندە قەرزاربارى ئینگلیزەکان بوو کە خستبوویانە سەر تەختی پاشایەتی. گێرتروود بێڵ گوتوویە: «جارێکیدی خۆم تێهەڵکێشی مەسەلەی لەسەرتەختدانانی مەلیک ناکەم. ئەوە خۆڕەتاندنێکی بێئەندازەی دەوێ (١٩٢١/٧/٨).»[٨٦] گوتوویشیە: «مەلیکەکەمان لەسەر تەخت دانرا» (١٩٢١/٨/٢٨).[٨٧] ئەو و ئەفسەرانی سوپاکەیشی، تێڕاوانینی تایبەتی خۆیان هەبوو. لەبەرئەوە خۆی و سوپاکەی هەوڵیان دا، نەک هەر لە ڕووی قانوونییەوە، بەڵکوو لە ڕووی هەڵکەوت و واقیعیشەوە، خۆ لە مەرجەکانی ڕێککەوتنە باسکراوەکان بدزنەوە. کەمترین هێزی سوپا گڵدرایەوە و هەر لەسەر بنچینەیەکی خۆبەخشانەیش هێڵرایەوە. لەبەرئەوە نەک هەر کارانەبوو، بەڵکوو لە ڕووی داراییشەوە پڕخەرجی بوو. هێزی یەکە بەکرێگیراوەکانی ناوخۆیش، کە بە هێزە بەسەربازگیراوەکانی

---

٤ی پەیماننامەی ١٩٢٢دا هاتوون و مەلیکیان پابەندکردووە ڕاوێژی کومیسیێری بەرزی بریتانیا قبووڵبکا لە هەموو کێشەیەکی گرنگدا کە کاربکاتە سەر بەرژەوەندە دارایی و نێودەوڵەتییەکانی بریتانیا. ئەوەیش کە لە ماددەی ١ی ڕێککەوتنەکەدا هاتووە، عیراقی پابەندکردووە کادری ئینگلیز لە پلە و پایەکانی وەزارەتە گرنگەکاندا دابمەزرێنێ، لەبەرئەوە ڕاوێژکارانی ئینگلیز لە وەزارەتەکانی ناوخۆ و دارایی و داد و بەرگری و ئیشغال و گەیاندندا دامەزرێندران، سەرباری دامەزراندنی چەند ئینگلیزێک بە پلەی بەڕێوەبەری گشتی بۆ پشکنێریی ئاودێری و ئیشغال و تاپۆ و کشتوکاڵ و ڕووپێوان و پۆستە و تەلگراف و پۆلیس و تەندروستی و پەروەردە و گومرگ. ماددەی دووەمی ڕێککەوتنی سەربازیش وای بڕیوەتەوە کە بریتانیا چەند هێزێکی خۆی دەبێ لە عیراق و ڕێیدەدرێ هێزی خۆجێیی بەسەربازبگرێ. ماددەی حەوتەمی هەمان ڕێککەوتنیش یەکلایکردووەتەوە کە دەبێ ڕەچاوی ئارەزووی کومیسێری بەرز بکرێ لەو کێشانەدا کە پێوەندییان بە کاری جموجووڵی سەربازی و دابەشکردنی سوپای عیراقەوە هەبێ و فەرماندەی گشتیی بریتانیایش مافی پشکنینی سوپای عیراقی پێبەخشرا، هەر کاتێک بە ناچاریی بزانێ.

[86] Lady Bell, II, p. 610.

[87] Ibid., P. 610.

عیراقی یا لیڤی ناسرابوون،* زیادکرا. ئەم کارە تێچووەکەی لە هێنانی هێندی یا چەند هێزێکی بریتانیا کەمتر بوو، بۆیە هەر خەڵکی کەمینەی ئاشووریی تاقمێکی چکۆلەی ئایینی و ئەتنیی بۆ گیرا بە سەرباز. دواجار و لێرەدا سەرۆکهۆزەکان هاتنە مەیدان؛ لە کاتێکدا ڕێ بە مەلیک درا لە ڕووی سەربازییەوە لە هەر تاکە سەرۆکهۆزێک بەهێزتربێ، بەڵام وای لێکرا لە هەر دەستەبەندییەکی سەرۆکهۆزەکان، یا هەموو سەرۆکهۆزەکان ئەگەر قسەیان یەکبخەن، بێهێزتربێ. لەبەرئەوە مەلیک لە ساڵانی هەوەڵی حوکمی پاشایەتی‌دا، هەر سەرۆکهۆزێکی گەورە بوو، لەباتیی گوند، لە شار دادەنیشت. تەنانەت لە ماوەیەکی ئەوەبەدوای نزیکی مارتی ١٩٣٣دا، مەلیک فەیسەڵ لە بیرخەرەوەیەکدا کە لە نێوان کۆمەڵێک متمانەپێکراودا دەستاودەستی پێکراوە، بە پەژارەوە سکاڵای‌کردووە کە پتر لە سەد هەزار تفەنگ بە دەست هۆزەکانەوەیە، کەچی حکوومەت خاوەنی تەنیا پازدە هەزارە. ئەم دۆخەیش لە هەموو سەرزەمینی خودادا هاوشێوەی نییە!**

* لیڤی، ئەو عیراقییانەن کە ئینگلیز پاش داگیرکردنی عیراق ساڵی ١٩١٤ بە سەرباز گرتنی، تا وەک هێزگەلێکی سەربازی کاربکەن بۆ پارێزگاری و ژێرڕکێف‌خستنی ناوچەکان. ژمارەیان ڕووی لە زیادی کرد، تا ساڵی ١٩٢٢ گەیشتە ٦١٩٩ چەکدار و بە هێزەکانی لیڤی ناسرا. تا کۆتایی‌هاتنی ئینتیداب لە ١٩٣٢دا مایەوە و بەردەوام بوو. بڕوانە: پەرەسەندنە مێژووییەکەی لە: محمد طربوش، دور العسكر في السياسة، ترجمة: محمود احمد عزة الأعظمي، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠١٠. (و.ع) [لەبارەیەوە بڕوانە ئەم بڵاوکراوەیەی بنکەی ژین: كيلبرت براون، قوات الليفي العراقية ١٩١٥-١٩٢٣، الترجمة والتعليق الدكتور مؤيد الونداوي، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٦. (و.ک)]

** مارتی ١٩٣٣ مەلیک فەیسەڵ بیرخەرەوەیەکی نهێنیی نووسیوە، بەسەر دەستبژاردەی سیاسیی حوکمداری وڵاتدا بەشیوەیەتەوە، گرنگترینیان ئەمانە بوون: نووری سەعید و جەعفەر عەسکەری و یاسین هاشمی و ناجی شەوکەت و تەها هاشمی و تۆفیق سویدی و هیتر، تا بۆچوونی خۆیان سەبارەت بەو مەسەلە و کێشانە کە پێوەندییان بە دەوڵەتی عیراقەوە هەیە، دەربڕن. بەڵام کۆچی‌دوایی مەلیک لە مانگی ئابی هەمان ساڵدا، پەردەی بەسەر ئەو بیرخەرەوەیەدا دادایەوە و پاشتر لە لایەن دەستبژاردی حوکمدارەوە پشتگوێ‌خرا، لەبەر پارێزگاریی بەرژەوەندی خۆیان. بەڵام مێژوونووس عەبدوڕەزاق حەسەنی توانیی دانەیەکی لێ پەیدابکا و پاشان لە کتێبەکانی‌دا بڵاوی‌بکاتەوە. گرنگترین کێشەی وڵات کە مەلیک فەیسەڵ خستوویەتەڕوو، مەسەلەی حوکمی کەمایەتیی سوننە لەسەر حیسابی زۆرینەی شیعە و پێویستیی چارەسەرکردنی ئەم ناهاوسەنگییە بووە. درێژەی بە باسی دابەشبوونی کۆمەڵایەتی و ئەتنی و مەزهەبیی وڵات داوە و چەند پێشنیازێکی شیاوی بەجێ‌هێنان و چەند چارەسەرێکیشی

حوکمدارانی بریتانیا، لە سایەی ئەم جۆرە هەلومەرجەدا، دەتوانن هەر تاقمێکی سەرۆکهۆزە گەورەکان بەکاربهێنن بۆ وردکردنەوەی هەر لادانێکی مەلیک لەو ڕاستەڕێیە کە ڕەنگیان بۆ ڕشتووە. بۆ نموونە، کاتێک مەلیک ئەرکی پووچەڵکردنەوەی پرۆژەی ئینتیدابی بریتانیای بەسەر عیراقەوە خستە ئەستۆی خۆی، شێخ عەدای جریانی سەرۆکهۆزی ئەلبوسولتان و ١٥ شێخیتری ناوچەی شەتاوی حلە، لە برووسکەیەکی بەرزکراوەیاندا بۆ کۆمیسێری باڵای بریتانیا، جەختیانکردووە کە «بە هەموو هێزێکەوە پشتیوانیی پرۆژەی ئینتیداب دەکەن، چونکە عیراق و ڕۆڵەکانی بەبێ ئەوە ناتوانن پێشبکەون.»[88] شێخ عەلی سولەیمان و چل سەرۆکهۆزیتر، ڕۆژی ٢٣ی نیسانی ١٩٢٢ چاویان بە مەلیک کەوت و بە پێداگرتنەوە بیریانهێنایەوە کە ئەوان «سوێندیان بۆ خواردووە لایەنگریی بکەن، بە مەرجێک سەرکردایەتیی بریتانیا قبووڵبکا.»[89] هەروەها گوتوویانە: سەرۆکهۆزانی بەنیڕەبیعە «بەوپەڕی نیگەرانییەوە دەڕواننە ئەگەری نەمانی سەرپەرشتیی بریتانیا.»[90] ئەم هاوسەنگییە لەنێوان مەلیک و سەرۆکهۆزاندا، هەمیشە دژ بە مەلیک بەکارناهێنرێ. ئەگەر یەکێک لە سەرۆکهۆزەکان لە ڕاستەڕێیەکە لای دا، یا هێزەکەی پتر لە پێویست زیادیکرد، یا لە کاتێکی نەگونجاودا دەسەڵاتی مەلیکی ڕەتکردەوە، ئینگلیزەکان ناپرنگێنەوە لەوە کە بیگێڕنەوە بۆ قەوارەی خۆی، یا تەنانەت لەناویببەن، یا گوندەکانی بۆردومانبکەن، یان بەروبوومەکەی بسووتێنن و هۆزەکەی پەراوازەبکەن؛[91] لە کاتێکدا ئەم جۆرە

لەم ڕووەوە بەرچاوخستووە. بڕوانە دەقی بیرخەرەوەکە لە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزرات العراقية، الجزء الثالث، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص٣١٥. (و.ع)

[88] (Secret) Intelligence Report No. 12 of 15.6. 1922, P. 517.

[89] (Secret) Intelligence Report No. 9 of 1.5. 1922. P. 263.

[90] (Secret) Intelligence Report No. 12 of 12.6.1922. P. 516.

[91] لێرەدا، جگە لە کێشەی شێخانی کورد، مەحموود بەرزنجی و ئەحمەد بارزانی، چەند نموونەیەک دەهێنینەوە. سەرۆکی هۆزەکانی مەدینە (المدينة)ی دەوروبەری بەسرە، ڕووبەڕووی هەمان چارەنووس بوونەوە. بڕوانە:

(Secret) Intelligence Report No. 2 and 3 of 15.1. 1922.

هەروەها سەرۆکهۆزی حەسەن (الحسن) لە ناوچەی سووقی شیووخ (سوق الشيوخ). بڕوانە:

(Secret) Intelligence Report No. 6 of 15. 3.1922.

شێخ سالم خەیوونی سەرۆکهۆزی بەنیئەسەد، کە لە سەرۆکایەتیی هۆز لابرا. بڕوانە: Great Britain, Report on the Administration of Iraq for 1925, p. 34. بۆردومانی دێهاتی شێخ

ڕێوشوێنانە جاروبار بۆ پاڵپشتی سوپای مەلیک دەگیرێتەبەر. ئەم هاوسەنگییە، نەک هەر لە نێوان مەلیک و سەرۆکهۆزاندا، بەڵکوو لە نێوان سەرۆکهۆزێک و سەرۆکهۆزێکی‌تردا دەپارێزرا. شێوازی بەخشینی موڵکایەتیی زەوی، سەلماندی کارایە بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە. بۆ نموونە، مەڵبەندی دەوڵەمەندی شەهلا (الشهلاء) لە لیوای عەمارە، کە پێشتر موڵکی شێخ محەمەد عریبی (محمد العريبي) بوو، لە نێوان ئەو و شێخ فالح سەیهوود (فالح الصيهود)دا، کە هەردووکیان لە هۆزی ئەلبومحەمەدن، دابەش‌کرا. هۆیەکی ئەم دابەشکردنە، وەک لە ڕاپۆرتی وەزارەتی موستەعمەرەکانی بریتانیادا هاتووە،[92] ئەوەیە کە «زامنی هاوسەنگییەکی لە جاران باشتر و سەلامەتتری هێز لە نێوان سەرۆکهۆزانی ئەلبومحەمەددا دەکا.»

لەبەرئەوە، دەسەڵاتدارانی بریتانیا هێزی خۆیان لە هەبوونی چەندین ناوەندی هێز و پاراستنی هاوسەنگییەکی گونجاوی نێوانیان وەردەگرت. لێزانیی ئەم سیاسەتە لەوەدابوو کە ئینگلیزەکان هەموو لایەکیان وا لێ‌کرد پێویستیان پێیان بێ. مەلیک، بە دۆخی نالەباری سوپاکەیەوە، ئەگەر ئینگلیزەکان لە عیراق پاشەکشەیان بکردایە، نەیدەتوانی مامەڵە لەگەڵ دوو ڕاپەرینی هۆزایەتی بکا کە هاوزەمان لە چەند ناوچەیەکی جیاجیای وڵاتدا بەرپادەبوو. هەروەها نەیدەتوانی تا ئەوان لەئارادابن، حاڵوباری سوپاکەی چاکتربکا. لە لایەکی‌ترەوە، گەلێک سەرۆکهۆزی قەرزارباری پلەوپایەی ئینگلیزەکان، ئەگەر ئەوان وڵاتیان بەجێ‌بهێشتایە، خۆشحاڵ‌نەدەبوون.

دەکرێ لە کاردانەوەی ئینگلیزەکانەوە دژ بە هەر هەوڵێکی تێکدانی ئەم هاوسەنگییە، سەرنج‌بدەین ئەوان تا چ ڕادەیەک پەرۆشی پاراستنی هاوسەنگیی نێوان مەلیک و سەرۆکهۆزەکان بوون. یەکێک لە بۆچوونە مەزنەکانی مەلیک و ئەفسەرانی لە ماوەی ساڵانی بیستدا، بەسەربازگرتنی خەڵک بوو. بەسەربازگرتن، نەک هەر تێچووی سوپای شاهانەی کەم‌دەکردەوە و ژمارەکەی زیاددەکرد، بەڵکوو بە بێ‌بەشکردنی سەرۆکهۆزەکان لە باشترین پیاوەکانیان و تێکشکاندنی لەمپەرە توندوتۆڵەکانی نێوان هۆزەکان، جێ‌وڕێی سەرۆکهۆزەکانی بەرەو هەڵتەکاندن دەبرد؛

---

غەزبان خەیوون (غضبان الخيون)ی سەرۆکهۆزی بەنی‌ئەسەدیش کرا لە ١٩٢٨دا. بڕوانە: الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، المجلد الثاني، ص١٦١.

[92] Great Britain, Report of the Administration of Iraq for April 1922. March 1923, pp. 67-68.

ئەمەیش هەنگاوێکی سەرەکی بوو تا تێکەڵ بە ژیانی نیشتیمانی بکرێن. بەڵام ئینگلیزەکان هیچ نیازێکی لەم چەشنەیان نەبوو، تەنانەت کاتێک ئەفسەرانی مەلیک پێشنیازیان‌کرد بەسەربازگرتن هەر دانیشتووانی شارەکان بگرێتەوە، ئینگلیزەکان سووربوون لەسەر ناونەهێنانی مەسەلەی سەربازگرتن لە پلانی فراوانکردنی سوپای عیراق‌دا کە خرابووە سەر رێککەوتنی سەربازیی ١٩٢٤، «چونکە رەنگە ئەمە ترس‌وبیمێکی ناپێویست لە ناوچە خێڵەکییەکان‌دا بێنێتە گۆڕێ.»[٩٣] کاتێکیش حکوومەتەکەی مەلیک لە ١٩٢٧دا پرۆژەی قانوونی بەسەربازگرتنی خستە بەردەمی پەرلەمان، کۆمیسێری باڵای بریتانیا داوایەکی نائاسایی لە ١٢ی مایسی ١٩٢٧دا پێشکەش‌کرد، ئەویش ئەوەبوو کە سەرۆکوەزیرانی عیراق بەیاننامەیەک لەبەردەم پەرلەمان‌دا و بەر لە بڕیارلێدانی پرۆژەی قانوونەکە بخوێنێتەوە، بڵێ: حکوومەتی بریتانیا قایل‌نابێ هێزەکانی بریتانیا بەکاربهێنرێن بۆ پشتیوانیی بەجێ‌هێنانی قانوونەکە، ئەگەر هێندێ دەستە و تاقمی گەل ڕەتی‌بکاتەوە.[٩٤]

سەیر ئەوەیە، کە سەرلەنوێ قسە لەبارەی پرۆژەی قانوونی بەسەربازگرتنەوە کرا، یەکێک لە سەرۆکهۆزەکان کە عەبدولعەباس فەرهوودی سەرۆکهۆزی بەنی‌ڕەبیعەیە،* لە کۆبوونەوەیەکی ڕۆژی ٢٩ی ئابی ١٩٢٨ی حیزبی تەقەدوم (التقدم)ی بەشداری پەرلەمانی حکوومەت‌دا، کە نوێنەرانی سەرۆکهۆز ئامادەی‌بوون، ڕایگەیاند سێ‌هەزار پیاوی بەدواوەیە، «پێیان باشترە بچنەپاڵ ئیبن‌سعوود، نەک بەزۆر بە سەرباز بگیرێن.»[٩٥] سەرۆکهۆزێکی‌تر کە مونشید حەبیبی سەرۆکهۆزی غززی (الغزي)یە،** گوتی هەمان شت دەکا.

---

[93] (Secret) Intel, Report No. 6 of 20. 3.1924. p. 178.

[٩٤] بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: نامەی ژمارە ٢٠٥٨ی ڕۆژی ٢٥ی مایسی ١٩٢٧ی سەرۆکوەزیرانی عیراق بۆ کۆمیسێری باڵا کە لەم سەرچاوەیەدایە: الحسني، تاريخ الوزرات العراقية، الجزء الثاني، ص٩٢.

* عەبدولعەباس فەرهوود، سەرۆکهۆزی خێڵی بەنی‌زرێجە لە قەزای ڕومیسەی سەماوە، دەچنەوە سەر خێڵاتی مەییاح. لە بەشدارانی شۆڕشی بیست و ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٣٥ی خێلاتی فورات بوو. (و.ع)

[٩٥] لە ڕاپۆرتێکی نهێنیی تایبەتی ڕۆژی ٣٠ی ئابی ١٩٢٨ەوە، کە لە ڕاپۆرتی ئەمنیی ناونیشان "حیزبی نیشتیمانی – الحزب الوطني"ی مێجەر ویلکینس‌دایە.

** مونشید حەبیب (منشد الحبيب): سەرۆکهۆزی ئالعززییە لە ناسرییە. ساڵی ١٩٠٣ جڵەوی سەرۆکهۆزایەتیی هۆزی گرتە دەست و بووە نوێنەری لیوای مونتەفیک. ساڵی ١٩٨٤ مرد. (و.ع)

ئینگلیزەکان هەستیان بە کەمە تەنگەتیلکەبوونێک دەکرد، کاتێک حکوومەتەکەی مەلیک هەوڵیدەدا کاربکاتە سەر سەرۆکهۆزەکان لە ڕێگەی زەویوزارەکانیانەوە. زەویوزار، بناغەی دەسەڵاتی سەرۆکهۆزەکان و سەرچاوەی سامان و شانوشکۆ و هێزە چەکدارەکانیان بوو؛ بۆیە گەمەکردن بە چارەنووسیانەوە، ئیمتیازێکی تایبەت بوو، ئینگلیزەکان هێشتیانەوە بۆ خۆیان. لەبەرئەوە کاتێک هێندێ وەزیری مەلیک لە ١٩٢٦دا هەوڵیان دا بیرۆکەی دابەشکردنەوەی زەویوزاری بەکرێدراوی میری بە سەرۆکهۆزانی گەورەی عەمارە جێبەجێبکەن، ئەنجامەکەی کۆبوونەوەیەکی تایبەتی ڕۆژی ١ی ئەیلوولی ١٩٢٦ بوو بە داوای کۆمیسێری باڵا، سەرۆکوەزیران و وەزیری ناوخۆ و وەزیری دارایی و ڕاوێژکارە ئینگلیزەکانیان ئامادەیبوون. کۆبوونەوەکە «یەکێک لە گرنگترین بڕیارەکانی دا، ئەویش ئەوە بوو کە: حکوومەتی مەلیک پێڕەوی هیچ سیاسەتێکی مەبەستدار نەکا بۆ هەڵتەکاندنی جێوڕێی سەرۆکهۆزە گەورەکان.»[٩٦]

جارێکیتریش، کاتێک حکوومەتی پاشایەتی لە سەرەتای ١٩٢٢دا بڕیاری دا بکەوێتە زیادکردنی دەرامەتی زۆر کەمی خۆی لە سەرۆکهۆزە گەورەکانی لیوای کووت، کە ئینگلیزەکان لەبەر سیاسەتی خۆیان مامەڵەیەکی تایبەتی باشتریان دەکردن، ئینگلیزەکان هەستیانکرد «ئەم زیادکردنە هەر سەرەنجامێکی زیانبەخشی لە ناوچە خێڵەکییە هەستناکەکان لێدەکەوێتەوە؛» لەبەرئەوە دەبێ ئەم بڕیارە ترسناکانەی کە ئەنجومەنی تازەکاری وەزیران، بەبێ پرس و ڕاوێژی دەسەڵاتدارانی خۆجێیی (واتە پشکنێری کارگێڕیی ئینگلیز) داونی، هەڵیانبوەشێنێتەوە.[٩٧]

قایمکردنی جێپێی سەرۆکهۆز، کێشایەوە بۆ بەهێزکردنی باڵادەستیی ئینگلیز لە عیراق، نەک هەر بە بەکارهێنانیان بۆ سەرکوتکردنی مەلیک و فەرمانبەرانی، بەڵکوو بۆ ڕێگرتنیان لە نزیککەوتنەوە لەو شارانە کە بە ناوەندی ڕاستەقینەی بەرەنگاری و بەرگریی دژی دەسەڵاتدارانی بریتانیا دەژمێردران. شارانی لەچەکداماڵراوی دەورەدراو بە چەندین هۆزی پڕچەک، بە مورکێکی دیاری ئەو سەردەمە دادەنرێن. شتێکی سەیر و دەگمەن نییە ئەم هەستکردن بە دوژمنایەتیی

96 (Secret) Intelligence Report No. 19 of 15.9.1926, para. 578.

97 (Secret) Intelligence Report No. 15 of 1.8.1922, para. 699.

ئینگلیزە کە لە شاردا سەریهەڵدابوو، وەک لە ڕاپەڕینی ۱۹۲۰دا هەبوو، نەمێنێ و بمرێ، کاتێک بە ڕوونی دەرکەوت شار مەترسیی هەڕەشەی پیاوانی هۆزەکانی دەوروبەری لەسەرە. هێندەی توانرا، تێکەڵیی نێوان پیاوانی شار و پیاوانی هۆزەکان، تا ئەوپەڕی کەمکرایەوە. ناکۆکی و دابەشبوونی نێوانیان بە ددانپێدانانی ڕەسمی و چەسپاندنی نەریتە خێڵەکییەکان قووڵکرایەوە.

بەوپێیە عیراقییەکان لە ڕووی قانوونییەوە ملکەچی دوو نیزامنامە دەبوون: یەکێکیان بۆ شار و ئەویتر بۆ دێهاتی خێڵەکی. فەرماندەی سەربازیی ئینگلیز لە ۲۷ی تەمووزی ۱۹۱۸دا نیزامنامەی ناکۆکییە خێڵەکییەکانی دەرکرد، کە ڕاگەیاندنێکە هێزی قانوونی هەیە. چەند دەقێک کە پێوەندیی بە زەویوزارەوە هەیە و لە ماددەکانی ۱۱۳ و ۱۱٤دا خۆی نوواندووە، بە پێداگریی ئینگلیزەکان خرایە ناو دەستووری عیراقی و دێهات لە تایبەتمەندیی قانوونی نیشتیمانی هەڵاوێردرا. بنەماکانی ئەم نیزامنامەیە، کە هەر پاش شۆڕشی ۱۹۵۸ هەڵوەشێندرایەوە، بە تێهەڵکێشکردنی برگەی ۸۸-ب لە دەستووردا پشتگیریکران، کە دەڵێ: دەبێ ناکۆکییە خێڵەکییەکان بەپێی داب و نەریتی خێڵەکی و پشتبەستوو بە قانوونێکی تایبەت یەکلابکرێنەوە.[98] دەشێ بەرهەڵستیی نیزامنامەکە لە لایەن بەرپرسانی عیراقییەوە و نیگەرانیی ئینگلیزەکانیش لە ئەگەری هەڵوەشاندنەوەی، لەو بیرخەرەوەیەدا ببینین کە کۆمیسێری باڵا لە مارتی ۱۹۲۵دا بۆ وەزیری ناوخۆی نووسیوە و پەڵپی تێدا گرتووە و گوتوویە: «بۆچوونی باوی ناو بەرپرسانی پایەبەرزی کارگێڕی و دادوەری، لەوبارەیەوە کە نیزامنامەی یەکلاکردنەوەی ناکۆکییە خێڵەکییەکان، قانوونێکی سەنگین و لەبەرچاوگیراوی زەویوزار نییە، بۆچوونێکی تەواو چەوتە.»[99]

ماددەی ٤۰ی برگەی ۱ی نیزامنامەکە وای بڕیوەتەوە کە دەتوانرێ هەر ئەندامێکی پەسەندنەکراوی خێڵ لە زەویوزارەکانی خێڵ وەدەربنرێ. نەک هەر ئەوە، کۆمیسێری باڵا لە ۱۹۲۵دا واوەتر چوو و ئەم ماددەیەی فراوانترکرد، تا ئەوەیش بگرێتەوە کە دەشێ ئەو کەسە، نەک هەر زەویی خێڵەکەی خۆی، بەڵکوو

---

[98] See: e.g Administration Report of Amarah for 1920-21. P.6.

[99] Office of the High Commissioner, (secrat) Intelligence Report No. 7 of 2 April 1925, Paragraph 142.

له هەموو زەوییەکی خێڵەکانیتریش دەربکرێ و تا فەرمانێکی کارگێڕی بڕیاری بۆ نەدا، نەتوانێ لە هیچ شوێنێکی ناو عیراق نیشتەجێببێ.[100] یەکێک لە ئەنجامەکانی ئەم لێکدانەوەیە کە وەزیری ناوخۆ قبووڵیکرد، ئەوەبوو کە کاریگەریی ئەم نیزامنامە کارگێڕییە بێپاساوە زیاترکرا، تا شار خۆیشی بگرێتەوە. هەڵاواردنی پیاوانی خێڵات لە پیاوانی شار، گەیشتە ئەو ئاستە کە نەخشە کێشرا بۆ کردنەوەی چەند قوتابخانەیەکی تایبەتی ناوخۆ بۆ ڕۆڵەکانی سەرۆکهۆزەکان. ڕاپۆرتێکی ساڵی ١٩١٨ی بریتانیا ئەمەی تێدا بێژراوە: «نابێ کوڕانی ئەم چینە بنێردرێنە قوتابخانەکانی شار، تا تێکەڵ بە شاری نەبن و لە جۆرەها هەڵە و گوناحی شاری عیراقییەوە نەگلێن و خراپنەبن؛ تێکەڵی کوڕانی ئەوانەیش نەبن کە باوکانیان پێیان وایە لەوان پلەنزمترن.»[101]

ئەم قوتابخانانە خرانە ناو بودجەی ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٥. دواییجار ئەم قوتابخانانە لە ڕاپۆرتێکی بڵاوکراوەی ساڵی ١٩٢٥دا ناویانبرابێ، ئەمەی تێدا نووسراوە: «ئەم پرۆژەیە تێچووی زۆرە، بەڵام هاوکاریی هۆزەکان لە پشتیوانیی حکوومەت و وڵاتدا، شایستەی ئەوەیە تێچووەکەی بدرێ.»[102]

پاش ئەوەی ڕوونمانکردەوە: بۆچی ئینگلیزەکان دەسەڵاتی سەرۆکهۆزەکانیان بەهێز و بنجبەست کرد، ئێستە مایەوە بزانین: ئینگلیزەکان چۆن ئەوەیان بۆ کرا؟

#### چۆن دەسەڵاتی سەرۆکهۆزەکان بەهێزکرا؟

پرۆسەی لەبەریەکهەڵوەشاندنی هۆزەکان کە میراتێکی سیاسیی تورک بوو، وەک خۆی هێڵرایەوە. پێشکەوتنی گوندیش ڕاگیرا و سەربەخۆییەکی زیاتر درا بە هۆزی دەوروبەری.[103] تێکەڵبوونی یەکتریی هۆزە جیاجیاکان، ئەوەندەی بکرایە، قەدەغەبوو.[104] هەڵاتنی جووتیاریش لە زەویی سەرۆکهۆز،

---

[100] Ibid., Pragraph 143.

[101] Reports of Administration for 1918, I, p. 145.

[102] Great Britain, Colonial Office, Report of H. B. N. G. to the L. of N. on the Administaration of Iraq-April 1923 to December 1924, p. 214.

[103] بۆ نموونە، براونە: Reports of Administration for 1918, I, p. 132.

[104] Ibid, p. 136.

قەدەغەبوو.[١٠٥] دەسەڵات لە هەموو خێڵێکدا، لە هەر کوێیەک بکرایە، بە سەرپشککردن دەدرایە پیاوێک، ئەویش بە بەرزکردنەوەی سەرۆکی تیرەیەک بۆ پلەیەکی بڵندتر. ئینگلیزەکان واوەتر چوون و زیاتر پارێزگاریی دەسەڵاتی ئەم پیاوەیان کرد. بۆ نموونە، کاتێک تیرەیەکی هۆزی ئەلبوسوڵتان لە ١٩١٨دا دەسەڵاتی شێخ عەدای جریانی سەرگەورەی سەرۆکانی هەڵبژێردراوی هۆزی ڕەتکردەوە، ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز بە هێزێکی پەنجا سەربازییەوە جووڵا، گوندی ئەم تیرەیەیان وێران و بابیی ٦٠٠٠ رووپیی گاوگوتاڵیان زەوت کرد.[١٠٦] ساڵی ١٩٢٦یش ئینگلیزەکان جارێکیدی فڕۆکە و زرێپۆشیان بەکارهێنا بۆ لێدانی هێندێ تیرەی هۆزی شەمەری هەڵگەڕاوە لە عەجیل یاوەر*ی سەرگەورەی سەرۆکانی هۆز.[١٠٧]

هەموو سەرۆکهۆزەکان جاروبار ئەم دەسەڵاتە بێزارکەرەیان پێ پەسەندکراو نییە. جارێکیان سەرۆکهۆزێکی هەڵبژێردراو چەند ڕۆژێک لە بەردەرگەی ئەفسەری سیاسی دانیشت، ڕایگەیاند پیربووە و سەد بەهانەی هێنایەوە و پاڕایەوە ڕێیبدرێ بە ئاشتی و بەبێ ترس لە هۆزەکەی بژی. سەرۆکتیرەکانیش چارەی ئەم دەسەڵاتە خێڵەکییەی سەرگەورەی سەرۆکانی هۆزیان ناوێ. سەرۆکی چوار تیرە لە ناوچەیەکدا، ئەرکی کۆکردنەوەی هەموو

---

105 Administration Reports of the Muntafik for 1919, p. 110.

106 Administration Report of Hillah Division for 1919, p. 2.

* عەجیل یاوەر کوڕی عەبدولعەزیزی سەرۆکهۆزی شەمەر جەربە، ١٩٢٤ بووە نوێنەری مووسڵ و نازانرێ کەی لەدایکبووە، بەڵام لە ١٩٤٠/١١/١٢دا بە جەڵتەی دڵ مردووە. مس بێلی سکرتێری ڕۆژهەڵاتیی کۆمیسێری بەرزی بریتانیا، لە نامەیەکیدا بۆ دایکی، وا وەسفیکردووە: «ساڵی ١٩١٧ هاتە پاڵمان، پاشان هەڵخلیسکا بەرەو تورکان و جارێکیتر کە مووسڵمان داگیرکرد، هاتەوە لامان. دیسان لەبەر هۆیەکی هەرگیز نەزانراو لە دژمان وەستایەوە. بالابەرزە و درێژیی شەش پێ و چوار قولانجە. کەسێکی هێژای سەیر و بەهێزە. لەشی یەک ئۆنس چەوریی زیادەی تێدانییە و دەستەکانی نموونەیین. چوار ئەگریجەی ئەستووری ڕەش لەژێر جامانەیەکی سوورەوە بەسەر سینەیدا شۆڕبووەتەوە، ردێنێکی ڕەشی کورت و ڕێک هەڵپاچراوی هەیە، لەگەڵ عەباییکی ئاڵتوونی و کراسێکی سپیی لۆکەی تا گەردن و هەردوو مەچەک قوپچەدار.» (و.ع)

107 Secret Intelligence, Report No. 8 of 15.4.1920, Para 232.

کەسانی دەسترۆی ناوچەکەیان کێشا بۆ قەناعەتپێکردنی ئەفسەری سیاسی بەوە کە تیرەکانیان چوار هۆز پێکدەهێنن، نەک هەر یەک هۆز.[108]

٢. سەرگەورەی سەرۆکانی هۆز بوو بە بەرپرسی قانوون و ڕێکوپێکی (نیزام) لەناو هۆزدا. دەبوو –لە ڕاستیدا– هەموو ناکۆکییەکانی نێوان ئەندامانی خێڵەکەی چارەسەربکا، سەرباری ئەوەی کە دەبوو –بەپێی ماددەی ٨– دەیەمی نیزامنامەی چارەسەری ناکۆکییە خێڵەکییەکان– حوکمەکانی لە ناکۆکییە گرنگەکاندا لە ڕووی تیۆرییەوە ئەفسەری سیاسی پەسەندیانبکا. هەروەها بوو بە بەرپرسی کۆکردنەوەی باجە حکوومییەکان. بە کردەوەیش هیچ بەربەستێک لەئارادانەبوو ڕێ لە سەرۆکهۆز بگرێ، تا ئەم دەسەڵاتانە بە خراپی بەکارنەهێنێ. ئاساننییە دۆخێک بهێنریتە گۆڕێ وا پێویستبکا سەرۆکهۆز خۆی و پیاوانی خێڵەکەی، ڕێوشوێنێک بگرنەبەر لەگەڵ «بیر و بۆچوونی ئینگلیز سەبارەت بە دادپەروەری» بگونجێ.[109]

هەرچی پیاوی سادەی خێڵیشە، کە هیچ دەسترۆیی یا دەسەڵاتێکی نییە، هیچ یەکێک نابینین بوێرێ سەرۆکهۆز بە شتێک تاوانباربکا. ئەمە بە شێوەیەکی تایبەت لە سەرۆکهۆزانی گەورەی خاوەن زەویوزارێکی پان و بەرین ڕوودەدا. بەڵگەنامەیەکمان هەیە، سکاڵایەکی تێدایە، ئەفسەرێکی ئینگلیز نووسیویە و گوتوویە: «ناوچەکەی ژێر دەستی ئەو، هەر چوار سەرۆکهۆزی لێیە، هەموو یەکێک لەوانە مەڵبەندێکی فراوانی هەیە. بۆیە زەحمەتە هەر کەسێکی دەرەوەی ئەم بازنەیە ڕاستیی مەسەلەکانی بۆ ساغببێتەوە.»[110]

سیاسەتی بەڕێوەبردنی دێهات لە ڕێگەی سەرۆکهۆزەکانەوە، هەمیشە پێڕەونەدەکرا. حوکمی ئینگلیز لە هەردوو ناوچەی شێواوی شامییە و هیندییە، لە ماوەی نێوان ١٩١٨–١٩٢١دا، ڕاستەوخۆ بوو. ئەم ناوچانە دراوسێی شاری پیرۆزی نەجەف بوون و دەستبەسەرداگرتنی نەجەفیش مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ و

---

108 Report of Administration for 1918, I, P. 383.

109 Ibid, P. 119.

110 Ibid, P. 70.

ژیانبەخش بوو، چونکە «ئەوی دەست بەسەر نەجەفدا بگرێ، دەست بەسەر دۆڵی فوراتدا دەگرێ.»[١١١]

٣. سەرۆکهۆز کە بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێردرا، جێپێی قایمبوو، لە کاتێکدا لە سەردەمی عوسمانیدا ئەم ئیمتیازەی پێنەدرابوو تا ببێتە ئەندامی ئەنجومەنی مەبعووسان. لە دوایین خولی هەڵبژێردراوی ئەم ئەنجومەنەدا، ٤ی کانوونی دووەمی ١٩١٤ و لە کۆی سیوچوار نوێنەردا کە نوێنەرایەتیی عیراقیان دەکرد،[١١٢] تەنیا دوو نوێنەریان تێدا بە ئەسڵ خێڵەکی بوو، ئەوانیش عەبدولموحسین سەعدوون -کە پاشتر بووە سەرۆکوەزیرانی عیراق- و براکەی بوون؛ بەڵام ئەوان هیچ ئەزموونێکی خێڵەکییان لە ژیانیاندا نەبوو، چونکە خەریکی خوێندنێکی بەرز بوون لە ئەستەموول. کاتێکیش ڕێوشوێن دانرا بۆ کۆبوونەوەی کۆمەڵەی دەستووریی عیراقی لە ١٩٢٤دا، ژمارەیەکی زۆری کورسییەکان تەرخانکرا بۆ سەرۆکهۆزەکان. لە ٩٩ ئەندامی کۆمەڵەکە، ٤٤یان سەرۆکی هۆز بوو؛[١١٣] لیژنەیەکی پێکهاتوو لە سەرگەورانی سەرۆکانی هۆز، هەڵیبژاردن. ئەو چلویەک سەرۆکهۆزە ڕۆژی ٢٤ی مارتی ١٩٢٤، پێش کۆبوونەوەی کۆمەڵە، چوونە بەغدا و هەمووان سوێندیانخوارد پشتیوانیی پەیماننامەی -لەو کاتەدا- هەڵپەسێردراوی ئەنگلۆ-عیراقی بکەن و بەبێ ڕێککەوتنی هاوبەش لەگەڵ ئینگلیزەکان، هیچ ڕێوشوێنێک نەگرنەبەر. ئەوانیش -واتە ئینگلیزەکان- «سووربوون چەند ماددەیەکی نیزامنامەی چارەسەری ناکۆکییە خێڵەکییەکانی ئینگلیز بخەنە ناو دەستووری عیراقی و موڵکایەتیی زەوییە حکوومییە ڕەنێوهێنراوەکان لە لایەن سەرۆکانی ئەم خێڵانەوە، ئاڵوگۆڕی تێدا نەکرێ.»[١١٤] سەرباری ئەوە، هەرچەندە زۆربەی سەرۆکهۆزەکان نەخشێکی بنچینەیی لە تێپەڕاندنی پەیماننامە و دەستوورەکەدا هەبوو، کاتێک کۆمەڵە یەکەمین دانیشتنی ئەنجام دا، نەیانتوانی بە یەکگرتوویی بمێننەوە.*

---

[111] Ibid, P. 320.

[١١٢] دەتوانی لیستی نوێنەرە عیراقییەکان لە ئەنجومەنی مەبعووسان، لە بیرەوەرییەکانی سلێمان فەیزیدا ببینی کە ئەمە ناونیشانیەتی: في غمرة النضال، ص١٤٠.

[113] Secret Intelligence Report, No. 4 of 21.2.1924, Para 125.

[114] Ibid., P. 229.

* هۆیەکەی ئەوەیە: هێندێ سەرۆکخێڵ شوێن فەتوای ڕابەرانی دینیی کازمییە و نەجەف کەوتن، کە داوایانکرد بەشدارنەبن لەو هەڵبژاردنانەی ئەنجومەنی دامەزراندن (المجلس

پەرلەمانی ١٩٢٥یش، کە مەلیک دەستێکی باڵای لە دەستنیشانکردنی نوێنەراندا هەبوو، ژمارەی سەرۆکهۆزانی تێدا گەیشتە ١٨ ئەندام لە کۆی ٨٨ ئەندام.[١١٥]

٤. جێپێی سەرۆکهۆز بە ڕێگە و ئامرازی ئابووریش قایمکرا. سیاسەتی دەستکەوتنی زەوی (کە لە شوێنێکی دواتردا وتوویژی لەبارەوە دەکرێ) خرایە خزمەتی بەدیهێنانی ئەم مەبەستە. ئەم مەسەلەیە کاریکردە سەر دەرامەتەکانی باجی دەوڵەت. باجگرتن لە سەردەمی عوسمانیدا، هەرگیز کارێکی چوست و چالاک نەبوو. ئەم ڕێوشوێنە کاتی خۆی بەوە دەگیرایە بەر کە فەرمانبەرێک بنێردرێ بۆ خەملاندنی قەوارەی بەروبوومی کشتوکاڵی؛ ئیتر لە میوانخانەی سەرۆکهۆز دادەنیشت، قاوەی هەڵدەقوڕاند و خەملاندنەکانی بەدەست دەگەیشتن! جاروباریش هێزێکی سەربازی دەنێردرایە سەر سەرۆکهۆزە یاخییەکان. جارێکیان سەرۆکهۆزێک و هێندێ کەسوکاری بە ئاشکرا ئیعدامکران و باجەکەیش بە تەواوی وەرگیرا.[١١٦] وێڕای ئەوە و سەرەڕای باجگریی پچڕپچڕ و ناڕێکوپێک، تورکەکان توانییان باجێکی هاوتای ٧٣١,٠٠٠ دینار[١١٧] لەسەر زەویوزار و ١٧٩٠٠٠ دینار لەسەر ئاژاڵ کە بە باجی کودە* ناسراوە، وەربگرن (بڕوانە: خشتەی ژمارە ١، پاشکۆی ١). ئەمە لەو باجە کەمترە کە بەڕێوەبردنی چوست و چالاکتری بریتانیا توانیی لە ساڵانی داگیرکاریی خۆی و ئینتیدابدا لەو هەمان باجەی بەدەستبهێنێ، بەڵام نرخ لە سەردەمی تورکیدا کەمتربوو. وەک بەرپرسێکی گەورەی باجی ئینگلیز لە ١٩٢٤دا ئاماژەی پێداوە،[١١٨] «زیادبوونی باجی زەویوزار لە ماوەی حوکمی ئینگلیزدا بە ڕاستی کەمە، لەبەر بەرزبوونەوەی تێکڕای نرخ و ئەوەی ڕاستیش بێ، هیچ زیادبوونێکی بەرچاو لەئارادانییە.» هەر چۆنێک بێ، ئەگەر ئەو ڕاستییە

---

التأسیسي)دا کەوا بڕیارلێدانی پەیماننامەی نێوان عیراق - بریتانیای دەخاتە ئەستۆی خۆی. بڕوانە: محمد مظفر الأدهمي، المجلس التأسیسي العراقي، الجزء الثاني، دار الشؤون الثقافیة العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص٥ و بەدواوە. (و.ع)

[١١٥] بۆ بینینی لیستی ناوی نوێنەرانی پەرلەمانی ١٩٢٥، بڕوانە:
Intelligence Report, No. 13 of 25.6.1925, PP. 4-7.

[116] Report of Administration for 1918, I, P. 201.

[١١٧] دینار هاوتای یەک پاوەندی ئیستەرلینییە.

* باجی کودە: باجێک بوو، دەوڵەتی عوسمانی لەسەر وشتر و مەڕوماڵات و مانگا وەریدەگرت. (و.ع)

[118] Great Britain, The Colonial Office; Report by H. B. M. G. to the L. of N. on the Administration of Iraq, April 1923-December 1924, p. 136.

ڕەچاوبکەین کە کشتوکاڵ یەکەمین پیشەیە لە عیراقدا و سەرچاوەی سامانە، زەحمەتە بڵێین: پێبەپێی بایەخەکەی، بەشداریی لە بودجەی دەوڵەتدا هەبووە. هەر ساڵی ١٩١٨ ڕێژەی باجی سەر زەویوزار گەیشتە ئاستی ڕێژەکەی لە ١٩١١ی ڕۆژگاری دەسەڵاتی تورکیدا. لە کاتێکدا باجی سەر زەویوزار لە ١٩١١دا، ٤٤,٣٪ی سەرجەمی دەرامەتەکانی پێکدەهێنا؛ لە ١٩٢٩دا تەنیا ٣٠٪، لە ١٩٢٠دا ٢٠٪، لە ١٩٢١دا ٢٧,٦٪، لە ١٩٢٦دا ٢٣٪ و لە ١٩٣٠دا ١١,٧٪ی لێ پێکهێنا. وەک لە خشتەی ژمارە ١، پاشکۆی ١دا سەرنجیدەدەین، قورساییی سەرەکی کەوتە سەر گومرگانە (ڕەسمی گومرک). هۆی کەمبوونەوەی بەشێکی کەمی دەرامەتی باجی زەویوزار لەو ماوەیەدا، ئەوە بوو کە هەم سەرۆکهۆزان و موڵکدارانیتری زەوی و جووتیاران حەزیاننەدەکرد و نەیاندەتوانی هاوکاریی دەسەڵاتدارانی باجگرتن بکەن بۆ خەمڵاندنی بەروبوومی کشتوکاڵی؛ هەم دەسەڵاتدارانی پسپۆڕیش شارەزایی و لێزانییان نەبوون و کادیری لێوەشاوە و مەشقپێکراو شکنەدەبرا و موڵکدارانی زەویی دانیشتووی شاریش حکوومەتیان هەڵدەپێچا و کاریاندەکردە سەر بڕیارلێدانی ئەم سیاسەتە. هەروەها دەکرێ هۆی ئەوە ببرێتەوە بۆ ئەو قەناعەتە سیاسییە ڕەچاوکراوانە کە داواکاری قایمکردنی جێپێی سەرۆکهۆز بوون. ئەم هەڵاواردنە لە باجدا، هەموو سەرۆکهۆزەکان ناگرێتەوە. سوودمەندانی سەرەکی لەم هەڵاواردنە، سەرۆکهۆزانی گەورەی لایەنگری حکوومەتن لە لیواکانی عەمارە و کووت. ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز لە عەمارە، ساڵی ١٩١٨ نووسیویە: «ئاشکرایە ئێستە سەرۆکهۆزەکان، بە هۆی هەرزانیی کرێی زەویوزارەوە لە ماوەی حوکمی ئێمەدا، لە ناز و نیعمەتی دەوڵەمەندیدان. سیاسەتێکی تایبەتی بەخشندەییمان پێڕەوکرد، کە سوودی هەبوو و خێری بۆ داینەوە، چونکە سەرۆکهۆزان پەلەیان بوو بەوپەڕی وزەیانەوە پارمەتیمانبدەن. بەڵام ئەوەی کە ئێمە بۆ سەرۆکهۆزانی کەمدەکەینەوە، ئەوان بە هەمان شێوە کەمیناکەنەوە بۆ جووتیاران و سەرکارانی خۆیان.»[١١٩] ئەنجامگیرییەکەیشی ئەمە بوو: «سیاسەتی پشتیوانیی سەرۆکهۆزانی گەورە، لەگەڵ بنەمای دابەشکردنی سامان و خۆشگوزەرانی ڕێکنایێتەوە. ئەگەر ئێستە حکوومەت ئەو بڕە پارانەی دەستبکەونەوە کە سەرۆکهۆزانی گەورە لە جووتیارانیان

---

[119] Reports of Administration fo 1918, I, p. 335.

وەردەگرن، لەبریی ئەو موڵکانانە کە لەو سەرۆکهۆزانەوە بەدەستیاندێنێ، دەوڵەمەندتردەبێ و هەزاران پاوەندی ئیستەرلینیی چنگدەکەوێ.»[120]

ئەم ئەفسەرە نائاساییە، لە راپۆرتێکی رۆژی ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠دا، هاتووەتەوە سەر هەمان بابەت و نووسیویە: «دەتوانین دەرامەتەکانمان، بەبێ وروژاندنی سەرۆکهۆزەکان خۆیان، زیادبکەین.»[121] لە تێبینییەکی ناو راپۆرتی ساڵی ١٩٢٤ی وەزارەتی موستەعمەرەکاندا سەبارەت بە دەرامەتەکان،[122] هۆی کەمبوونەوەی دەرامەتە کشتوکاڵییەکان وا روونکراوەتەوە کە «دەبێ واز لە سوودی چاوەڕوانکراوی دەرامەتەکان بهێنرێ لەبەر ئامانجی سیاسی، کە پارێزگاریی ناوەندی هێز و دۆستایەتیی سەرۆکهۆزەکان و هێشتنەوەیانە وەک گەورە موڵکداری زەوی.»

داوای دەرامەتەکانی زەویوزاری عەمارە لە ساڵی ١٩١٨دا گەیشتە ١,٥١٦,٠٠٠ رووپێ (واتە: ١١٣,٧٠٠ دینار)، لە ١٩٢٠دا ١,٥٩٢,٠٠٠ رووپێ (واتە: ١١٩,٤٠٠ دینار)، لە ١٩٢١دا ١,٧٧٣,٠٠٠ رووپێ (واتە: ١٣٢,٩٧٥ دینار) و لە ١٩٢٢دا ٢,١٤٠,٠٠٠ رووپێ (واتە ١٦٠,٥٠٠ دینار).[123] ئەم دەرامەتانە بە زۆر کەم دادەنرێن، بەتایبەت کە عەمارە بە یەکێک لە دەوڵەمەندترین لیواکانی عیراق دەژمێردرێ و زەوییەکانی ئەمیرین، واتە دەوڵەت خاوەنیانە. لە ١٩٢٢دا، بڕیاردرا موڵکانەی سەر سەرۆکهۆزەکان زیادبکرێ. ئەفسەرێکی ئینگلیز کە بەتایبەتی راسپێردرابوو لەم کێشەیە بکۆڵێتەوە، پاش لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی بابەتەکە، بۆی دەرکەوت: سەرۆکهۆزەکان دەتوانن لەو پارەیە کە ئەوکاتە دەیاندا، ٥٠٪ زیاتر بدەن.[124] بەڵام -سەرباری ئەوە- موڵکانەکانی پێشوو، بەهۆی دابەزینی نرخەوە، کەمکرانەوە بۆ نیوە. داواکەیش بەرزکرایەوە بۆ ٢,٦٧٦,٠٠٠ رووپێ (واتە ٢٠٠,٧٠٠ دینار)، بەڵام وێڕای زیادەی سادەی داواکە، هەر ٢,٢٢٦,٠٠٠ رووپێ (واتە ١٦٦,٩٥٠ دینار) بەدەستهێنرا. هۆی ئەوەیش گازندەی بێپسانەوە و

---

[120] Ibid., P. 336.

[121] Administration Report of the Amara Division for 1920-1921, P. 26.

[122] Great Britain, Colonial Office, Report on the Administration of Iraq, April 1923-Dicember 1924, P. 139.

[123] Reports of Administraion for 1918, I. p. 322 and Administration Report of Amare for 1920-1921, p. 13.

[124] Great Britain, Colonial Office, Report on the Administration of Iraq, April 1923 to December 1924, p. 139.

بەهاتوهاواری هێندێ سەرۆکهۆزی دەسترۆ و پاتکردنەوەی ئەو گازندانە بوون، لە چەند قۆناغێکی شلۆقی بڕیارلێدانی پەیماننامەی ئەنگلۆ-عیراقیدا،[125] کە هەلومەرجەکە بایەخێکی تایبەتی پێبەخشین. ئەنجامی ئەوەیش، چاوپێداگێڕانەوەی ئەم خەملاندنە و دابەشکردنی زیادە پێشنیازکراوەکەی ساڵی ١٩٢٣ بوو بە درێژیی پێنج ساڵی پێداچوونەوەی خەملاندنەکان، لەبەر هۆیەکی پێنەزانراو. تەنانەت ئەم پێداچوونەوەیەی خەملاندنەکانیش گۆڕدرا بە بڕیارێک، نرخی کرێی ساڵی ١٩٢٤ی سەر سەرۆکهۆزەکانی عەمارەی پێ کەمکرایەوە.[126] بەڵام کۆمیسێری باڵا لە ئەیلوولی ١٩٢٦دا ڕێی بە زیادەیەکی ساڵانە دا، بڕەکەی ٣٠٠,٠٠٠ ڕووپێ (واتە ٢٢,٥٠٠ دینار) بوو.[127] لەبەرئەوە هاوبەشیی عەمارە ساڵی ١٩٢٨ بڕی ٢,٥٧٩,٠٠٠ ڕووپێ (واتە ١٩٣,٤٢٥ دینار) بوو.[128]

هیچ زیادەیەکیش نەخرایە سەر باجی گەورە سەرۆکهۆزانی کووت. پێشتر ئاماژەمان بە هەوڵی ساڵی ١٩٢٢ی حکوومەتی مەلیک دا بۆ زیادکردنی داوای دەرامەتەکانی کووت تا ئاستی لیواکانیتر و ئینگلیزەکان ئەم هەوڵەیان پووچەڵکردەوە، چونکە ئەم کارە «گۆڕانکارییەکی گەورەی لەسەر دەستی ئەنجومەنی کەمشارەزای وەزیرانی لێدەکەوتەوە» و لەوانەبوو چەند سەرەنجامێکی زیانبەخشی بۆ چەند ناوچەیێکی هەستناکی خێڵەکی هەبێ.[129] خشتەی ژمارە ٢ی پاشکۆی ١، زانیارییەکمان سەبارەت بە وردەکاریی مامەڵەی لیوای کووت دەداتێ؛ زانیاریی تەواویش دەستناکەون، تا ڕێمانبدەن بەراوردێکی هەمەلایەنەی نێوان لیواکان بکەین. تەنیا کۆمەڵێک ژمارە لەبارەی دەرامەتەکانی ساڵانی ١٩١٨، ١٩٢٨ و ١٩٢٩ی زەویوزاری هەر چوار لیوای ناو خشتەکە لە بەردەستدان (بڕوانە: خشتەی ژمارە ٢، ستوونی ١ بۆ ٤، پاشکۆی

---

125 Ibid., p. 139.

126 Office of the High commissar, (Secret) Intelligence Report No. 20 of October 1924, Para 617.

127 (Secret) Intelligence Report No. 19 of 15 September 1926, Para. 578.

128 Government of Iraq, Ministry of Finance, Annual Report on the Operations of the Revenue Department for the Financial year 1928-1929 (Baghdad, Government Press, 1929, pp. 30-31.

129 Office of the High commissar, (Secret) Intelligence Report No. 15 of 1.8.1922, Para 699.

١). ئەم لیوایانە تەنیا بۆ بەراوردکردن دەستنیشانکران، چونکە کووت و عەمارە چەند سەرۆکایەتییەکی گەورەی هۆزیان تێدایە، لە کاتێکدا ژمارەیەکی زۆر موڵکداری بچووکی زەویوزار لە لیواکانی دیوانییە و دیالە هەیە. ساڵی ١٩٣٠ ژمارەی ئەو کەسانە کە خاوەنی ١-١٠٠ مشارە بوون،[130] لە دیوانییە ٨,٣٧٨ و لە دیالە ٤,٠٩٢ بووە.[131] بەڵام عەمارە ئەم جۆرە موڵکدارەی تێدانەبوو. لە کووتیش، هیچ ژمارەیەکیان لە ماوەی ساڵانی یەکەمی حوکمی پاشایەتیدا لەبارەوە چنگناکەوێ. کەچی ئاماری ساڵی ١٩٥٣ ئاماژەی بۆ هەبوونی ١٤٢ پارچەزەوی بەم ڕووبەرانە کردووە.[132]

ئەم لیوایانە، دیالە نەبێ، ناوچەی بە ئاوی سەرزەویی وەک ڕووبار و چەمەکان یا ئامرازی ئاوهەڵدان ئاودەدرێن. لە کاتێکدا پێنجیەکی زەوییە کشتوکاڵییەکانی دیالە، بە باران ئاودەدرێن و ئاودێریی ئەویتریشی بە ئاوی سەرزەوییە. دەکرێ بە زانینی ژمارەی ئاوهەڵکێش (ترومپا) کشتوکاڵییەکانی هەر لیوایەک، بزانین قەوارەی ئەو زەوییانە کە بە ئامرازەکانی ئاوهەڵدان ئاودەدرێن، چەندە (بڕوانە: خشتەی ژمارە ٢، ستوونی ١٠، پاشکۆی ١). هیچ ژمارەیەکیش سەبارەت بە ئەسپەتوان (القدرة الحصانية)ی ئەم ئاوهەڵکێشانە لەو ساڵە باسکراوانەدا نییە. دەبێ ئەم هۆیە لەبەرچاوبگیرێ، چونکە باج بەپێی شێوەی ئاودێری دەگۆڕێ و ئاودانیش بە ئامرازەکانی ئاوهەڵدان پەسەندترە (خشتەی ژمارە ٢، ستوونی ٩، پاشکۆی ١)؛ لە کاتێکدا تەنیا بەرهەمی ڕاستەقینەی کشتوکاڵیی ساڵانی ١٩١٨، ١٩٢٨ و ١٩٢٩ی ئەو چوار لیوایە، مادامێکی هیچ ژمارەیەکیان لەبارەوە نییە، دەتوانێ زانیارییەکی ڕوونمان سەبارەت بە ڕەچاوکردنی دۆستایەتی لە باجدا بداتێ. بەڵام ستوونی ٥ی خشتەی ژمارە ٢، پاشکۆی ١، شتێکی باشی لەخۆگرتووە و ڕووبەری زەویی بە کیلۆمەتری چوارگۆشە خەمڵێندراو و داچێندراوی ساڵی ١٩٣٠ دەخاتەڕوو.

---

[130] مشارە هاوتای ٢٥٠٠ مەتری چوارگۆشەیە.

[131] Ernest Bowson, An Inquiry into Land Tenure and Related Question, (Latch worth, England: The Garden City press, 1932) Table 1, p. 11.

[132] Government of Iraq, Report on the Agricultural and Livestock Census of Iraq 1952-1953, Table 89, p. 66.

ژمارەکان ئاماژەن بۆ ژمارەی پارچەزەوییەکانی موڵکی موڵکدار، نەک ژمارەی موڵکداران.

لەم ڕووەوە، شایانی سەرنجدانە کە گەورەیی ڕووبەری زەوییە داچێندراوەکانی کووت، بە ناچاری وا ناگەیێنێ بەرهەمە کشتوکاڵییەکەی گەورەترین بووە. لە ڕاستیدا، دیوانییە و عەمارەی دوو گرنگترین لیوای بەرهەمهێنانی چەڵتووک لە عیراق، لە کووت دەوڵەمەندترن. چەند ناوچەیەکیش لە دیوانییە هەیە، وەک شامییە و ئەبوسخێر (أبو صخير)، ناوچەی خاوەن کشتوکاڵێکی چڕوپڕن. ئەم مەسەلەیە، هێندێ بەشی دیالەیش دەگرێتەوە. هەرچەندە هەلومەرجی کشتوکاڵی لە نێوان ساڵانی بیست و چلدا گۆڕا، بەتایبەت لە عەمارە کە زیاتر هەژارکەوت، پاش ئەوەی هەر یەکە لە دیوانییە و عەمارە کەمتر بیرکرایەوە مەرەزەیان تێدا بکرێ و جۆیان لە گەنم زیاتر تێدا بەرهەمهێنرا، یەکەمین ژمارەکانی سەبارەت بە بەرهەمهێنان، ئەوانەن کە بۆ ساڵانی ١٩٤٨-١٩٥٠ تۆمارکراون و ستوونەکانی ١١-١٣ لە خۆیان گرتوون، تا وێنەکە تەواوبکەن. کاتێک بەراوردی دەرامەتە کەمەکانی ساڵی ١٩١٨ی زەویوزاری کووت دەکەین، دەبێ ئەوە ڕەچاوبکەین کە لیواکە ماوەی نێوان ئەیلوولی ١٩١٥ و مارتی ١٩١٧ شانۆی شەڕی نێوان هەردوو سوپای تورکی و ئینگلیزی بوو و ئەو زەوییە کشتوکاڵییانە، بە هۆی سەنگەرلێدان و بەستنی جۆگەکانی ئاوەوە، زیانیان بەرکەوت، ئەگەرچی ساڵی ١٩١٨ بە خێرایی چارەسەری زیانەکان کرا.[١٣٣] بەرامبەر بەوە، بەرهەمهێنانی ساڵانی ١٩١٧ و ١٩١٨ی چەڵتووک لە قەزای شامییەی دیوانییە، زۆر کەمبووەوە. ئەفسەری سیاسی لە شامییە نووسیویە: «پێش ئەوەی دەست بەسەر عیراقدا بگرین، بەرهەمهێنانی چەڵتووک گەیشتە ٩٠,٠٠٠ تەن. ساڵی یەکەمی حوکمی ئێمە ١٩١٧، بەرهەمەکە گەیشتە ٦٠٠ تەن و ساڵی دوایی (١٩١٨)ش ٢٠,٠٠٠ تەن.»[١٣٤] هۆی سەرەکیی ئەوە، ئەو ڕێوشوێنە بوو کە ئینگلیزەکان لەبەرڕۆیشتنی ئاوی بەنداوی هیندییەیان پێ ڕێکخست. پلانی تورکی ئەوە بوو، ئاوی فورات بکرێتەوە بۆ لقی شامییە لە هاویندا و بۆ لقی حللەیش لە زستاندا. ئەمە بەرهەمهێنانی دوو بەروبوومی دابیندەکرد؛ لە کاتێکدا ئینگلیزەکان ڕێگەیەکی تازەیان لە ١٩١٧دا هێنایە ناوەوە، کە ئاو لە ماوەی بەکارهێنانی بەنداوەکەدا بە نۆرە دابەشبکرێ، حەفتەیەک بدرێتە شەتاوی شامییە و حەفتەی دوایی بە

133 Reports of Administration for 1918, I, P. 337.

134 Ibid., p. 78.

شەتاوی حلله و بەم شێوەیە. «ڕاستییەکەی، دابەشکردنی ئاو بە نۆرە، بە شێوەیەک بوو کە هەشت ڕۆژ دەدرا بە شەتاوی حلله و شەش ڕۆژیش بە شەتاوی شامییە. هەموو جارێکیش کە نۆرەی شەتاوی شامییە دەهات، تەنیا بڕێکی پشکەکەیی لێ‌دەدرا. ڕەنگە هۆی ئەوە پێویستیی هات‌وچۆ و گواستنەوەی ناو شەتاوی حلله بووبێ»[135] (لەوانەیە ئەوە هۆیەکی کارەساتی ئەوەبەدوا بێ، کە خۆی لە ڕاپەڕینی ۱۹۲۰ی فوراتی ناوەڕاستدا نوواند دژی ئینگلیزەکان).

هەر چۆنێک بێ، دەرکەوت دیوانییە لە ۱۹۱۸دا بارێکی قورسی باجی، لەچاو عەمارە و کووتدا، کەوتبووە سەر. بە چاوپۆشین لە هەموو بنەمایەکی ڕەچاوکراوی سیاسی، مامەڵەی دیوانییە لە مامەڵەی عەمارە و کووت جیاوازبوو. سەرۆک‌هۆزەکان لە عەمارە پشکی دەوڵەتیان لە زەوی‌وزاری میری کردە کشت‌وکاڵ و لە کووتیش ڕێژەی دەرامەتەکانی زەوی‌وزار لە ۲۵٪ی تێ‌نەدەپەڕاند، کەچی لە دیوانییە گەیشتە نزیکەی ۳۰٪ (خشتەی ژمارە ۲، ستوونی ۸- پاشکۆی ۱). وا دیارە ئەم جیاوازییانە وەک درێژکراوەی کارێکی بەجێهێنراوی پێشوو دەرکەوتن، «بە ڕێکەوت ڕووی دا، نەک بە پلانێکی پێش‌وەخت.»[136] ئەوە بەپێی قانوونی ٤٢ی ساڵی ۱۹۲۷، سەپاندنی ڕێژەیەکی یەکگرتووی بەسەر هەموو زەوییەکاندا بەدواداهات (خشتەی ژمارە ۲، ستوونی ۷، پاشکۆی ۱). عەمارە لە ۱۹۲۸دا بەشدارییەکی بەرچاوی لە دەرامەتەکانی دەوڵەتدا هەبوو، بەڵام کە دەرامەتی زەوییەکانی لەگەڵ زەوییەکانی دیوانییە یا دیالە یان کووت بەراوردەکەین، دەبینین سەرجەمی زەوییەکانی عەمارە زەوی‌وزاری میرین، لە کاتێکدا ۳۸٪ی زەوییەکانی دیوانییە لە ۱۹۳۰دا کە زەویی موڵکی تایبەتی لە تاپۆدا تۆمارکراوی تاکەکەسانن، دەبوو ڕێژەیێکی کەمتری دەرامەتەکان بدەن (ستوونی ٦، ۷، ۸ی خشتەی ژمارە ۲، پاشکۆی ۱ بەراوردبکە). بە هەمان شێوە، دەبینین ۳۰٪ی زەوییەکانی کووت بە موڵکی تایبەت لە تاپۆدا تۆمارکراون، لە کاتێکدا ڕێژەکە لە دیالە ۹٦٪ بوو. ئەمانەی سەرەوە ڕوونی‌دەکەنەوە کە کووت پشکی خۆی لە دەرامەتەکان نەداوە بە حکوومەت و لە ڕاستی‌دا هەرچییەکی داوە، لە ٤٧۱,۰۰۰ ڕووپی (۳٥,۳۲٥

[135] Ibid., p. 79.

[136] Great Britain, Colonial Office, Report on the Administration of Iraq, April 1923 to December 1924, p. 137.

دینار)وە لە ١٩١٨دا کەمبووەتەوە بۆ ٣٤٨,٠٠٠ ڕووپی (٢٦١,٠٠٠ دینار) لە ١٩٢٨دا. بەڵام کووت لە ١٩١٨دا گەنمی بە بەهایەکی زیاتر لەم ژمارانە داوە، کەچی دیوانییە لە پشکە داراییە بڕیارلێدراوەکەی خۆی کەمتری داوە و کووت پشکێکی کەم و دیوانییەیش زیاتری داوە. هۆی ئەوە، تایبەتمەندیی نیزامنامەی باجدانە. دەرامەتەکانی زەویوزاری کووت و دیوانییە لە ١٩١٨دا، وەک بەرهەمی کشتوکاڵی کۆکرانەوە و پاشان بەپێی نرخەکانی ئاڵوگۆڕپێکردن کە دەسەڵاتدارانی دارایی دیارییانکردن، کران بە دراو. نرخەکانی ئاڵوگۆڕپێکردنیش لە لیوایەکەوە بۆ لیوایەکیتر دەگۆڕێن (بڕوانە: خشتەی ژمارە ٣، پاشکۆی ١) و لە ڕووی تیۆرییەوە پشت بە تێکڕاکانی نرخی کۆی بازاڕی ناوخۆ دەبەستن. نرخ لە لیوا جیاجیاکاندا جیاوازە، لەبەر ناجۆریی هەلومەرجی خستنەبازاڕ (تسویق) و ناچوونیەکیی پێوەندییەکانی گەیاندنی ناوخۆ. ڕێیشیتێدەچێ چەند بنەمایتر لەئارادابن، نەخشیان لە چەسپاندنی نرخەکانی ئاڵوگۆڕپێکردندا هەبێ. هەرچۆنێک بێ، (خشتەی ژمارە ٤، پاشکۆی ١) زانیارییەکی وردمان سەبارەت بە بەشداریی لیوا جیاوازەکان لە دەرامەتەکانی دەوڵەتدا دەداتێ. لە کاتێکدا ئەم مشتومڕە درێژخایێنە سەبارەت بە دۆستایەتی لە باجدا، ئەنجامێکی وردی بەدەستەوەنەداوە، بەڵام هەلێکی بۆ ڕەخساندووین تا زیاتر سەبارەت بە نیزامنامەی باجدانی وڵات بزانین. هەروەها سەرۆکهۆزەکان، لە مەسەلەی باجدا، بە چەند شێوەیەکیتر زیاتر پەسەندکران؛ داهاتی خۆیان و داهاتی موڵکدارانیتری زەوی، لە باجی داهات بەخشران،[137] تا ١٩٢٧، باجی موڵکایەتیی خانووبەرەیان نەدا.*

ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق سەرەتای ١٩٢٥ هەوڵی دا باجی موڵکایەتیی خانووبەرە بخاتە سەر ئەو شار و گوندانە کە ژمارەی بینایان لە ٥٠ پترە و ئەو موڵکایەتییانەی خانووبەرەیش کە بۆ مەبەستی بازرگانی بەکاردەهێنرێن. مادامێکی ئەم پێوانەیە کارناکاتە سەر ئەو جووتیارانە کە لە کۆختەی

---

[137] بڕوانە: خشتەی ژمارە ٨ی قانوونی باجی داهات و دەقی قانوونەکەیش لە بریتانیا.
Report by H. B. N. G. to the L. of N. on the Administration of Iraq for 1927, P. 189.

* باجی داهات ڕاستەوخۆ بەسەر کەسان و کۆمپانیاکاندا دەسپێندرێ و باجی خانووبەرەیش، باجێکی بەرەوژوورە، لە کاتی فرۆشتن یا بەکرێگرتندا دەخرێتە سەر بەهای موڵک و خانووبەرە. (و.ع)

لەقوڕدروستکراودا دەژین، ڕوون‌نییە ئاخۆ بۆچی کۆمیسێری باڵا پێی وابووە ئەمە دەبێتە هۆی پەلهاویشتنێکی بێ‌ئەندازەی باجسەپاندن و دەرگا دەخاتە سەرپشت بۆ سەرکوتکاری و چەوساندنەوە؟! بەم پێیە داوای لە مەلیک کرد سزاکان نەخرێنە ناو ئەم پرۆژەی قانوونە.[138] لەوانەیە کۆمیسێری باڵا بیری لەوە کردبێتەوە کە سەرۆکهۆز -وەک نەریتی بەتوندی پێڕەوکراوی بە درێژیی ڕۆژگار- ئەم بارە گرانە دەخاتە سەر شانی جووتیار.

ئەو ڕێگەیەی‌تر کە جێ‌پێی سەرۆکهۆزی پێ قایمکرا، نیزامنامەی کۆمەک و دیاریی نەختینە بوو. ئەوە لەگەڵ سەرۆکهۆزانی کەم‌دەرامەت و بەتایبەت سەرۆکهۆزانی هۆزە دەشتەکییەکان، جگە لە موڵکدارانی زەوی، بەجێ‌هێنرا. هیچ ژمارەیەکمان سەبارەت بە قەوارەی کۆمەکە پێشکەشکراوەکان لە سەرتاسەری وڵاتدا بەدەستەوەنییە، ساڵی ١٩٢٦ نەبێ کە کۆمەکەکانی تێدا لەگەڵ قەوارەی کۆمەکی دڵفراوانانەی ساڵانی پێشوو بەراوردناکرێن. ئەو ساڵە کۆمەکەکان خۆیان دا لە ٣٩٦,٠٠٠ ڕووپێ (٢٩٧,٠٠٠ دینار). هەر عەجیل یاوەر خۆی کە سەرگەورەی سەرۆکانی هۆزی دەشتەکیی شەمەر بوو، ١٦٨,٠٠٠ ڕووپێ (واتە ١٢٦,٠٠٠ دینار) و فەهد کوڕی هوزالی سەرۆکی هۆزی دەشتەکیی عەنزەیش ١٤٤,٠٠٠ ڕووپێ (١٠٨,٠٠٠ دینار)ی وەرگرتووە؛ لە پاداشتی خزمەتە پێشکەشکراوەکانیان‌دا و تا بیشتوانن ڕێگەکانی وشکانی بپارێزن لەو ڕاوڕووتە کە هەر خۆیان دەیانکرد.* تا ئەو ساڵە و ساڵانی دواییش، هیچ ڕێ‌وشوێنێکی‌تر بۆ خستنەژێرڕکێفی سنوورەکانی باکوور و باکووری ڕۆژاوا دانەنرا. بەم پێیە کۆمیسێری باڵا سووربوو بریاری ڕۆژی ١٢ی کانوونی دووەمی ١٩٢٦ی پەرلەمانی عیراق سەبارەت بە بڕینی پارەی

---

138 (Secret) Intelligence Report No. 12 of 11.6.1925, Para 261.

* سەیروسەمەرە لە دەوڵەتی نوێی عیراقدا ئەوەیە کە دەرکەوت هێندێ هۆزی دەشتەکی درێژەیان بە نەریتی پێشووی ڕێگری و تاڵان و ڕاووڕووت داوە، کەچی حکوومەت هەوڵی‌داوە دیاریی نەختینە بداتە سەرۆکهۆزەکانیان، یا ڕازی‌بووە تا ماوەیەکی کورت درێژەبدەن بەو کارە. بۆ وردەکاری لەبارەی خێڵاتی عیراقەوە لەو ماوەیەدا، بڕوانە: عمار یوسف عبدالله عويد العگيدي، السياسة البريطانية تجاه عشائر العراق ١٩١٤-١٩٤٥، دکتۆرای کۆلێجی پەروەردە، زانکۆی مووسڵ، ٢٠٠٢. (و.ع)

تەرخانكراوی سەرۆكهۆزەكان هەڵوەشێنێتەوە.[١٣٩] هێندێ سەرۆكهۆز قەناعەتێكی بێچەندوچۆنیان لا پەیدابوو كە ئەم دیارییانە مافێكن، بە میرات بۆیان بەجێماوە.

جارێكیان هەندێ سەرۆكهۆز دەوری نوێنەری حكوومەتیان دا لە شەتاوی دەغارە، داوایان لێكرد پارەیان بداتێ، تا ئاسایش و ئاشتیی ناوچەكە بپارێزن. كە ڕازینەبوو داواكانیان بەجێبێنێ، پیاوەكانیان هیچ دەرفەتێكیان نەدایێ بحەوێتەوە، كەوتنە سەمای جەنگ، یا هۆسەكێشان لە سەربان و ئەملاوئەولای بارەگاكەی، تا پارە داواكراوەكە بدا! زۆری سەرۆكهۆزەكان كە بە تێپەڕینی كات ملیان بۆ دەسەڵاتەكانی قایمقام كەچكرد، بە تاسەوە یادی ئەو ڕۆژە گەشاوانەیان دەكرد كە ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز دیاریی بەسەردا دەباراندن. پاش ئیمزاكردنی پەیماننامەی ١٩٣٠ی ئەنگلۆ-عیراقی، ٢٥ سەرۆكهۆزی لیوای مونتەفیک چاویان بە پشكنێری كارگێڕیی بریتانیا كەوت. باسی كاروباری گشتییان كرد، تا یەكێكیان پێشنیازی بۆ كردن یەكیان لەگەڵ پشكنێر بمێنێتەوە و ئەوانیتر لە دەرەوە چاوەڕوانبن. شێخ مونشید حەبیبی نوێنەری پەرلەمانی عیراق و سەرۆكی خێڵی غززی، بە پشكنێری ڕاگەیاند: هەموو سەرۆكهۆزەكان چارەی حكوومەتی عیراقیان ناوێ و حەزدەكەن بچنە ژێر سایەی حوكمی ڕاستەخۆی ئەفسەرانی ئینگلیز. كە هۆیەكەی لێپرسرا، وا وەڵامیدایەوە: سەرۆكهۆزەكان لە ڕۆژانی حوكمی پێشووی بریتانیادا پێویستیان بە یارمەتی بووایە، دەستبەجێ یارمەتیدەدران؛ «یارمەتییەكانیش بریتیبوون لە كەمكردنەوەی باج و دانی پارەیەكی تەرخانكراوی مانگانە و دیاریی نەختینە.»[١٤٠]

٥. ڕەنگە هەردوو سەرۆكی هەموو هۆزە دەشتەكییەكانی شەمەر و عەنزە، زۆرترین ئیمتیازیان لە ماوەی ئینتیدابدا دەستكەوتبێ. ئەوانە، نەک هەر زۆرترین بڕی یارمەتییان وەرگرت، بەڵكوو سەرۆكهۆزی شەمەر مافی وەرگرتنی باجی سەر

---

[139] Ibid, and Intelligence Reorts No. 7 of 1.4.1926 and No. 11 of 27.5.1926 para 186 and 328 respectively.

[١٤٠] لە نامەیەكی ڕۆژی ١٧ی حوزەیرانی ١٩٣٠ی پشكنێری كارگێڕیی ناسرییە E. S. Berryدا بۆ ڕاوێژكاری وەزارەتی ناوخۆ، كە لە فایلی ژمارە ٢٢٧٢ی ڕائید Milkinدایە، بە ناونیشانی "ناڕەزایەتی لە ناوچەكانی فوراتی خواروو."

کاروان و ئوتومبیلی ڕێگەی ڕوو بە سووریایشی هەبووە، کە سەرانە (خاوە)ی* پێ‌گوتراوە و ڕێیش بە هیچ یەکێکی شەمەر یا عەنزە نەدەدرا، بە مۆڵەتی نووسراوی سەرۆک‌هۆزەکەی نەبێ، هیچ شتێک لە شار بکڕێ؛[141] پاش دانی بارانە (ڕەسمی بار)یەکی دیاریکراویش کە بڕەکەی یەک مەجیدی بووە[142] بۆ هەر بارێکی وشتر، ئەمجا ڕێی پێ‌دراوە بڕوا. کۆمیسێری باڵا تا چ ڕادەیێک ئامادەبووە سیستەمی خێڵەکی بپارێزێ؟ ئەمە، ڕێنوێنیی ڕۆژی ٢٤ی ئابی ١٩٢٥ی بۆ حکوومەتی عیراق ڕوونی‌دەکاتەوە، کە ڕێ لە هێرش و پەلاماری نێوان شەمەر و عەنزە نەگیرێ، چونکە سەرۆکی هەردوو هۆزەکە نارەزاییان دەربڕیوە و گوتوویانە: ئەگەر ڕێ بە هۆزەکانیان نەدرێ خەریکی هێرش و پەلاماری ئاسایی خۆیان بن، ناتوانن هۆزەکەیان بە یەکگرتوویی بهێڵنەوە و زۆربەیان کۆچ‌دەکەن بۆ بیابانی سووریا؛[143] لەبەرئەوە نابێ دەست لەم هێرش و پەلامارانە وەربدرێ. ئەوە گەلەکۆمەی چەندین پەلاماری ڕێ‌پێدراوی بەدواداهات و ئەوەندەی نەبرد گەیشتە ناوچە کشت‌وکاڵی و ناخێڵەکییەکان.[144] ئابی ١٩٢٦یش پاشەگەردانییەکی بەدواداهات، بەهۆی کۆمەڵێک ناکۆکیی خوێناویی دڕندانەوە، کە بەرکەوتووانی هەردوو لای بە قورسی تێدا پێکران. دۆخی پەلاماری نێوان هۆزە ڕێ‌پێدراوەکان، هەموو ناوچەکانی عیراقی گرتەوە. ئازادیی جێگۆڕکێی لایەنە پەلاماردەرەکان، زۆری پیاوانی هۆزەکانی‌تری بە شێوەیەکی تایبەت بەکێش‌کرد، وەک پیاوانی هۆزی دلێم کە زۆریان چوونەپاڵ لایەنە ناکۆکەکان.[145] ئەوەیش کۆتاییی پڕمەرگەساتی ئەو سیاسەتە بوو کە هیچ بەهانەیەک هەڵناگرێ.

---

* خاوە: باجێکی زۆرەملێیە، یا باجی دارایی یان شتومەکە، خێڵات لەو کاروان و ئوتومبیلانەی وا بە زەوی‌وزاریان‌دا تێ‌دەپەڕن، وەردەگرن. ئەوە ئەنجامێکی بێ‌هێزیی دەوڵەتی عوسمانی و باڵادەستیی ڕێ‌وشوێنی خێڵەکییە. (و.ع)

141 Intelligence Report No. 15 and 21 of 1.8.1922, Paras 710 and 1060 respectively.

١٤٢ مەجیدی، دەکاتە ١٩ قرۆشی ئاڵتوونی و سەد قرۆشیش دەکاتە یەک لیرەی تورکی و ١١٠ لیرە دەکاتە ١٠٠ پاوەندی ئیستەرلینی.

143 Intelligence Report No. 18 of 3.9. 1925, Para 475.

144 Ibid, No. [?] of 1.10.1925, para 575.

145 Intelligence Report No. 16 of 3.8.1926, Para 487-491.

**ئەنجامگیری**

ئەم سیستەمە سەرۆکایەتییە نیمچە دەرەبەگییە بە ڕواڵەت سەیروسەمەرە باڵادەستەی هۆز لەو ماوەیەدا، هێزی خۆی لە چالاکی یا جۆشوخرۆشی ناوەکیی خۆی وەرنەدەگرت، بەڵکوو ژیانی بە شێوەیەکی دەستکرد لە ڕێگەی هێزێکی دەرەکییەوە، کە بەرژەوەندی لە بەردەوامیی ئەودا هەبوو، پێدەبەخشرا. ئیتر سەرۆکهۆز، لەبەر ئارەزووی دەسەڵاتدارانی بریتانیا و پشوودرێژییان لەگەڵی، نەک پشت بە دەستڕۆیی خۆی یا ویست و لایەنگریی پیاوانی هۆزەکان، حوکمیدەکرد. ئەو، قانوونە خێڵەکییەکانی خۆی هەبوون و تەنانەت ڕێگە یا مەودای بەجێهێنانی ئەم قانوونانەیشی بۆ دانرابوون؛ چونکە قانوونی ناکۆکیە خێڵەکییەکان کە هەموو پێوەندییە خێڵەکییەکانی ئەو قۆناغەی هەڵدەسووڕاند، ڕەنگدانەوەی ویستی ئەو نەبوو، بەڵکوو بە فەرمانی سەرکردایەتیی ئینگلیز خرابووەکار. لەبەرئەوە، سیستەمی تازەی نیمچەدەرەبەگی* لە عیراقدا، بە سیستەمێکی دەستکرد دادەنرێ.

ئینگلیزەکان لێبڕاوانە کەوتنەخۆ سەرۆکهۆز بخولقێنن و بەهێزیبکەن، بەڵام بوونی ئەوان جێوڕێی ئەمی هەڵتەکاند، لەبەرئەوەی ئەوان سیستەمێکی باڵاتر و ئاسایشێکی زیاتر و پێوەندی و گەیاندنێکی باشتریان بەدیهێنا، کە سەرجەمیان لەگەڵ چەند هۆیەکیتر -لە ڕوانگەی جووتیارەوە- کارێکیانکرد سەرۆکهۆز و هۆزەکەی ببنە دوو شتی ناپێویست. جارێکیتریش شاراوەنەبوو لە جووتیار وەک تاکێکی ڕۆڵەکانی خێڵات، کە ئەفسەری سیاسی و پاشتر پشکنێری کارگێڕیی ئینگلیز لە سەرۆکهۆزەکەی بەهێزتر و دەستڕۆترن، بەتایبەت لە دۆخی هۆزە بێهێزەکاندا کە سەرۆکەکانیان -وا باوبوو- لەبەر هیچوپووچترین هۆ لادەبران و کەسیتر شوێنیان دەگرتنەوە. هەموو ئەوانە جێپێی سەرۆکهۆزیان لەقکرد و وایان لێکرد وەک بریکاری فەرمانبەرە بیانییەکە، نەک سەرکردەی پیاوەکانی خۆی، دەربکەوێ.

مایەوە ئەم پێکدادانە ئاشکرایە ڕوونبکەینەوە. ئەگەر -وەک پێشتر ڕوونمانکردەوە- جێوڕێی سەرۆکهۆز پشتی بە بوونی ئینگلیز بەستبێ، بۆچی

---

* پێشتر باسمانکرد توێژەوەرەکان لەسەر ناونانی سیستمی خێڵەکی لە عیراق، بە دەرەبەگی یا نیمچەدەرەبەگی، ناکۆکن. لەبەرئەوەی سیستەمەکە هەردووکی لێکداوە، هەندێک ناوی سیستەمی نیمچەدەرەبەگیی لێناوە، لەوانە حەننا بەتاتوی توێژەرەوە، کەچی هەندێکیتر ناوی سیستەمی نیمچەخێڵەکیی بەسەردابڕیوە. بڕوانە: طلعت الشیباني، واقع الملكیة الزراعیة في العراق، بغداد، ١٩٥٨. (و.ع)

جێوڕێیەکەی هەرەسی‌نەهێنا و هێزەکەی لە بناغەوە هەڵنەتەکی؟ بەڵکوو بە پێچەوانەوە، هێزەکەی پاش کۆتاییهاتنی باڵادەستیی ناوخۆی ئینگلیز لە ١٩٣٢دا، ڕووی لە زیادی کرد!

## باسی شەشەم

## زەوی، بنچینەی دەسەڵاتی سەرۆکهۆز

### بنەڕەتی موڵکایەتیی تایبەت و نیمچەتایبەت لە دێهات

بە کرانەوەی بازاڕی جیهانی لە بەردەم بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیی عیراقیدا، لە دوایین چارەکی سەدەی نۆزدەهەمدا، زەوی بووە بڕبڕەی پشتی سەرۆکایەتیی هۆز. سەرۆکهۆز بەبێ زەوی، لە ڕاستیدا، سەرۆکێکی بێهۆز دەگەیێنێ. ئەو سەرۆکهۆزەی کە زەویی نییە، هۆز نە ڕێزی لێدەگرێ و نە تاکەکانی ملکەچیی دەکەن؛ چەندە ببێتە خاوەنی زەویوزارێکی بەرفراوان، ئەوەندە بەهای کۆمەڵایەتیی زیاددەکا. ئاکامێکی زیاتر چاوبڕینە زەوی، وەک پێشتر سەرنجمان دا، زەوتکردنی زەویی هاوبەشی هۆز بوو لە لایەن سەرۆکهۆزەوە، کە تاکەکانی هەمان مافی سەرۆکهۆزیان تێدا هەیە، بەڵام ئەو دەیانکاتە وەرزێری کرێگرتەی ئەو زەوییانە. ئاکامێکیتر کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا کەوتەڕوو، تەشەنەکردنی دیاردەی دەستگرتنی سەرۆکهۆزان بوو بەسەر زەویوزاردا. ئەفسەرێکی سیاسیی ئینگلیز ڕاپۆرتێکی بۆ بەجێهێشتووین، وەسفێکی زیندووی ئەم ڕەفتارە لای سەرۆکهۆزان پەسەندەی ئەو ڕۆژگارەی تێدا کردووە و نووسیویە: «پێمان دەڵێ: شێوازی باوی دەستبەسەرداگرتنی زەویوزار، دروستکردنی چەند بورجێکە لە شوێنێکی ستراتیجیی ئەو زەوییەدا کە دەیەوێ زەوتیبکا. ئەم بورجانە بە شەو دروستدەکرێن، پێشتر خۆی بۆ مەڵاسدەدەن و ئامادەکاریی بۆ دەکەن و هەموو کەرەستەکان دەگوازنەوە بۆ شوێنەکە. خاوەنی کاتیی ئەم زەوییە کە بورجەکانی لەسەر بنیاتنراون، بەیانی دەبینێ بووە بە قوربانیی دەستدرێژیی دراوسێ هەرە دڕندەکەی. هەنگاوی دوایی، یا هەوڵی وەدەرنانی دەستدرێژیکەر دەبێ کە بە خڕکردنەوەی هەردوو هۆز بۆ شەڕ دەبڕێتەوە، یان بە کشانەوە لە زەوییەکە، تا هەلێکی گونجاوی باشتر هەڵدەکەوێ بۆ تێشکاندنی دەستدرێژیکەر و بەدەستهێنانەوەی زەوییەکە.»[١٤٦]

---

[146] Reports of Administration for 1918, I, p. 362.

دەستبەسەرداگرتنی زەویوزار لە سەدەی بیستەمدا، بە چەندین شێوە بەردەوامبوو و ئەوە بە درێژیی ماوەی حوکمی پاشایەتی لە عیراقدا، شەقڵێکی هەڵاواردەی دێهات بوو. نەک هەر سەرۆکهۆزەکان، بەڵکوو وەزیر و ئەندامانی پەرلەمان و تەنانەت بنەماڵەی مەلیک خۆیشی، تێوەگلان و خەریکی ئەم کارە بوون. لێرەدا چەند دۆخێکی تۆمارکراوی ناو بەڵگەنامە حکوومییەکان، لەم بارەیەوە دەهێنینەوە. ساڵی ١٩٢٨ موڵکایەتیی مەڵبەندی بوغەیلەی کووت دەرهێنرا لە چنگی هەردوو خێڵی چەلەبی و ئالهاشم، کە لە سەردەمی عوسمانییەوە خاوەنی بوون؛ ڕووبەرەکەی لە ٢٠,٠٠٠ مشارە (واتە ١٢,٤٠٠ ئەکر) زیاتربوو، بەبێ موڵکانە بە تاپۆ بەخشرا بە مەلیکی پێشوو، عەلیی باوکی عەبدولئیلای سەروەسێت. بۆ جەختکردنەوە، بڕگەی چەند ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوە دێنینەوە، پشکنێری کارگێڕیی ئینگلیز لە کووت نووسیویە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە: «ڕاپۆرتی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٣٠ لەبارەی کووتەوە، ڕۆژی ١٩٣٠/٢/١١، لاپەڕە ٢:

هەردوو خێڵی چەلەبی و هاشم خاوەنی مەڵبەندی بوغەیلە بوون بە لەزمە. مافی سەر ئەم مەڵبەندەیان لەدەست دا، کاتێک بە تاپۆ بەخشرا بە مەلیکی پێشوو، عەلی...»

«ڕاپۆرتی مانگی شوباتی ١٩٣٠ لەبارەی کووتەوە، ڕۆژی ١٩٣٠/٣/١٠:

لاپەڕە ٢: ئەمە بەبێ باسکردنی بەخشینی مەڵبەندی بوغەیلە بە مەلیکی پێشوو، عەلی، لە ١٩٢٨دا، سەرباری ئەوەی کە مافی لەزمەی هەبوو.»

لاپەڕەکانی ٧-٨: چەندین داوای دەرامەت لە قەزای سوێرەی شاری کووت هەن.. مەلیکی پێشوو، عەلی، قەرزەکەی دەوڵەتی نەداوەتەوە کە بڕەکەی ٦٠٠٠ ڕووپییە. ئەمە جێی داخە، چونکە نموونەیەکی خراپ دەخاتە بەرچاو. جگە لەوە کە نەگوتراوە: حکوومەت زەوییەکی ڕووبەر ٢٠,٠٠٠ مشارەی لە زەوییە پلە یەکەمەکان بە خۆڕایی پێبەخشیوە.»

ئەو سەرۆکهۆزە کە هەموو تەقەلایەکی خۆی تەرخانکرد بۆ دەستدرێژیکردنە سەر زەویی دراوسێیەکانی و زەویی دەوڵەتیش، مووحان خەیروڵای سەرۆکهۆزی شوەیلات و نوێنەری چەند جارێکی لیوای مونتەفیق بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران.*

---

* شێخ مووحان خەیروڵا بە خاوەنی ڕووبەرێکی گەورەی زەویوزار لە مێژووی عیراقدا دەمێنێتەوە، لە کاتێکدا حەننا بەتاتوی توێژەرەوە لە کتێبەکەیدا (عیراق، کتێبی یەکەم) نووسیویە: «موڵکەکانی ئەم سەرۆکهۆزە ساڵی ١٩١٩ لە ٦٠ هەزار دۆنمی تێپەڕاندبوو. بەڵام ساڵی ١٩٤٩، پاش ئەوەی لە

خێڵی ئەم سەرۆکهۆزە لە ١٩١٩دا زەوییەکی سەر رووباری غەرافی ڕەنێودێنا، ١٠ میل درێژ و ٦ میل میلیش پان[١٤٧] و ڕووبەری ڕەنگبوو بگاتە ٦٠,٠٠٠ مشارە (٣٧,٠٠٠ ئەکر). لە ١٩٤٩دا، لە نووسراوێکی ڕەسمیی بەڕێوەبەری ناحیەی قەلعەی سوکەر (قلعة السكر)دا نووسراوە: ئەم سەرۆکهۆزە دەستی بەسەر پتر لە ملیۆنێک مشارە زەویدا گرتووە. موتەسەڕیفی لیوا لە نووسراوێکی ڕۆژی ١٩٤٨/١٢/١٢دا بۆ وەزارەتی ناوخۆ، ڕوونیکردووەتەوە -لایەنی کەم- شەش سەعاتی پێچووە تا بە زەوییەکانی ژێر دەستی ئەم سەرۆکهۆزەدا تێپەڕیوە، کە هەر بەشێکی بچووکی لێداچاندووە. داوایشیکردووە ڕێوشوێنی پێویست بگیرێتەبەر، تا لەم پیاوە قەدەغەبکرێ دەستدرێژی بکاتە سەر زەوییەکانی دەوڵەت.[١٤٨] لەوەناچێ هیچ ڕێوشوێنێک سەبارەت بە نامەکەی موتەسەڕیف گیرابێتەبەر. بیستودوو سەرۆکهۆزی عبوودە و بەنیزەید و ئەلبوسەعد و بەنیڕوکاب و قەرەغۆل و لە شوەیلاتیش، خێڵی مووحان خەیروڵا خۆی، لە سکاڵانامەیەکی ساڵی ١٩٤٩دا بۆ عەبدولئیلا گازندەیانکردووە و گوتوویانە: ئەم شێخ مووحانە مەڵبەندەکانی حمێرییە و هوتامات و زەوییەکانی عگێڵی لە چنگی خاوەنەکانیان دەرهێناون و ئەوەیشی بە هاوپەیمانی لەگەڵ هەم سەید عەبدولمەهدی،* کە چەند جارێک بوو بە

---

ئەنجومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایەتیدا بە نوێنەری مونتەفیک دانرا، بە پەلهاوێشتن بۆ زەویوزاری خەڵکانیتر، بوو بە ملیۆنێک دۆنم. چەند ڕاپۆرتێک نووسیویانە: ٢٢ سەرۆکهۆزی بچووکی عبوودە، کینانە، بەنوزەید، ئەلبوسەعید، بەنوڕوکاب و قەرەغول و تەنانەت شوەیلاتیش ساڵی ١٩٤٩ سکاڵای خۆیان بردە لای عەبدولئیلا، لەسەر ئەوەی کە شێخ مووحان دەستی بەسەر زەوییەکانیاندا گرتووە. شێخ مووحان خەیروڵا ڕۆشنبیر بوو و سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی عیراقیی خێڵە عیراقییەکانی دەکرد بۆ پشتیوانیی فەلەستین. ساڵی ١٩٥٦، پێش شۆڕش مرد. کە مەلیک فەیسەڵی دووەم و میر عەبدولئیلا ساڵی ١٩٥٣ سەریان لە مونتەفیک دا، لە کۆشکەکەی ئەو نیوەڕۆژەیانکرد» بڕوانە: حنا بطاطو، العراق، الكتاب الأول، ص١٣٩. (و.ع)

[147] Administrative Reports of Muntafig Division for 1919, p. 110.

[١٤٨] نووسراوی ژمارە ٦ی ڕۆژی ١٩٤٩/٤/٢٠ی بەڕێوەبەری ناحیەی قەلعەی سوکەر بۆ قایمقامی قەزای ڕوفاعی و وێنەیەکیشی بۆ وەزارەتی ناوخۆ نێردراوە. نووسراوی ژمارە س/٥٢٢ی ڕۆژی ١٩٤٨/١٢/١٢ی موتەسەڕیفیش. بڕوانە: عبدالله الفياض، مشكلات الأراضي في لواء المنتفق، ص١٩٤.

* سەید عەبدولمەهدی سەید حەسەن شوبەر مونتەفیکی، ١٨٩٠ لە شەترە هاتووەتە دنیاوە. پاش ئەوەی زەوییەکی کشتوکاڵیی لە ئالسەعدوون کڕیوە، چووە لە دێی ئەلبوهاون (سەرووی شاری نەسر- نەصر) دانیشتووە. نەخشێکی بەرچاوی لە کۆنگرەی ساڵی ١٩٢٠ی مەسیفی (المصيفي)دا هەبووە، چەند جارێک بە نوێنەری مونتەفیک هەڵبژێردراوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران و بووە بە

وەزیری ئابووری و ئیشغالی گشتی و هەم سەگبان عللی (صكبان العلي)*ی سەرۆکهۆزی خەفاجە کردووە و نێوەنێوی سەرۆکی گەلێک تیرەی خێڵەکانیشی داوە لە دژی یەکتر، کە جگە لە سووتانی ژمارەیەکی زۆری گوندەکان، بووەتە هۆی خوێنڕشتنێکی زۆر؛ نزیکەی پازدە کەسی خێڵی کینانە و پتر لە سەد کەسی ئەلبوسەعدی تێدا کوژراون.[١٤٩]

دەکرێ بە چاوپێداخشاندنی خشتەی ژمارە ١، کە لیستێکی تایبەت بە هەندێ ناکۆکیی سەر زەویوزار و ژمارەی بەرکەوتوو و پێکراوان دەخاتە بەردەست، سەرەنجامی بەکوشتدانی مرۆڤ لەبەر چاوچنۆکیی سەرۆکهۆزەکان بزانین.

**خشتەی ژمارە ١**

هەندێ ئەنجامی چاوبڕینی سەرۆکهۆزەکان لە زەویوزار

لیستێکی ناتەواو سەبارەت بە ناکۆکییەکانی بواری موڵکایەتیی زەوی[١٥٠]

| زنجیرە | ساڵ | خێڵی بەشداری ناکۆکی | ژمارەی کوژراو |
|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٢٢ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی دلێم | ٢٢ |
| ٢ | ١٩٢٢ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی بەنیخیکان | ٢٠ |
| ٣ | ١٩٢٢ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی تەی | ٢٠ |
| ٤ | ١٩٢٢ | ئەلبودوحەیدیح و ئەلبوعەردی | ٩ |
| ٥ | ١٩٢٢ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی زیاد | ٢ |
| ٦ | ١٩٢٢ | ناکۆکیی ناوخۆی مەجەڕە | ٢٢ پێکراو |

---

وەزیری ئابووری و ئەندامی ئەنجومەنی پیران (الأعیان). چووەتە ناو حیزبی سۆشیالیستیی ئوممە (الأمة)، کە ساڵح جەبر دایمەزراندووە. ساڵی ١٩٧٠ مردووە. نامەیەکی ماستەری لە کۆلیجی پەروەردەی زانکۆی زیقار لە لایەن موئەییەد شاکر کازم تائییەوە بە ناونیشانی "سەید عەبدولمەهدی و نەخشی سیاسیی لە عیراق"ەوە لەبارەوە نووسراوە. (و.ع)

* سەگبان عللیی سەرۆکهۆزی هەموو خێڵەکانی خەفاجە لە عیراق، ١٨٩٢ لەدایکبووە. کوڕی شێخ فەزڵە کە لە شەڕی دژی ئینگلیزدا کوژراوە. ساڵی ١٩٢٠ بەشداریکردووە لە کۆنگرەی مەسیفیدا، کە شەڕکردنی ئینگلیز لە گرنگترین بڕیارەکانی بووە. چەند جارێک بە نوێنەری لیوای مونتەفیک هەڵبژێردراوە. (و.ع)

[١٤٩] ئەم سکالانامەیەم لەناو چەندین بەستەک کاغەزی کتێبخانەی ئاسایشی بەغدادا دۆزییەوە، بابەتی هەمەجۆری تێدایە.

[١٥٠] سەرچاوە: سەبارەت بە ناکۆکییەکانی ساڵی ١٩٢٢، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء ٣، ص١٦٨؛ الجزء ٦، ص٣٣؛ الجزء ٧، ص٩٦-٩٧. بۆ ساڵەکانیتریش، بڕوانە: ڕۆژنامەی "الأهالي"، ژمارە ٨٠، ساڵی ١٩٥٤.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧ | ١٩٢٢ | ئەلبوحومەیدی و ئەلبوحەمدان و موشێرجە | ١٥ پێکراو |
| ٨ | ١٩٢٢ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی بەنیتەمیم | ٨ |
| ٩ | ١٩٢٥ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی زیاد | ٢٠ |
| ١٠ | ١٨٢٦ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی فەتلە | ١٠ |
| ١١ | ١٩٣٢ | عەفالیجە و عەمارییەکان | ١٢ |
| ١٢ | ١٩٣٩ | ئوزێرج و بەزوون | پتر لە ١٠٠ |
| ١٣ | ١٩٤٠ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی زەواڵیم (الظوالم) | پتر لە ١٠٠ |
| ١٤ | ١٩٤١ | ئالحاتەم و ئالمەنناع | ٤٩ کوژراو و ١٠٠ بریندار |
| ١٥ | ١٩٤٢ | زیاد و شبل | ٢٥ |
| ١٦ | ١٩٤٣ | زەواڵیم و ئەلبوجیاش | ٤ |
| ١٧ | ١٩٤٥ | قەرشییەکان و حەممام | ٩ |
| ١٨ | ١٩٤٥ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی ئالیاسین | دەیان |
| ١٩ | ١٩٤٦ | ئەلبومەتیووت و شەمەر | ١٤٤ کوژراو و ٩٣ بریندار |
| ٢٠ | ١٩٤٧ | عەرد و ئالجیاش | ١٥ |
| ٢١ | ١٩٤٧ | تەوالیح (الطولح) و ئەلبوحەسەن | ٥ |
| ٢٢ | ١٩٤٨ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی سەعدوون | ٤ |
| ٢٣ | ١٩٤٨ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی بەنیتەمیم | ٣ |
| ٢٤ | ١٩٤٩ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی عەنزە | دەیان |
| ٢٥ | ١٩٤٩ | شوەیلات و عگێل | ؟ |
| ٢٦ | ١٩٤٩ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی عگێد | ؟ |
| ٢٧ | ١٩٤٩ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی بەنوحجێم | ٣٠ |
| ٢٨ | ١٩٤٩ | ناکۆکیی ناوخۆی هۆزی زەواڵیم | ١٨ |
| ٢٩ | ١٩٥١ | عوبێد و سایح (الصایح) | ١٨ |
| ٣٠ | ١٩٥٢ | جەوابیر و تۆبە (الطوبة) | ١٥ |
| ٣١ | ١٩٥٢ | عززە و عوبێد | نزیکەی ١٠٠ |

شێوازی دەستبەسەرداگرتن یا زەوتکردنی زەویوزار، تاکە ڕێگە نەبوو سەرۆکهۆزەکان پەنای بۆ ببەن، تا ببنە خاوەنی چەندین ڕووبەری بەربڵاوی مەڵبەندەکان. دەستبەسەرداگرتنی ئەم زەوییانە، بە وەرگرتنی ڕەزامەندیی هەر حکوومەتێک بووە، حوکمی بەغدا بکا، جا هەرچۆنیک بووبێ. بەم شێوەیە،

کۆمیسێری باڵای بریتانیا ساڵی ١٩٢٢، بە نوێنەرایەتیی شێخ خەیوون عوبێد*ی سەرۆکهۆزی عبوودە، کە حەزیدەکرد قەواڵەی تاپۆی مەڵبەندی سدێفەی لیوای مونتەفیق بەدەستبێنێ، هەوڵی خێرخوازانەی خۆی دا. ئەویش دەرهەق بەم یارمەتییە گەورەیە، لە سەروبەندی ڕاپەڕینی نیشتمانیی ١٩٢٠دا، ڕایگەیاند پاراستنی ئاسایش و نیزام دەگرێتە ئەستۆی خۆی. کۆمیسێری باڵا داوای لێکرد بە کرێ، نەک بە موڵکایەتی، دەست بخاتە سەر ئەو مەڵبەندە، تا ئەو کاتەی بڕیارێکی لەبارەوە دەدرێ.[151] دەڤەری حەلیمییەی سەر فوراتیش، درا بە عەدای جریانی برای سەرۆکهۆزی ئەلبوسوڵتان، چونکە ئەو سەرۆکهۆزە «لایەنگرێکی سەرسەختی حکوومەتی داگیرکەری ئینگلیز بوو.»[152] هەروەها دەسەڵاتدارانی ئینگلیز بەشێکی گەورەی مەڵبەندی فراوانی شەهلا (الشهلاء)ی عەمارەیشیان خستە ژێر دەستی شێخ فالح سەیهوودی سەرۆکهۆزی ئەلبومحەمەد، «چونکە بە کەسێکی دەرکەوتوو دادەنرێ و هەمیشە پشتیوان و لایەنگری حکوومەت بووە، بەڵام تەنگی پێهەڵچنراوە و قەتیسکراوە لە بەشێکی بچووکی مەڵبەندەکەدا، کە هاوشانی جێوڕێ و کەسێتییەکەی نین. لەبەرئەوە دڵنیاین ئاخۆ خۆی ڕادەگرێ و لایەنگرییەکەی دەمێنێتەوە.»[153] هەر لەم لایەنەوە، حکوومەتی پاشایەتی هەمان ڕێگەی ئینگلیزەکانی گرتەبەر. حکوومەتی یاسین هاشمی لە ١٩٣٥دا چەندین پارچەزەویی لیوای دیوانییەی بەخشی بە شێخ عەبدولواحید حاجی سوکەری سەرۆکهۆزی فەتلە و بە سەرگەورەی خێڵەکی موحسین ئەبوتەبیخ، لەبەرئەوەی

---

* خەیوون عوبێد: پێشەوای خێڵاتی عبوودە لە عیراق. ١٨٨٩ لە شەترە لەدایکبووە و پاش کۆچی دوایی باوکی ساڵی ١٩٠٣، سەرۆکایەتیی خێڵی گرتووەتە دەست. دوای داگیرکرانی بەسرە ساڵی ١٩١٤، لەگەڵ سەیید حەبوبی بەشداریی جووڵانەوەی جیهادی دژی ئینگلیزی کردووە بەشدارنەبوونی لە شۆڕشی بیستدا، بووە هۆی کەمبوونەوەی تینوتاوی بەرەی مونتەفیک و غەراف. چەند جارێک بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێردراوە و لە ئەنجومەنی پیرانیش دانراوە. ساڵی ١٩٧٠ مردووە. بڕوانە: حسين داخل الفضلي، عشائر ذيقار وتراثهم الشعبي مطبعة النبراس، النجف، ٢٠١١. (و.ع)

151 (Secret) Intelligence Reports No. 2 and 3 of 15.1.1922 and 1.2.1922, para 89 and No. 4 of 14.2.1922, para 148.

152 (Secret) Intelligence Report No. 20 of 15.10.1922, para 1000.

153 Great Britain, Colonial Office, Report on the Administation of Iraq, April 1922-March 1923, pp. 67-68.

پشتگیریی سیاسیی حکوومەتیان کردبوو.[154] بەڵام هێندەی نەبرد کە حکوومەتی کودەتای سەربازی بە سەرکردایەتیی بەکر سدقی جڵەوی حوکمی بەدەستەوەگرت و ئەو زەوییانەی گێڕایەوە، ئەو جووتە زەوییەکانیان لەدەستچوو.

دەستبەسەرداگرتنی زەویوزار، یا لافـلێدانی هەقی موڵکایەتیی زەوی، لە ڕێگەی بەدەستهێنانی قەواڵەکانی تاپۆی سەردەمی حوکمی تورکییەوە، دەستی پێکرد و بە زۆریش بە چەندین شێوەی نانیزامی پەیدادەکران. یەکێک لەو شێوە باوانە، دەرهێنانی مافی موڵکایەتیی پشتاوپشت پێڕەوکراوی ئەم زەوییانە بوو لە چنگی جووتیارانی خێڵەکان. وا دیارە ئەم ڕێگەیە بە شێوەیەکی تایبەت لە زەویوزاری هۆزەکانی لیوای عەمارەدا پێڕەوکراوە. هیچ ئاماژە یا بەڵگەیەک بەدەستەوەنییە بیسەلمێنێ ئەم قەواڵانەی تاپۆ لەگەڵ بەندەکانی قانوونی تاپۆ ڕێکدێنەوە. ئەمەی خوارەوە هەڵبژێردراوی نموونەیەکی قەواڵەی تاپۆیە، لەوەدەچێ کاتی خۆی باوبووبێ:[155]

موڵکداری زەوی: ئیبراهیم سەعدوون

سنوور: لای سەروو- خدر، لای خواروو- حەسوونە، لای ڕۆژاوا: خولەیمی، لای ڕۆژهەڵات: حوەیدە و ئومعەفتوور (أم العفتور)

نرخی دراو: ٥٠٠٠ ڕووپێ

دۆنم (مشارە): ١٤٧٠٨

کاتێک ئەو زەوییە ڕاستەقینە ئاماژەبۆکراوەی قەواڵەکە پشکندرا، دەرکەوت ڕووبەرەکەی دەگاتە ٦٠,٠٠٠ دۆنم (مشارە) و کرێی ساڵانەیشی خۆ دەدا لە نزیکەی ٢٦,٠٠٠ ڕووپێ، واتە پێنجئەوەندەی نرخی بنەڕەتیی زەوییەکە. ئەم قەواڵانەی تاپۆ، بەتایبەت لە لیوای مونتەفیق و لیواکانیتری باکووری عیراق، لەسەر ورگی جووتیارانی بە کردەوە ڕەنێوهێنی ئەم زەوییانە بەدەستهێنران و بە ناوی سەرۆکهۆزان یا خزمەکانیان یان فەرمانبەرانی پێشتر باجگری زەوییەکانەوە تۆمارکران. جووتیارانیش، بە ملکەچی و خۆپارێزی ڕووبەڕووی ئەم مەسەلانە

---

[154] بڕوانە دەقی بەیاننامەی ڕۆژی ١٩٣٩/٦/٢٦ی موتەسەریفی دیوانییە، لە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء ٤، ص٢٨٠.

[155] Administration Report of the Muntafik Division for 1919, pp. 2-3, 104.

نەبوونەوە. هێندێ جار هەر کە گومانکراوە داوایەکی قانوونی لەسەر زەوییەکە هەیە، ناکۆکی سەری‌هەڵداوە. جارێکیان خێڵێک سکاڵای‌کرد کە کەسێک قەواڵەکانی تاپۆی زەویی ئەوانی بەدەستەوەن، هەموو گوندەکەیان لەپێناوی لەناوبردنی ئەو قەواڵانەدا سووتاند.[١٥٦] حکوومەتی پاشایەتی کە پێڕەوی سیاسەتی یەکلاکردنەوەی ئەم ناکۆکییانەی کرد، بەهایەکی لە هەقی خۆیان زیاتری دانا بۆ ئەم قەواڵە تورکییانەی تاپۆ؛ لیوای مونتەفیق نەبێ، کە پاش ئەوەی شۆڕشی ١٩٥٨ ئەم کاروبارانەی گرتە دەستی خۆی، شێلگیرانە یەکلاکردنەوەی ئەم ناکۆکییانەی لە ئەستۆی خۆی گرت.*

دوایین خاڵێک کە دەمانەوێ لێرە لێی‌بدوێین، بۆ پوختەکردنەوەی وتوویژەکەمان سەبارەت بە بنەڕەتی موڵکایەتیی نیمچەتایبەت لە دێهات، ئەوەیە کە زۆری ئەم سەرۆک‌هۆز و موڵکداری زەوی و گوبانییانە، هەر بە دانانی ئاوهەڵکێشێک یا بەرهەم‌هێنانی بەروبوومێکی کشتوکاڵی لەم زەوییانەدا، مافی لەزمەیان لەم زەوییانەی دەوڵەتدا دەستکەوتووە.[١٥٧]

---

156 Administration Report for 1918, I, p. 432.

* بەتاتۆ مەبەستی ئەوەیە: قانوونی ژمارە ٣٠ی ساڵی ١٩٥٨ی چاککردنی کشتوکاڵ کە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم دەری‌کرد، ململانێی قانوونیی ناو دادگاکانی لە نێوان موڵکدارانی ئالسەعدوون و موڵکدارانی نەریتی یا مێژوویی خێڵەکانی‌تردا سەرومڕ کۆتایی‌پێ‌هێنا. (و.ع)

١٥٧ بڕوانە: ماددەکانی (١١/ ئـ و ب)ی قانوونی ژمارە ٢٩ی ساڵی ١٩٣٨ی یەکلاکردنەوەی مافەکانی زەوی‌وزار، الحكومة العراقية، وزارة المالية، (بغداد، مطبعة الحكومة، ١٩٣٨).

## باسی حەوتەم

## زەوی، کلیلی ڕەفتاری سیاسیی سەرۆکهۆزەکان

سەرچاوەی زۆربەی بیرکردنەوە و ڕەفتاری سەرۆکهۆزەکان لە ماوەی نێوان ١٩١٨-١٩٥٨دا، سەرقاڵییانە بۆ بەدەستهێنانی زەوی‌وزار. نموونەی باڵای ڕۆشنبیریی سەرۆکهۆزەکان لە قۆناغی دەستەبەندییە خێڵەکییە سەربازییەکان‌دا، دلێریی سەربازی بوو و بناغەی سەرکردایەتیش، ئازایەتیی پیاوانە و هێزی باڵادەست بوو. بەڵام ئیتر وای لێ‌هات خاوەنایەتیی گەورەترین و دەوڵەمەندترین مەڵبەندەکان بایەخی پەیداکرد، لەبەرئەوە ئیتر هێز و جێ‌وڕێی سەرۆکهۆز بەسترانەوە بە زەوی.

سەرۆکهۆزەکان مێژووی قۆناغەکەی خۆیان بە باشی تۆمارنەکردووە؛ لەبەرئەوەی چینێکی تا ڕادەیەکی زۆر نەخوێندەواربوون، هیچ نووسین یا وتار و پەیامێکیان بۆ بەجێ‌نەهێشتووین، تا بە هۆیەوە بزانین بیریان لە چی دەکردەوە. ناوی خۆیان خستووەتە سەر ژمارەیەکی زۆری سکاڵانامە، بەڵام ئەم سکاڵانامانە ئەوەندەی پەرۆشییەکی بێ‌ئەندازەیان بەرامبەر بە ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز یا موتەسەڕیفی حکوومەتی پاشایەتی یان نوێنەری موجتەهیدی گەورە تێدا نوێنراوە، ئەوەندە هەڵوێستی ڕاستەقینەی ئەوان ڕەنگیان تێدا نەداونەتەوە. وێڕای ئەوە، دەشێ لێرەولەوێ چەندەها ئاماژە سەبارەت بە بەها و بیروڕایان بدۆزینەوە. لە کۆبوونەوەیەکی نارەسمیی کۆمەڵەی دامەزراندنی عیراقی (الجمعية التأسيسية العراقية)دا ڕۆژی ١٩٢٤/٥/٢٢ و پاش بیستنی وتاری درێژی سەرۆکوەزیران، جەعفەر عەسکەری، کە داوای تێدا کرد پەیماننامەی ئەنگلۆ-عیراقی پەسەندبکرێ، شێخ سالم خەیوونی سەرۆکهۆزی بەنی‌ئەسەد،* کە سەرکردایەتیی بەرهەڵستیی خێڵەکیی کرد دژ بە پەیماننامەکە، بە جەختکردنەوە وەڵامی‌دایەوە: «ئێمە ئەم پەیماننامە قورسە قبووڵ‌ناکەین، جەعفەر عەسکەریش وەک ئێمە موڵکداری زەوی

---

* سالم خەیوون: سەرۆکهۆزی بەنی‌ئەسەدە لە ناسرییە. ١٨٨٣ لەدایکبووە. ١٩١٤ بەشداریی جووڵانەوەی جیهادی کردووە لەگەڵ سەید حەبووبی لە بەسرە. لە سەردەمی پاشایەتی‌دا، بوو بە ئەندامێکی ئەنجومەنی نوێنەران. ١٩٦٥ مرد. (و.ع)

نییە!»[158] ناوەڕۆکی قسەکەی -بێگومان- ئەوەبوو کە تەنیا موڵکداری زەوی مافی بڕیاردان و یەکلاکردنەوەی هەموو شتێکی وڵاتەکەی هەیە. ئەو سەرۆکهۆزانەیش کە پشتی سیاسەتەکانی ئینگلیزیان گرت، دەیانویست هەمان ڕێچکە بگرنەبەر. ساڵی ۱۹۲۲، چل سەرۆکهۆزی لایەنگری ئینگلیز بۆ مەلیکیان نووسی و بە ڕوونی ئاماژەیان بۆ کرد کە گەرەکیانە چەند فەرمانبەرێکی پێشووی نەتەوەخوازی لایەنگری شەریف حسێن بە موتەسەڕیف دابمەزرێن و بازرگان و پێشەوایەکی بەناوبانگی خێڵەکیی وەک جەعفەر ئەبوتمەنیش بە وەزیری بازرگانی دابنرێ، «تا گوێ لە پرس و ڕاوێژیان بگیرێ. کەسی بەزەبر و بنەچە پیاوچاکیش بۆ حکوومەت دەستنیشانبکرێ، چونکە ئەوانە سەرچاوەی داهاتەکانی وڵاتن و خۆیان و خێڵەکانیان بە خەمی بەرژەوەندی دەوڵەتەوەن.»[159] ئەم داوایە ڕەنگدانەوەی نەک هەر عەقڵییەتی سەرۆکهۆزەکان خۆیان، بەڵکوو عەقڵییەتی ئەفسەرێکی سیاسیی ئینگلیزی خاوەن مۆرکی ڤیکتۆریشە؛* ئەو بۆچوونانە دەخاتەڕوو، کە خرانە مێشکی سەرۆکهۆزەکان و زۆری نەخایاند وەریانگرتن و کردیاننە بۆچوونی خۆیان.

جیهانی هۆشیاری لای سەرۆکهۆزەکان، جیهانێکی دیاریکراوی ئاسۆ بەرتەسکە؛ بۆ سەرۆکهۆزێکی نەخوێندەواری دێهاتی، کە تەماعێکی لەڕادەبەدەری پارە دایگرتووە و ئارەزوویەتی دوایین کێڵەی دانەوێڵەی تەرخانکراوی خۆی لە جووتیارانی بپچڕێ، جیهانێکی چەقبەستووی مایەی بێزارییە. قسە زیاد و دەگمەنەکانیان لە وتووێژەکانی پەرلەماندا، چەندین سەرپۆتی زانیاریی هەمەجۆری سەبارەت بە جیهانی ناوەوەی سەرۆکهۆزەکان خستووەتە بەردەستمان. سەرۆکهۆز، عادەتی وایە لەوێ دادەنیشێ و زمان هەڵناهێنێتەوە، بە زۆریش کەمترین ئاگای لە کاروبارەکانی پەرلەمان نییە. سەرباری ئەوە، ڕەنگە نوێنەرێکی خوێنگەرمی لاو بۆچوونێکی سادە دەرببڕێ، زیان بە ئیمتیازەکانی سەرۆکهۆز بگەیێنێ، لێرەدا هێندەی پێناچێ سەرۆکهۆز بەرزەپێ ڕادەپەڕێ! ساڵی ۱۹۳۳ پرۆژەقانوونێک خرایە بەردەستی پەرلەمانی

---

158 (Secret) Intelligence Report No. 29.5.1924, para 365.

159 (Secret) Intelligence Report No. 9 of 1.5.1922, para 263.

* مۆرک ڤیکتۆری: ئاماژەیە بۆ ماوەی حوکمی ڤیکتۆریای شازادەی بریتانیا ۱۸۳۷-۱۹۰۱، کە بریتانیای تێدا لە تەرزی کشتوکاڵییەوە گۆڕدرا بۆ شۆڕشی پیشەسازی. مۆرکی ڤیکتۆریش تەرزێکی خۆپارێز و کۆنە لە سیاسەتدا. (و.ع)

عیراق، ڕێی لە جووتیارانی قەرزداری موڵکدارانی زەوی دەگرت زەوی یا مەڵبەندەکە بەجێبێڵن و لێی قەدەغەدەکردن لای هەر کەسێکیتر کاریان پێبکرێ، ئەگەر بەڵگەی موڵکایەتیی زەوییان پێنەبووایە بیسەلمێنێ قەرزدارنین. پاشتر ئەم قانوونە، بە قانوونی ژمارە ٢٨ی ساڵی ١٩٣٣ی ماف و ئەرکەکانی جووتیاران ناوبرا.[١٦٠] لە گەرمەی وتووێژی سەبارەت بەم قانوونەدا، ساڵح جەبر، کە پاشتر بوو بە سەرۆکوەزیران، بەڵام ئەوسا تەنیا نوێنەرێکی چالاکی بەرهەڵستی حکوومەت بوو، گوتی: مادامێکی کەموکورتی لە هێزی کاری کشتوکاڵیدا هەیە و موڵکداری زەویش بەرژەوەندی لەوەدایە بەڵگەی «قەرزدارنەبوون»ی بەدەستەوەبێ دژی جووتیار، پێویستە قانوون جووتیار بپارێزێ و موڵکداری زەوی ناچاربکا قەرەبووی ڕۆژانی لەکاردواخستنی بداتێ. ئەم بۆچوونە سەلمان بەڕاکی سەرۆکهۆزی ئەلبوسوڵتانی* ورووژاند و خێرا ڕەتیدایەوە، لە کاتێکدا نەیتوانی تێبگا «چۆن دەکرێ دەستی موڵکداری زەوی بەم شێوەیە ببەسترێتەوە و پێملبکرێ قەرەبووی جووتیار بکاتەوە و شتی وایش لە هیچ شوێنێکی سەرزەمینی خوادا ڕووینەداوە!» شێخ حەسەن سوهێلی سەرۆکهۆزی تەمیمیش** هەستا، پشتگیریکرد و ڕایەکی سەیری دەربڕی و گوتی: «ناچارکردنی موڵکداری زەوی کە قەرەبوویەک بداتە جووتیار، زوڵمە لێی دەکرێ.» شێخ زامل مەنناعیش[١٦١] تووڕەبوو و نارەزایەتیی دەربڕی و گوتی: «من پێشتر شتی وەهام نەبیستووە. وڵاتێک لە جیهاندا نییە موڵکداری زەوی ناچاربکا قەرەبووی جووتیار بکاتەوە.»[١٦٢]

---

[١٦٠] لە شوێنێکیتر بە لێکدانەوەیەکی زیاترەوە دێینە سەر باسی ئەم قانوونە.

* سەلمان بەڕاک: سەرۆکهۆزێکی ئەلبوسوڵتانە لە حللە، ١٨٨٠ لەدایکبووە. لەگەڵ هۆزەکەی بەشداری شۆڕشی بیست بووە و دوایی دەستگیرکراوە. چەند جارێک هەڵبژێردراوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران و لە حکوومەتی سێیەمی عەبدولموحسین سەعدووندا، بووە بە وەزیری کشتوکاڵ. ساڵی ١٩٤٩ مردووە. (و.ع)

** حەسەن سوهێل: سەرۆکخێڵێکی بەنیتەمیمە لە عیراق، ١٨٩٠ لە ئەبوغرێب هاتووەتە دنیاوە و بە یەکێک لە گەورە موڵکدارانی زەویی ئەم ناوچەیە دانراوە. پێوەندیی فراوانی بە گەلێک لە میران و بنەماڵە حوکمدارەکانی سعوودیە و قەتەر و ئوردنەوە هەبووە. لە سەردەمی پاشایەتیدا، بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێردراوە. ١٩٥٧ مردووە. (و.ع)

[١٦١] سەرۆکی هۆزی ئەجوەدە.

[١٦٢] دانیشتننامەکان (محاضر)ی دانیشتنی ژمارە ٢٧ی ڕۆژی ١٩٣٣/٥/٢٧ی ئەنجومەنی نوێنەران.

سەرۆکهۆزەکان بەم شێوەیە لە وڵاتی خودا و چەمکە ئەخلاقییەکان و ئەزموونی جیهانیی مرۆڤایەتی تێگەیشتبوون!

ڕەفتاری سیاسی بە دەگمەن لە کێشە یا هۆیەکەوە پەیدادەبێ. بەڵام ئەوە جێی سەرسووڕمانە کە مەودای کردەوە و کاری ئارەزوومەندانەی سەرۆکهۆز بەستریتەوە بەو بەرژەوەندەوە کە لە زەوی‌دا هەیەتی. خۆگونجاندنی سەرۆکهۆزان لەگەڵ سیاسەتەکانی بریتانیا و ملکەچییان بۆ مەلیک یا عەبدولئیلا، یا بەشدارییان لە چالاکییە نیشتیمانییەکان‌دا، هەر خۆنوواندنن بۆ پشت‌گرتنی ئەم یا ئەو لا و تەماعی تایبەتیان تێدایە بۆ دەست‌کەوتنی زەوی، یا حەزدەکەن موڵک و ماڵیان بپارێزن یا لێی زیادبکەن، یا سەربکەون بەسەر نەیارێکی‌تردا لەسەر زەوی، یان بڕیار یا حوکمێکی نەخوازراو سەبارەت بە زەوی بگۆڕن، یان مامەڵەیەکی پەسەندتری تایبەت بە باج و موڵکانەی سەر زەوی بپارێزن، یا لەم باج و موڵکانانە ڕزگاربن. سەرۆکهۆزانی گەورەی دیجلە لە کووت و عەمارە* لە ڕاپەڕینی نیشتیمانیی ١٩٢٠یش‌دا بێ‌لایەن‌بوون و پشتیوانیی ئینتیدابی ئینگلیزییان کرد و دەنگیان بۆ پەیماننامەی ئەنگلۆ-عیراقیی ساڵانی ١٩٢٤، ١٩٢٦ و ١٩٣٠ دا و ڕازی‌بوون لە ١٩٢٥دا مل‌بدەن بۆ کۆمپانیای پەترۆڵی عیراقی و ڕێککەوتننامەی دواتری نەوتی ساڵی ١٩٣١ و لە ١٩٣٦ و ١٩٤١دا پشتی کودەتاچییە سەربازییەکانیان نەگرت، چونکە حکوومەتی بریتانیا لەسەر موڵکە پان‌وبەرینەکانیان جێگیری‌کردن و چەندین ئیمتیازی تایبەتی سەبارەت بە باجی زەوی و دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەیشی بەسەر جووتیارانی خێڵەکانیانەوە پێ‌بەخشین. لەبەرئەوە پشتگیریی ڕژێمی پاشایەتییان لە ساڵانی چل و پەنجادا و بەرهەڵستیی ڕاپەڕینی ١٩٤٨[١٦٣] و شۆڕشی ١٩٥٨یشیان، بەوە لێک‌دەدرێتەوە کە ژێربەژێر یا ئاشکرا لە موڵک و ماڵ یا ئیمتیازەکانیان دەترسان. هەر بە هەمان شێوە، دەکرێ ڕەفتاری نیشتیمانیی هەندێ سەرۆکهۆز لێکبدرێتەوە. با -بۆ نموونە- بچینە سەر مێژووی ئەو سەرۆکهۆزە کە -بێ‌گومان- بە هێمای سەرۆکهۆزی نیشتیمانی دادەنرێ، ئەویش شێخ عەبدولواحید حاجی سوکەری سەرۆکهۆزی فەتلەیە، کە ساڵی ١٩٢٠

---

* مەبەستی میری ڕەبیعە و سەرۆکهۆزانی مەییاح لە غەراف و ئەلبومحەمەد و بەنی‌لام لە عەمارەیە، کە بۆچوونێکی خۆپارێزانەیان لە سیاسەت و لایەنگریی ئینگلیزدا هەبوو. (و.ع)

[١٦٣] ئەو ڕاپەڕینە میللییە بوو کە ساڵی ١٩٤٨ دژی پەیماننامەی پۆرتسموثی سالح جەبر و ئێرنست بیڤن بەرپابوو.

ڕێبەرایەتیی سەرهەڵدانی خێڵەکیی دژ بە حوکمی ئینگلیز و ساڵی ١٩٤١یش پشتیوانیی جووڵانەوەی ڕەشید عالی گەیلانیی کرد. مەبەستی جەختکردنەوە لە کاریگەریی زەوی و دەرامەتەکانیشی لە بڕیاردانی عەبدولواحید سوکەر و سەرۆکهۆزانی‌تری شامییەدا، بۆ بەشداری لە ڕاپەڕینی ١٩٢٠دا و بەرهەڵستیی ئینگلیزەکان تا مردن، ئەوەنییە کە لە تین‌وتاوی هۆیەکانی‌تری ئاگرخۆشکەری ڕاپەڕین کەمبکەینەوە؛ وەک کاریگەریی موجتەهیدانی نەجەف لەسەر جووتیارانی خێڵەکان، یا کەڵکەڵەی کۆنی سەربەخۆیی سەرۆکهۆزەکان، یان تێڕوانینی گەل بۆ حکوومەتی بریتانیا کە حکوومەتێکی بێگانە و کافرە.

پێشتر باسمان‌کرد، شامییە بە تەنیا، لە ساڵانی یەکەمی حوکمی ئینگلیزدا، خۆی لەژێر بارێکی قورسی باجدا ڕاگرت. ئەم هەڵپە بەرچاوەی ئینگلیز بوو بۆ باجکۆکردنەوە، سەرۆکهۆزانی شامییەی تووڕەکرد، هەر لەبەرئەوە نا کە پێشتر بەو شێوەیە توند و شێلگیر نەبوو، بەڵکە لەبەرئەوەی سەرۆکهۆزەکان ئازادبوون و لە سەرەتای ساڵی ١٩١٥ بەدواوە کە تورکەکان دەرپەڕێندران، تا دەرکەوتنی ئینگلیزەکان لە دوادواکانی ١٩١٧دا، هیچ باجێکیان نەدا. ئەمەیش هەستێکی جوانە و ناکرێ بە ئاسانی لەبیرببرێتەوە. هۆکارێکی‌تر کە مێژوونووسانی ڕاپەڕینی ١٩٢٠ دەیانەوێ پشتگوێی‌بخەن، وێرانکاریی هەمەلایەنەیەی بەروبوومی شامییە لەسەر دەستی کاربەدەستانی ئیداریی ئینگلیز، یا -وردتر بڵێین- خراپیی بەڕێوەبردنی ئاوی فوراتە. ئەفسەری سیاسیی شامییە لەو ڕاپۆرتەدا کە دوو ساڵ پێش بەرپابوونی ڕاپەڕینەکە نووسیویە، زانیارییەکمان لەبارەی ڕووداوەکەوە دەداتێ؛ نووسیویە: سەرۆکهۆزانی شامییە بەرهەمی مەرەزە دەپەرستن، چونکە سەرپاکی سامانیان پێکدەهێنێ و دەستڕۆیی و باڵادەستیشیان لەسەر ئەوە هەڵچنراون. کە توخنی ئەو بەرهەمە دەکەوی، دەڵێی لە گیرفانیان نزیکدەبیتەوە. بۆ ئەوەی بزانین تا چ ڕادەیەک لێی نزیکبووینەتەوە، دەبێ بیرمان‌بێتەوە، پێش ئەوەی دەست بەسەر ئەم وڵاتەدا بگرین، سەروبەری بەرهەمهێنانی چەڵتووک ٩٠,٠٠٠ تەن بوو، لە کاتێکدا لە یەکەم ساڵی بەڕێوەبردنی ئێمەدا گەیشتە ٦٠٠ تەن و ساڵی دووەمیش ٢٠,٠٠٠ تەن.[١٦٤]

بێ‌گومان هەموو ئەمانە پێکەوە دنەی شێخ عەبدولواحیدیان دا ئەو دەستپێشخەرییە بکا و ڕوو لە سەرۆکهۆزانی‌تریش بنێ بچنەپاڵی و هەوڵی

---

164 Reports on Administration for 1918, I, p. 78.

وەدەرنانی ئینگلیزەکان بدەن. سەرباری ئەوە و لەبەر هۆیەکی نەزانراو، بەروبوومی ساڵی ١٩١٩ی شێخ، کە ئەفسەری سیاسی ئاوی سەر جۆگەی کولەبیبی بەردایەوە، ژێرئاوکەوت.[١٦٥] ڕەفتار و سکاڵای بەردەوامی ئەم سەرۆکهۆزە و سەرۆکهۆزانیتری شوێنکەوتووی، دوابەدوای سەرنەگرتنی ئەو ڕاپەڕینە کە شەڕی ئینگلیزەکانیان تێدا کرد، ئەوەی لێ بەدیدەکرێ کە «هیچ شتێکیان چنگنەکەوتووە، لە کاتێکدا سەرۆکهۆزانیتر بوون بە وەزیر و ئەندامی پەرلەمان و موڵکداری چەند مەڵبەندێکی بەرفراوان.»[١٦٦] ئەوەی ڕاستیبێ، شێخ عەبدولواحید بەشێکی زەوییەکانی خۆی، یا ئەو زەوییانە کە لافیلێدەدا موڵکی خۆین، وەک زەوییەکانی ڕاکی حەسوە (راك الحصوة)، لەدەستیدان. ئەو زەوییانە، درانە نەیارەکانی لەناو هۆزی فەتلە. ئیتر مەسەلەی دەستکەوتنەوەی ئەم زەوییانە، بووە خولیای سەرەکیی و هانی دا ساڵی ١٩٣٠ بچێتەپاڵ حیزبی بەرهەڵستی، کە حیزبی ئەخاء (الأخاء)ی یاسین هاشمی و ڕەشید عالی بوو.* ئەم دوو سیاسییە گفتیاندابێ، ئەگەر حیزبەکەیان بە دەسەڵات گەیشت، زەوییەکانی بۆ بگێڕنەوە. کە ساڵی ١٩٣٥ گەیشتنە دەسەڵات، ئەو زەوییانەی ڕاکی حەسوە کە شێخ عەبدولواحید داوایدەکردن، دەستیکەوتنەوە. بەڵام حکوومەتی کودەتای بەکر سدقی، لە ١٩٣٧دا زەوییەکانی لێستاندەوە. ئەمە هانی دا بیر لە یاخیبوون بکاتەوە. تۆمارەکانی ناو فایلەکەی[١٦٧] ڕوونیدەکەنەوە کە نیسانی ١٩٣٧ سەرقاڵی کڕینی چەکوچۆڵ بووە بۆ پیاوانی خێڵەکەی و مایسی ئەو ساڵەیش پێوەندیی بە موحسین ئەبوتەبیخ** و عەلوان یاسری و دەسەڵاتدارانی ئینگلیزەوە

---

[١٦٥] لە فایلەکانی ئاسایشی بەغدا (ڕائید ویلکینز)، ژمارە ٣١ و ئەوانەی دوایی (عەبدولواحید سوکەر)، مایسی ١٩٢٠ تۆمارکراوە.

[١٦٦] بۆ نموونە، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، تۆماری حوزەیرانی ١٩٢١؛ فريق المزهر الفرعون (شيخ الفتلة)، الحقائق المنسية في ثورة العشرين، الجزء الأول، ص٨.

* حیزبی نیشتمانیی برایەتی (حزب الأخاء الوطني) دوایین حیزبی عیراقییە کە لە سەردەمی ئینتیدابی ئینگلیزدا دەرکەوت، بەرهەڵستانی سیاسەتی نووری سەعید ساڵی ١٩٣٠ پێکیانهێنا. یاسین هاشمی و ڕەشید عالی گەیلانی و ناجی سویدی و حیکمەت سولەیمان و کەسانێکیتری لەناودابوون. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الأحزاب العراقية، مركز الأبجدية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٣، ص١١٤. (و.ع)

[١٦٧] فایلی ژمارە ٣١ی ئاسایش، تۆمارە مێژوولێدراوەکان وەک لە دەقەکەدا نیشاندراون.

** موحسین ئەبوتەبیخ: ساڵی ١٨٧٨ لە دیوانییە لەدایکبووە و ١٩٦١ مردووە. یەکێکە لە پیاوەگەورەکانی شۆڕشی بیست، کە ئەو سەروبەندە بە سەرۆکی حکوومەت دامەزرێندرا لە

کردووە، تا ڕەزامەندییان مسۆگاربکا بۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕینێکی دژی حکوومەت. بەڵام ئەم ناوەندانە هیچیان هانیاننەداوە و لە ئەنجامدا شێخ عەبدولواحید دەستگیرکراوە، پاشتر دوای ڕووخانی حکومەتەکەی بەکر سدقی بەردراوە. پاڵپشتیی شێخ عەبدولواحیدیش لە جووڵانەوەی ١٩٤١، کە دوایین کاری نیشتیمانییەتی، زیاتر پێوەندییە کۆنەکەی بە ڕەشید عالی و حیزبی ئەخاء (الأخاء)ەوە پاڵی پێوەناوە، نەک هیوای نیشتیمانی یا نەتەوەیی. پاش ئەوەی چەند ساڵێکی لە گرتووخانەیێک بەسەربرد، سەرەنجام هەر بوو بە لایەنگرێکی ئاسایی سیاسەتەکانی نووری سەعید.

ڕەنگە هەرە نەریتیترین ڕەفتاری سیاسی لەو قۆناغەدا، ڕەفتاری دەوڵەمەندترین سەرگەورە و گەورەترین موڵکداری زەوییەکانی سەر فورات، موحسین ئەبوتەبیخ و جەعفەری برای بووبێ. سامانەکەیان، لە موڵک و ماڵی پەلهاوێشتووی سەر شەتاوی حلله و شەتاوی شامییەیان بەدەر، ساڵی ١٩٢٦ بە نزیکەی ٥٠,٠٠٠ پەنجاهەزار لیرەی زێڕی تورکی دەخەمڵێندرا.[١٦٨] دوایین ئاواتیان، هەر فراوانکردنی موڵکەکانیان و زیادکردنی سامانیان بوو. هیچ ڕێگەیەکیشیان لە شامییە لە بەردەمدا نەبوو، ئەوەنەبێ کە بەم یا بەو شێوەیە بەشداری لەگەڵ هێزە سیاسییە ناکۆکەکان بکەن. بەڵام هەمیشە مەترسیی گرەوکردن لەسەر حیزبی هەڵە لەئارادایە. لەبەرئەوە ئەو جووتەبرایە بوونە دوو نەیاری سیاسیی یەکتری، لە کاتێکدا موحسین لە سەرەتای ساڵانی بیستدا لایەنگری کێشەی نیشتیمانی بوو، هەڵوێستی ڕاگەیێندراوی جەعفەر لایەنگریی ئینگلیز بوو. ساڵی ١٩٢٢ لە کاتێکدا جەعفەر پەرۆشی بەرقەراربوونی ئینتیدابی بریتانیا بوو، موحسینی برای دژی بوو. ١٩٢٦ کە موحسین بەرهەڵستیی مەلیک فەیسەڵی کرد، جەعفەر بووە سەرسەختترین لایەنگری مەلیک. ١٩٣٠یش موحسین دایەپاڵ حیزبی ئەخاء (الأخاء)، کەچی جەعفەر چووە ڕیزی حیزبی عەهدی عیراقی (حزب العهد العراقي)ی لایەنگری مەلیک و نەیاری ئەخاء و تاقمی عەلی جەودەت و جەمیل مەدفەعی. هەر لایەکیان شتێکی دەستبکەوتایە، ئەوا هەردووکیان جێپێیەکیان لە بەرە ڕاستەکەدا دەبوو. موحسین سەروەستای پیلانگێڕان و پیاوێکی فرەڕوو بوو، دەبینی جارێک

کەربەلا. پاش شکستی شۆرش، پەنایبردە بەر حیجاز و لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ هاتەوە، بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی پیران. (و.ع)

[١٦٨] فایلی ژمارە ٢٧٧ی ئاسایش- موحسین ئەبوتەبیخ.

نێوانێکی توندوتۆڵی لەگەڵ مەلیک هەبووە، جارێکیتر نهێنیی چالاکییە سیاسییەکانی مەلیکی لە شامییە لای ئینگلیزەکان درکاندووە. هەر ئەوەیش تاسەر بێزاریکردبوو، کە دەبوو ساڵانە باجێکی مەزەندەکراو بە نزیکەی ۲۰،۰۰۰ بیست هەزار ڕووپی بدا. بەڵام ئەمە لەچاو مەسەلەی پیلانگێڕی یا بەشداریی لە پیلانگێڕیدا دژ بە سەرۆکهۆزانی شامییە، بایەخێکی کەمتری هەبوو. ئەم پیلانگێڕییانەیش، وەک ئەفسەرانی کارگێڕیی ئینگلیز لە شامییە سەرنجیاندداوە،[۱۶۹] بە زۆری هاوزەمانی وەرزەکانی خەملاندنی ساڵانەی چەڵتووک بوون. لە ۱۹۲٦دا، خەریکی ناردنی تەتەر بوو بۆ لای زۆربەی سەرۆکهۆزانی سەر ڕووباری فورات، تا پشتیوانی و کۆمەکیان بەدەستبێنێ بۆ هەم بەرەنگاریی «ئەو زوڵموزۆرە کە لە کێشانەی چەڵتووکدا لێیان کراوە» و هەم یەکگرتنی خێڵەکان «بۆ پاراستنی مافی سەرۆکهۆزەکان» و دواجار دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئایینی بۆ هۆزە شیعەمەزهەبەکانی نیشتەجێی سەر فورات، کە بە ڕواڵەت لایەنگری حکوومەتی عیراق بوون.* بەڵام وا باوەڕدەکرێ کە مەبەستی ڕاستەقینەی بریتیبووە لە «وریاکردنەوەی حکوومەت، تا ناو و شانوشکۆی لەناو ناواندا بمێننەوە، بەو هیوایە کە مامەڵەیەکی چاکتر و پەسەندتری لە کێشەکانی زەویوزار و باج و موڵکانەدا لەگەڵ بکرێ.»[۱۷۰]

---

[۱۶۹] پشکنێری ئیداریی شامییە لە ۱۹۲٦/٦/۳۰دا بۆ ڕاوێژکاری وەزارەت ناوخۆی نووسیوە: «دەبێ هەمیشە بیرمان‌نەچێ کە بناغەی هەموو پیلانگێڕییەک لە دیوانییە، هەڵسەنگاندنی ساڵانەی چەڵتووک بووە.» نامەکە لە فایلی ژمارە ۲۷۷دایە.

* هەندێ بیروڕا دەرکەوتوون، دەڵێن: شیعە لە عیراق هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئایینییان داوە و شۆڕشی بیستیش بەم ئاراستەیەدا ڕۆیشتووە. لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە هیچ بنچینەیەکی ڕاست و دروستی نییە و لە پێوشوێنی پاساودانەوەی پرۆسەکانی دوورخستنەوە و تەریککردنی تیرەیی و دابڕاندنی مەزهەبیدا هێنراوەتەوە، چونکە داواکانی شۆڕشگێڕان و نیشتیمانپەروەران و مەرجەعە ئایینییەکان گشتیان، بۆ داواکردنی دەوڵەتێکی دەستووریی دیموکراتیی خاوەند ناسنامەیەکی عەرەبی بوون و تا ئێستە هیچ بەڵگە یا پەیام و وتارێک نەدۆزراوەتەوە، داواکردنی دەوڵەتێکی ئایینی لێبخوێندرێتەوە. بۆ زۆری ئەو داوایانە، بڕوانە: حسن العلوي، الشيعة والدولة القومية في العراق ۱۹۱٤-۱۹۹۰، مكتبة الصدر، إيران، ۲۰۰٥، ص۳۱۳. (و.ع)

[۱۷۰] نامەی ڕۆژی ۱۹۲٦/٦/۲٦ی پشکنێری کارگێڕیی دیوانییە بۆ ڕاوێژکاری وەزیری ناوخۆ. نامەکە لە فایلی ژمارە ۲۷۷دایە.

هەوڵەکانی موحسین شتێکی شایانی باسیان لێنەکەوتەوە. پاش ئەوەی باج، وەک چۆن بڕیاری لێدرابوو، کۆدەکرایەوە، چالاکییەکانی کزدەبوون، تا بەرهەمی چەڵتووک لە وەرزێکیتردا پێدەگەیی. پاش ئەم مەسەلەیە، ئیتر موحسین – کەموزۆر– بە زۆری هەمان ڕێگەی شێخ عەبدولواحید سوکەری هاوڕێی گرتەبەر؛ بووە لایەنگری ئەخاء ساڵی ۱۹۳۰ و کە یاسین هاشمی لە سەروبەندی پیلانگێڕیی سەرکەوتووی سەرۆکهۆزاندا، گەیشتە کورسیی سەرۆکایەتیی وەزیران، خەونەکانی هێنایەدی: چەندین ئیمتیازی باجی وەرگرت و زەویوزاریشی پێبەخشرا. کە ڕژێمی سەربازیی بەکر سدقیش هاتە سەر کار، ئەو هەموو ئیمتیازانەی لەدەستچوون و هاتەوە سەر باری هەمان ڕەفتاری کۆن؛ کەوتەوە پیلانگێڕان، کە ئەمجارە بەکێشیکردە زیندان. ئیتر وای لێهات مێژووی لەوەبەدوای بایەخێکی ئەوتۆی نەبێ.

زەوی، لە ناوچەی سەرۆکایەتیی هۆزی مونتەفیقیش، بناغەی چالاکیی سیاسی بوو. ململانێی مێژوویی نێوان سەرۆکهۆزانی مونتەفیق و ئەو موڵکدارانەی ئالسەعدوون کە لە زەوییەکانیاندا نیشتەجێنەبوون و سەرۆکهۆزانیتری ناخۆشەویستی مونتەفیق کە لە نەوەکانی بنەماڵەی سەرگەورەی سەرۆکانی هۆزی پێشتر حوکمبەدەستی مونتەفیق بوون، بە درێژیی چڵ ساڵی دواییی حوکمی پاشایەتیی عیراق بەردەوامبوو. ئەم ململانێیە یەکێکە لەو چەند هۆکارە هاوبەشانەی زنجیرەیەکی درێژی ڕووداوی کەموێنە کە لیوای مونتەفیقیان پێ جویدەکرێتەوە، چونکە سەرۆکهۆزانی لیواکە فرەژمارە و تا ڕادەی بێهیوایی یەکنەگرتووبوون و بە دەگمەن یەکیاندەگرت. جاروباریش پێکەوە دەگونجان و کاریان لەو کێشانەدا دەکرد کە جێگەی بایەخی ئالسەعدوونیش بوون. ساڵی ۱۹۲۲ و لە سەروبەندی بەرەنگاریی کاتیی مەلیک فەیسەڵدا دژ بە پلانی ئینتیدابی بریتانیا، دەمودەست جووڵانەوەیەک بەرپابوو بۆ دابڕینی هەردوو لیوای بەسرە و مونتەفیق لە دەسەڵاتی بەغدا. بنەماڵەی سەعدوون خۆیان تێوەئاڵاند و ژمارەیەکی زۆری سەرۆکهۆزانی مونتەفیقیش پشتی مەلیکیان گرت و لێی خڕبوونەوە و کەوتنە ڕیسواکردنی «هەوڵی لە دەرەوەڕا نێوەنێودراوی خیانەتکاران بۆ دابەشکردنی وڵاتە ئازیزەکەی

عیراقمان.»[١٧١] بێگومان سەرۆکهۆزانی مونتەفیق بە خەمی یەکپارچەییی مەملەکەتی عیراقەوە نەبوون، تەنیا بیریان لە بەدیهێنانی خەونە درێژمەوداکەیان دەکردەوە، کە خۆڕزگارکردنیان بوو لە چنگی بنەماڵەی سەعدوونی موڵکداری زەویوزارەکانیان. تەنانەت لەم بۆنەیەیشدا بە تەواوی یەکیاننەگرت، چونکە دوو سەرۆکهۆزی ناوبەدەرەوەیان، سالم خەیوونی سەرۆکهۆزی بەنیئەسەد و خەیوون عوبێدی سەرۆکهۆزی عبوودە، کە پێیان وابوو بەرژەوەندیان لەگەڵ لایەکەیترە، چوونەپاڵ جووڵانەوە جیاییخوازەکە.*

کێشەیەکیتر کە دەکرا سەرۆکهۆزانی مونتەفیق لەسەری یەکبکەون، بەدەستهێنانی مافی موڵکدارانی زەویی سەر ئەو زەوییانەی دەوڵەت بوو کە ڕەنێویاندەهێنان. شێخ سالم خەیوون لە ماوەی دانوستانی پەیماننامەی ئەنگلۆ-عیراقیدا، ئەم مەرامەی لەناو کۆمەڵەی دامەزراندندا بەدیهێنا. ژیاننامەی کورتمەودای شێخ خەیوون، بریتییە لە زنجیرەیەک هەڵە و چەوتی. یەکەم هەڵەی، پشتگرتنی تورکان بوو دژ بە ئینگلیز لە یەکەم جەنگی جیهانیدا.[١٧٢] لە هیندستان لێی پاشگەزبووەوە، بەڵام کە لە دوادواکانی ١٩١٩دا گەڕایەوە، کەوتە داوی ساختەکاریی ناو کۆمەڵێک قەواڵە، بۆ سەلماندنی لافی -گوایە- خاوەنایەتیی مەڵبەندی سیکال.[١٧٣] ئاشکرایە ئەمە لە کاتی خۆیدا وەک نیشانەیەکی لێنەهاتوویی لەسەری نەکەوت و تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ لە یەکەم حکوومەتی قۆناغی گواستنەوەی عیراقدا بە وەزیری بێوەزارەت دامەزرێندرا،[١٧٤] چونکە ئەو دەمە

---

[١٧١] عەریزەکە مێژووی ڕۆژی ٧ی شەوالی ١٣٤٠ (١٩٢٠)ی پێوەیە و سەرۆکهۆزانی حومەیید، بەنیڕوکاب، خەفاجە، بەنیسەعد و ... ئیمزایانکردووە. لە فایلی ژمارە ١٩٢٤دایە، بە ناونیشانی "جموجووڵەکانی جوێبوونەوەی بەسرە لە عیراق".

* حەننا بەتاتۆ لە کتێبەکەیدا (عیراق- کتێبی یەکەم) بە درێژی لەم کێشەیە دوواوە و ڕوونیکردووەتەوە کە ژمارەیەک موڵکدار و دەوڵەمەند و دەسترۆی بەسرە، داوایانکردووە بەسرە لە سایەی پاریزگاریی بریتانیادا دابڕن و جەختیانکردووەتەوە کە عەبدولموحسین سەعدوونی سەرۆکوەزیرانی چەند جارێکی وڵات، پشتیوانی کێشەکەیانە. بڕوانە: حنا بطاطو، المصدر السابق، ص٣٦٤). (و.ع)

[172] Office of Civil Commissioner, (Secret) Pwersionalities, Iraq (Exclusive of Baghdad and Khadimain), p. 111.

[173] Administrative Report of Amarah for 1920-1921, pp. 1-2.

[174] Stephen N. Longrigg, Iraq 1900-1959, p. 127 footnote.

دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لێی ڕازیبوون. ساڵی ١٩٢٢، پشتیوانیی ئینتیدابی بریتانیا و جووڵانەوەی خۆبەڕێوەبەری (ئۆتۆنۆمی)ی هەردوو لیوای بەسرە و مونتەفیقی لە سایەی پارێزگاریی ئینگلیزدا کرد. لە ١٩٢٤دا، بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی دامەزراندن. ئەوسایش ڕوونبووەوە کە سەرۆکهۆزە هەڵبژێردراوەکانی مونتەفیق، پێبەپێی سەرۆکهۆزانی لیواکانیتری عیراق، دەنگ بۆ پەیماننامەی ئەنگلۆ-عیراقی دەدەن. لە ڕاستیدا، هەموو سەرۆکهۆزە بە نوێنەر هەڵبژێردراوەکان، پێش دانیشتنی کۆمەڵەی دامەزراندن، کۆبوونەوە و سوێندیان خوارد پشتگیریی پەیماننامەکە بکەن.[١٧٥] بەڵام وێڕای ئەوە و لە پێوشوێنی وتووێژدا، شێخ خەیوون چەند بۆچوونێکی بێپەردەی چاوەڕواننەکراوی دەربڕی و بە دەستپێشخەریی ئەو، بەرهەڵستییەکی خێڵەکی بە پشتیوانیی هەموو سەرۆکهۆزانی نوێنەرانی مونتەفیق سەریهەڵدا. ئەو سەرۆکهۆزانە ڕایانگەیاند: ئەگەر مەلیک هێندێ ئیمتیازیان لە دەستووردا بۆ زامننەکا، پەیماننامەکە قبووڵناکەن. داوا سەغڵەتکەرە پێشکەشکراوەکەیشیان ئەوەبوو: «موڵکایەتیی زەوییە بەکرێدراوەکانی دەوڵەت، لە سەرۆکهۆزەکانەوە نەچێتە دەست کەسیتری جگە لەوان.»[١٧٦] داوا سەیرەکەیتریشیان کە ویستیان بیخەنە دەستوورەوە، بەندێکە پێوەندیی بە حوکمی عورفییەوە هەیە؛ داوایانکرد هەر لیوایەک حکوومەت بیەوێ حوکمی عورفیی تێدا ڕابگەیێنێ، پرسوڕاوێژ بە دوازدە سەرۆکهۆزی بکرێ. دواجار داوایانکرد قانوونی ناکۆکییە خێڵەکییەکانیش وەک خۆی بمێنێتەوە. هەر دوایین خاڵ ڕەزامەندیی مەلیکی بۆ وەرگیرا. سەرەنجام سەرۆکهۆزانی مونتەفیق ڕوانییان پەیماننامەکە گران لەسەر عیراق دەکەوێ، بەوپێیە بە توندی دەنگیان لە دژی دا؛[١٧٧] بە پێچەوانەی سەرۆکهۆزانی ڕووباری دیجلەوە، کە تاسەر شێلگیرانە پشتگیرییان لە پەیماننامەکە کرد و پاشتریش لە چەندین بۆنەدا ئەوەیان بیری ئەفسەرانی ئینگلیز دەهێنایەوە.

شێخ خەیوون، دواتر پەیی بە سەرەنجامی حیسابە چەوتەکانی خۆی برد و لە کۆبوونەوەیەکی دواتری کۆمەڵەی دامەزراندندا، داوایکرد پایەی سەرۆکهۆز بە

[175] (Secret) Intelligence Report No. 7 of 3.4.1924, para. 229.

[176] (Secret) Intelligence Report No. 9 of 1.9.1924, para. 302.

[177] (Secret) Intelligence Report No. 13 of 26.6.1924, para. 440 and Enclosurew D and E, pp. 4-5 for the result of voting of the treaty.

میرات بمێنێتەوە و پارێزراوبێ و حکوومەت دەستی تێوەرنەدا؛[178] وتوویژەکەیش لەم خاڵەدا کۆتاییی پێهێنرا. شێخ خەیوون، پاش هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی دامەزراندن، کۆتاییەکی بەختەوەری نەبوو، چونکە چەند مانگێک لەوەبەدوا تاوانی دژایەتیی حکوومەتی لە ناوەندی خێڵاتی حەممار‌دا درایەپاڵ و ۱۹۲٤/۱۱/۳۰ فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانیی شاهانەی بریتانیا میوانخانە خێڵەکییەکەیان بۆردومانکرد.[179] ئەویش هەڵاتە هۆرەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی چبایش و سەرۆکایەتییەکەی هۆزی بە یەکجاری هەڵوەشێندرایەوە. ئەو وەزیری ناوخۆیەیش کە داوای بۆردومانی میوانخانەکەی کرد، عەبدولموحسین سەعدوون بوو!

بێهوودەیە بتوانین بەدوای سامانی هەر سەرۆکهۆزێکی بچووکی مونتەفیق‌دا بچین. بەڵام بەر لەوەی باسی مونتەفیق بەجێبێڵین، پێویستە سەرنجبدەین کە سەرۆکهۆزانی خاوەن چەندین مەڵبەندی پانوپۆڕی وەک خەیوون عوبێدی سەرۆکهۆزی عبوودە و ناوزڕاو* مووحان خەیرولای سەرۆکهۆزی شوێلات[180] (و حومەیید)، هەر یەکەیان لە سەروبەندی ڕووداوەکانی ۱۹۲۰دا، یا لایەنی ئینگلیزی گرت، یان بێلایەن مایەوە و بەشداری ڕووداوەکانی ساڵانی سیش نەبوو. بە پێچەوانەی هەڵوێستی سەرۆکهۆزە بچووکەکانی خوارووی فورات و بەتایبەت سەرۆکهۆزانی ناوچەی سووقی شیووخ (سوق الشیوخ)ەوە، کە دەورێکی چالاکانەیان لە ڕاپەڕینە خێڵەکییەکانی ۱۹۲۰ و ۱۹۳۵-۱۹۳٦دا گێڕا. ئەفسەری سیاسیی شەترە، ئەو شارە کە هەردوو سەرۆکهۆزی ناوبراوی تێدا نیشتەجێن، ساڵی ۱۹۱۹ جەختیکردەوە بۆ سەرۆکەکانی، کە ئەم دوو سەرۆکهۆزە دەست لە ئینگلیز هەڵناگرن و نابنە پشتیوانی جووڵانەوەی دامەزراندنی حکوومەتێک کە شەریفی حیجاز سەرۆکی بێ، چونکە هیوایان بەدەستهێنانی مافی موڵکایەتیی ئەو زەوییە ئەمیرییانەیە کە

---

[178] (Secret) Intelligence Report No. 14 of 10.7.1924, para. 471.

[179] (Secret) Intelligence Report No. 25 of 11.12.1924, para. 759.

* نازانین حەننا بەتاتو بۆچی «ناوزڕاو»ی لە شێخ مووحان خەیرولا ناوە. ڕەنگە هۆیەکەی ئەوەبێ کە لافی دەستبەسەرداگرتنی زەویوزاری خێڵاتی دەوروبەری لێداوە. بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: بۆچی ئەو سیفەتەی نەخستووەتەپاڵ موڵکدارانیتر، کە -هەر لەوەبەتر- دەستدرێژییانکردووەتە سەر زەویی خەڵکانیدی و موڵکێکی گەورەیان دەستکەوتووە؟! (و.ع)

[180] بڕوانە ل١٠٦-١٠٧ی سەرچاوەی پێشوو.

دەستیان بەسەردا گرتوون. ئەگەر حکوومەتی شەریف حوکمی عیراقی کەوتەدەست، ئەوەیان بۆ مسۆگەرناکرێ، لەبەرئەوەی ئەوسا زەوی دەبەخشرێتە هاوکاران و دۆستانی ئەو حکوومەتە* (ئەوە لەگەڵ ئەو زەوییانە کە پاش داگیرکاریی ئینگلتەرە بەخشران بە نۆرماندییەکان، بەراوردبکە).[١٨١] بە ڕاستیش ڕەنگە ببینین چۆن ئەفسەرانی پێشووی شەریف حسێن، کە کۆڵەکەی حوکمی پاشایەتیی عیراق بوون، بوونە موڵکداری زەویوزار. ترسی سەرۆکهۆزانی غەڕاف لە ئەگەری گۆڕینی حکوومەت و هەڵپەی تاوسەندوویان بۆ بەدەستهێنانی پاداشتی زەویوزار،[١٨٢] هەڵوێستیان بەرامبەر بە ڕووداوەکانی ١٩٢٠ لێکدەداتەوە. هەرچی پشێوییەکانی ساڵانی ١٩٣٥-١٩٣٦یشن، ئاشکرایە لە سەرۆکهۆزە بچووکەکانی سووقی شیووخ زیاتر بەشدارییان تێیاندا هەبوو، لەبەرئەوە ئەو ساڵانە زۆر خۆیان نەبەستەوە بە دەسکەوتە لەدەسچووەکانی سیاسییەکانی بەغداوە.

وەک تێبینیدەکەین، باسی چالاکیی سیاسیی پاش ساڵانی سیی سەرۆکهۆزەکان ناکرێ. هۆیەکەی ئەوەیە کە ناوەندی ڕاکێشانی ڕووداوەکان کەوتە ناو شار. فڕۆکەکان و هێزەکانی بەکر سدقی ڕاپەڕینە خێڵەکییەکانی ساڵانی سییان بە ئاسانی و خێرایی سەرکوتکردن، ئەوە مژدەبەخشی کۆتاییهێنان بە سەردەمی سەرۆکهۆزەکان بوو. بەڵام پێش ئەوە، مێژووی عیراق تا ڕادەیەکی زۆر مێژووی سەرۆکهۆزان و هۆزەکانیان بوو؛ بەوپێیە گیروگرفت و پشێوی و سیاسەتەکانی ئەو ماوەیە، بە شێوەیەکی بنچینەیی

---

* ڕاست ئەوە ڕووی دا، چونکە زۆربەی سیاسییە عیراقییەکان، لە سەردەمی پاشایەتیدا، بوونە موڵکداری زەویوزاری کشتوکاڵی لە بەغدا و دیالە و کووت. ناجی شەوکەتی سەرۆکوەزیران لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویە: یاسین هاشمی، یەکێکە لەو چوار کەسە کە بە بەرپرسی چاندنی تووی دەربەگایەتی لە عیراق دادەنرێ. سێیەکەیتر؛ حیکمەت سلێمان و ڕەشید عالی گەیلانی و ڕۆستەم حەیدەرن. بڕوانە: ناجي شوكت، سيرة وذكريات ثمانين عاما ١٨٩٤-١٩٧٤، بغداد، ١٩٧٤، ص٢٧٤. (و.ع)

[181] Shatrah Administration Report for 1919 in Appendix N of the Administration Report of the Muntafik Division for 1919, p. 92.

[١٨٢] کۆمیسێری باڵای بریتانیا هەوڵی خێرخوازانەی خۆی خستەکار، تا مەڵبەندی سدێفە (الصديفة) ببەخشرێ بە شێخ خەیوون عوبێد، چونکە لە ١٩٢٠دا یارمەتییەکی گەورەی داوە بۆ پارێزگاریی نیزام و ڕێکوپێکی. بڕوانە: Intelligence Reports No. 2 and 3 of 15.1.1922 and 1.2.1922, para 148.

خێڵەکی بوون. تەنانەت ڕاپەڕینی ۱۹۲۰یش، هەر کارێکی سەرۆکهۆزەکان و موجتەهیدەکان بوو، بەشداریی بەغدای تێدا هەر لە شێوەی بڵاکراوە و خۆپیشاندن و هەندێ نامەگۆڕکێی نهێنیدا بوو. سەربەخۆییی نیشتیمانی ئەوە نەبوو کە سەرۆکهۆزەکان و موجتەهیدەکان بانگەوازیان بۆ دەکرد، چونکە بیرۆکەی نیشتیمانی نەک هەر خۆشەویست، بەڵکوو مایەی تێکەیشتنیش نەبوو، چونکە ئامانجیان داکۆکیکردن بوو لە ڕژێمی کۆن. ئەوان بە ڕێکەوت شانبەشانی نیشتیمانپەروەران کەوتنە شەڕی پێناوی ئەم ڕژێمە دژ بە هێزێکی داگیرکەری بێگانە. هاوپەیمانە ئاساییە ڕاستەقینەکانیش لەم ململانێیەدا، سەرۆکهۆزەکان و ئینگلیزەکان بوون و بە هۆی خراپ لێکتێگەیشتنەوە شەڕی یەکتریان کرد. ڕاپەڕینەکانیساڵانی سیش، کە سەرۆکهۆزە بێبەشەکان لە هەموو ئیمتیازێک بەرپایانکرد، هیچ ڕەنگوبۆیەکی نیشتیمانی پێکەوەی گرێنەدەدان؛ دەستی سیاسییە بەهەڵپەکانی بەغدایان بە ڕوونی پێوە دیاربوو. ئەم سەردەمی هۆزایەتییە هەر کێشایەوە بۆ سەرهەڵدانی دیاردەیەک، کە دەشێ ناوی بنێین «سیاسییە خێڵەکییەکان». خێڵەکی، لە ڕووی نەک بنچینەی کۆمەڵایەتی، بەڵکوو بیرکردنەوە و ڕێوشوێنیانەوە بۆ پیلانگێڕان، وەک چۆن سەرۆکهۆزەکان و هۆزەکانیش لێیاندەوەشێتەوە، چونکە سەرۆکهۆز داردەستیانە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و هەر بە هۆی ئەویشەوە لادەبرێن. تەنانەت نیشتیمانپەروەرانی ئەو قۆناغەیش، هەر نیشتیمانپەروەری خێڵەکی بوون، چونکە ڕەنگوبۆی نیشتیمانی لە ڕاپەڕینی ۱۹۲۰دا، هەر تەقەلای ژمارەیەکی یەکجار دیاریکراوی نیشتیمانپەروەران بوو، تا هۆزەکان بەکاربێنن بۆ ئامانجی نیشتیمانی.* پاش ساڵانی سی، شار بە شێوەیەکی بەرچاو دەوری خۆی گێڕا و مێژووی عیراقیش لەوەبەدوا تا ڕادەیەکی زۆر بوو بە مێژووی بەغدا و خەسڵەتە بنچینەییەکەیشی بریتیبوو لە سەروەرییەکی ڕاگوزەر و بەردەوامی جەماوەری پایتەخت. ئیتر جەماوەری شارنشین، نەک هۆزەکان، دەبووە سۆنگەی ڕووخانی وەزارەت، وەک لە سەروبەندی ڕاپەڕینەکانی ۱۹٤۸ و ۱۹۵۲دا ڕووی دا. دێهاتی خێڵەکیش، تەنیا چەند ڕاپەڕینێکی خۆجێیی

---

* خێڵەکان، چەکی زەبروەشێنی دەستی نیشتیمانپەروەران و سەربەخۆییخوازان بوون لە عیراق. تەنانەت دەڵێن: سەرانی شۆڕشی بیست بریتیبوون لە مەرجەعەکانی دین و هاندەرانیش نیشتیمانپەروەران و ئامرازی کارای شەڕکەریش خێڵە ڕاپەڕیوەکان بوون. بڕوانە: جاریث ستانسفیلد، العراق: الشعب والتأريخ والسياسة، مركز الإمارات للدراسات، أبوظبي، ۲۰۰۹، ص۵۰. (و.ع)

بچووکی تێدا قەوما، ئارامییە باو و ناجێگیرەکەی دەشڵەقاند. ئەو ڕاپەڕینانە لەژێر سەرکردایەتیی سەرۆکهۆزەکان‌دا نەبوون، وەک چەند دەیەیەکی پێشوو، بەڵکوو دژ بەوان بوون؛ بە وێنە، شۆڕشی ساڵی ١٩٥٢ی جووتیاران و سەرکارانی ئۆزێرج دژ بە سەرۆکهۆزانی عەمارە. حوکمی پاشایەتی و سەرۆکایەتیی هۆز، لەم پشێوییە دێهاتی و شارییانەدا، پەردەیان لەسەر بەرژەوەندی هاوبەشیان هەڵدایەوە و یەکیان‌گرت، بەو هیوایە کە ئەم هەڕەشە تاوسەندووە دژ بە جێوڕێ و ئیمتیازەکانیان ڕابگرن. ئەم هاوپەیمانییە توندوتۆڵە لە بیست‌ساڵی پێش شۆڕشی ١٩٥٨دا باڵادەست‌بوو و لە ڕێگەی تێکشکاندنی سیستەمی پاشایەتییەوە، دوایی بە چارەنووسی سەرۆکایەتیی هۆز هێنا.

ئاواتەخوازم پێتان وانەبێ من لە بەندی ڕێگەخۆشکەری پێشوودا، وام داناوە مێژووی ڕەفتاری سیاسیی سەرۆکهۆزەکان پێشکەش‌بکەم. تاکە مەبەستم سەرنج‌ڕاکێشانتانە بۆ بایەخی یەکالاکەرەوەی بەرژەوەندی گەورەی سەرۆکهۆز لەو مێژووەدا، کە بریتی‌بووە لە بەهێزکردنی چنگی خۆی و توندتر گیرکردنی لە زەوی.

**سیاسەتی حکوومەتی پاشایەتیی عیراق:**

مەلیکی عیراق و سەرۆکهۆزەکان، هەردوو هاوشێوەی یەکتر بوون؛ لە کاتێک‌دا مەلیک نوێنەرایەتیی بنەمای ناوەندگری (المركزية)ی دەکرد، زیادبوونی هێزی ئەم، لەقکردنی جێ‌پێی سەرۆکهۆزەکان دەگەیاند. ڕۆژانی یەکەمی حوکمی پاشایەتی، هێندێ سەرۆکهۆزی گەورە مەلیکی بە سەرۆکهۆزێکی‌تری نەیار دانا، بە ڕواڵەت بۆ ڕازیکردنی ئینگلیز سوێندی لایەنگرییان بۆ خوارد. هەڵوێستی سەرۆکهۆزی دلێم و عەنزە لەم بارەیەوە، هەڵوێستی سەرۆکهۆزانی‌تریشی دەردەبڕی. کاتێک مەلیک لە ١٩٢١/٧/٣١دا چووە ناوچەکانیان لەسەر فورات و سەری‌لێ‌دان، پێیان گوت: «ئەی فەیسەڵ، ئێمە بەیعەتت پێ‌دەدەین، چونکە دەسەڵاتدارانی ئینگلیز تۆیان قبووڵە!»[١٨٣] ئەم ناساندنەی پێوەندیی سیاسی لە ڕوانگەی مەلیکێکەوە کە بەتەمابووە دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو عیراق‌دا بسەپێنێ، شتێکی قبووڵکراونییە. مەلیک فەیسەڵی یەکەمیش، دەورێکی هاوچەشنی دەوری سەرپەرشتی شاهانەی فەڕەنسەیی French Royal Antendantsی دا بە موتەسەریفانی پێشووی خۆی، تا پایەکانی ئەم

---

[183] Lady Bell, II, p. 165.

هێزە نەیارانە بلەقێنن. کە ساڵی ۱۹۲۲ یاسین هاشمیی وەک موتەسەرپیف ناردە لیوای مونتەفیق، قەناعەتیهێنا کە باشترین ڕێگە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ سەرۆکهۆزەکان، وێرانکردنی قەڵاکانیان و ناچارکردنیانە بە ملکەچی. بەڵام ڕاوێژکاری ئینگلیز لەو لیوایە، بەرهەڵستیی ئەم بڕیارە قورسەی کرد.[184] حکوومەتی پاشایەتیش، بەبێ ڕەزامەندیی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز، ئەو هێزە سەربازییە پێویستەی نەبوو ئەم سیاسەتە جێبەجێبکا. بینیمان چۆن هەوڵی هەڵگێڕانەوەی هاوسەنگیی سەربازیی دژ بە سەرۆکهۆزەکان، بە بڕیارنەدان لەسەر پرۆژەی بەسەربازگرتنی زۆرەملێ، سەریگرت و مەلیکیش دەبوو پەنابباتە بەر ڕێگە و ئامرازیتری ناڕاستەوخۆ.

یەکێک لەم گرنگترین ئامرازە کارایانەیش لە مەودای دووردا، کە لەوانەبوو ببێتە ڕەنگرێژی یەکەم قۆناغی زەبروزەنگ لە مێژووی حوکمی پاشایەتی خۆیدا، هەستی نیشتیمانی بوو. پاشایەتی، لە ساڵانی یەکەمیدا، بیری نیشتیمانیی کردە موڵکی خۆی و جۆشی پێسەند و بناغەی بۆ دانا. ئێستە ئیتر ئەم خاڵە لەبیربرایەوە و پاشتر بەرهەڵستیی پاشایەتیی دژ بە نیشتیمانپەروەران، نەک هەر پەردەپۆشیکرد، بەڵکوو لە هێندێ دۆخیتردا لەوەیش زیاتری تێپەڕاند. لە چەند شوێنێکی بەندەکانی پێشوودا، ئاماژەمان بۆ کرد چۆن مەلیک تێکۆشا سەرۆکهۆزەکان بە توندی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی و چۆن ئەمە هەمیشە دەبووە هۆی پێکداهەڵپژانی لەگەڵ حکوومەتی بریتانیا. سیاسەتی بریتانیا و سیاسەتی مەلیک بە زۆری ناکۆکدەبوون و ئەم پێکداهەڵپژانانەیش بە شێوەیەکی ئاسایی لە سەروەختی ئاڵۆزبوونی پێوەندییەکانی بریتانیا و عیراقدا دەگەیشتنە ترۆپک؛ وەک کاتی ئیمزاکردنی پەیماننامەی ۱۹۲۲، کە بنەماکانی ئینتیدابی بریتانیای لەسەر عیراق دیاریکرد؛ یا کاتی پێداچوونەوەی هەمان ڕێککەوتننامە ساڵی ۱۹۲۷. لەبەرئەوە لە ۱۹۲۲دا -دەڵێن- جەودەت ئەیووبیی هاوڕێ و بریکاری مەلیک و سەرۆکوەزیران و پاشتر موتەسەرپیفی حللە، لەگەڵ عەبدولواحید سوکەری سەرۆکهۆزی فەتلەی ناسراو بە بەرەنگاریی حوکمی ئینگلیز لە عیراق، پلانێکی داڕشتبوو. پلانەکە بەو شێوەیە بوو کە حکوومەتی مەلیک بکەوێتە پشتگیریی سەرۆکهۆزێکیتری

---

[184] Office of the High Commissioner, (Secret) Intelligence Report No. 16 of 15.8.1922, para. 785.

نەیاری هەموو سەرۆکێکی ئەوسای هەر یەکە لە هۆزەکانی فوراتی ناوەڕاست، کە یا ئینگلیزەکان دایاننناوە، یا ئەوان ددانیان بە سەرۆکایەتییەکەی‌دا ناوە؛ هانیشی‌بدەن گوێڕایەڵی فەرمانەکانی سەرۆکهۆزی ئەو کاتە نەبن.[185] زانراویشە کە مەلیک فەرمانی‌داوە نێوەنێوی خەڵکی دێهات بدەن، تا پەیماننامەکە ڕەت‌بکەنەوە و بڕەپارەیەکی گیرفانی خۆیشی بۆ بەجێ‌هێنانی ئەم مەرامە خەرج‌کردووە. مەلیک -هەروەها- پاداشتی ڕێزلێنانی شاهانەی خۆی بەخشیوە بە هێندێ سەرۆکهۆزی نەیاری سەرۆکهۆزانی لایەنگری ئینگلیز، وەک نجرس گعوود* لە هۆزی دلێم، کە نەیاری شێخ عەلی سولەیمانی لایەنگری ئینگلیزەکان بوو و هەر دەسەڵاتدارانی ئینگلیز خۆیان ساڵێک لەوەوبەر ڕایانگەیاندبوو ملپێچیی قانوونی کردووە.[186] لە لیوای مونتەفیقیش، موتەسەڕیف «بە فەرمانی تایبەتی مەلیک» کەوتە برینی پارەی تەرخانکراوی بەخشراو «بەو سەرۆکهۆزانە کە ئینگلیزەکان دایاننابوون، تا ملکەچیان‌بکا»[187] و ڕازی‌نەبوو بیانکا بە باجگری حکوومەت. لە ئەنجامدا، ناچارکرا دەست لە کار بکێشێتەوە و ڕووبکاتە بەغدا، بەڵام مەلیک فەرمانی پێ‌دا بگەڕێتەوە سەر کارەکەی. پاشان «کۆمیسێری باڵای ئینگلیز بە توندی بەسەر مەلیک‌دا هات کە نەگەڕێتەوە و پێی‌ڕاگەیاند حەزناکا لەو وەزیفەیەدا بمێنێتەوە، لەبەر هەڵوێستی بە ڕوونی دوژمنکارانەی بەرامبەر بە ئینگلیزەکان.»[188] مەلیک، هەر ملکەچیی داواکەی بۆ مایەوە! ڕائید یێتیسی ڕاوێژکاری ئینگلیزیش لەو لیوایە، دەستی لە ڕێکخستنی مەزبەتەی سالم خەیوون و خەیوون عوبێدی جووتە سەرۆکهۆزی مونتەفیق‌دا هەبوو، بۆ داواکردنی ئینتیدابی بریتانیا و دابڕینی لیواکانی

---

[185] Office of the High Commissioner, (Secret) Intelligence Report No. 10 of 15.11.1922, para. 431.

* نجرس گعوود: سەرۆکی خێڵی ئالبونمرە لە هۆزی دلێم. لە سەروبەندی شۆڕشی بیست‌دا، بەشدارییەکی لە جووڵانەوەی دێرزووردا هەبوو دژ بە هێزەکانی ئینگلیز. عەلی وەردی دەڵێ: لەبەرئەوە لە ئینگلیز ناڕازی‌بوو، کە ئەوان خۆیان لە عەلی سولەیمانی سەرۆکهۆزی دلێمی نەیاری نزیک‌کردبووەوە. بڕوانە: علي الوردي، لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث، ج ٥، دار الراشد، بيروت، ٢٠٠٥، ص١٥٥. (و.ع)

[186] (Secret) Intelligence Report No. 15 of 1.8.1922, para. 700.

[187] (Secret) Intelligence Report No. 16 of 15.8.1922, para. 785.

[188] (Secret) Intelligence Report No. 10 of 15.5.1922, para. 408.

مونتەفیق و بەسرە لە دەسەڵاتی حکوومەتی عیراق و خستنیانە بەر پارێزگاریی بریتانیا؛ وەک ڕێگەیەک بۆ هەڵپێچانی مەلیک، تا پەیماننامەی ۱۹۲۲ ئیمزا و ئینتیدابی بریتانیایش قبووڵ بکا.[١٨٩]

کاتێکیش مەلیک نەیتوانی دەست لە سەرۆکهۆزەکان بوەشێنێ، چونکە ئینگلیزەکان دەیانپاراستن، هەوڵی دا بەکاریان‌بێنێ بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستی خۆی لە بەردەم ئینگلیزەکان‌دا. لەبەرئەوە -دەڵێن- لە حوزەیرانی ۱۹۲۷دا فەرمانی بە جەمیل مەدفەعیی موتەسەڕیفی دیوانییە داوە، دنەی سەرۆکهۆزانی لیوا بدا بکەونە خۆپیشاندان دژی ڕێککەوتنە سەربازی و داراییەکانی بریتانیا - عیراق و داوای سەربەخۆیی بکەن. لە پاداشتی ئەم خزمەتەیشیان‌دا، چەندین کێشەی گرنگی سەر زەوی‌وزار بە قازانجی ئەوان یەکلاکرایەوە.[١٩٠] دیوانییە، بە هۆی مێژووەکەی پێشوویەوە و بە حوکمی ئەوەی سەرکردایەتیی ڕاپەڕینی ۱۹۲۰ی کردبوو دژ بە ئینگلیزەکان، بە ئاسانی بەپیر مەرامی حوکمی پاشایەتییەوە دەچوو. مەلیک، لەم ڕێگەیەوە هەڵوێستی خۆی لە بەردەم ئینگلیزەکان‌دا بەهێزکرد و زیاتر ملیان بۆ داواکانی دا. ئەمەیش بووە مایەی بەهێزکردنی هەڵوێستی بەرامبەر بە سەرۆکهۆزەکان خۆیان.

ئەگەر بچینەوە سەر ئەو پرسیارە کە کردمان: سەرباری هەم مێژووی پێکدادانی بەرژەوەندەکانی مەلیک و سەرۆکهۆزەکان و هەم کشانەوەی دەسەڵاتدارانی بریتانیا لە ۱۹۳۲دا، کە سەرۆکهۆزەکان وەک چینێکی کۆمەڵایەتی زۆر پشتیان پێ‌دەبەستن، بۆچی سەرۆکهۆزەکان بەردەوام بەهێزتردەبوون؟

ئەم پەرەسەیە، چەند هۆیەکی گرنگی هەیە؛ هەندێکی وەک کلیلی تێگەیشتنی هەموو مێژووی ئەوەبەدوای عیراق وایە. هۆکاری کەمتر گرنگ ئەوەیە کە سەرۆکهۆز ئیتر پاش ئەوەی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز ۱۰ ساڵی ڕەبەق بە تەواوی پشتیان‌گرت، توانیی داکۆکی لە خۆی بکا. وێڕای ئەوە، حکوومەتی ناوەندی بە دۆخێکی سەربازیی بێ‌هێزەوە فەرامۆش‌کرابوو. هەروەها وەک مەلیک لە

---

[١٨٩] المفید، ژمارە ٥٥، حوزەیرانی ۱۹۲۲؛ الاستقلال، ژمارە ۱۱۲، ۱۹۲۲/٦/۱۸؛ (Secret) Intelligence Report No. 13 of 1.7.1922, para. 574 and pp. 15 and 18.

ڕاپۆرتی ژمارە ۱۳ی ۱۹۲۲/۷/۱ی هەواڵگری (نهێنی)، برگەی ٥٧٤ و لاپەڕەکانی ۱٥، ۱۸.

[190] On the basis of the Diwaniya British Ispector of Police`s Letter of 14.6.1927 in Major Wilkin`s File on Jamil Al-Midfai No. 796.

بیرخەرەوەیەکی نهێنیی مارتی ۱۹۳۳ی‌دا ڕوونی‌کردووەتەوە، پتر لە ۱۰۰ هەزار تفەنگی وڵاتەکە بەدەست هۆزە عیراقییەکانەوە بووە، لە کاتێکدا حکوومەت ۱۵ هەزار تفەنگی هەبووە و ژمارەی جەنگاوەرانی سوپاکەیشی هەر ۷۵۰۰ کەس بووە! ئاشکرایە مەلیک لە سایەی ئەم جۆرە هەلومەرجەدا، نەیدەتوانی بە جەربەزەیی بجووڵێتەوە. ئەگەر پیاوی هۆز پەرۆشی شەڕکردن نەبووبێ لە پێناوی مانەوەی سەرۆکهۆزەکەی‌دا، پێ‌بەپێ لایەنگرێکی ڕاستەقینەی مەلیکیش نەبووە. مەسەلەکە بە لای ئەوەوە، گۆڕینی سەرگەورەیەکە بە سەرگەورەیەکی‌تر و دەشێ قەناعەتی پێ‌بکرێ سەرکێشییەک‌بکا و گفتی پاداشتێکی ماددیشی بدرێتێ. سەرەڕای ئەوەی کە مەلیک سووربوو لەسەر سەروەریی حوکمی پاشایەتی و لەدەسەڵات‌خستنی سەرۆکهۆزەکان، هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە سەرۆکهۆزەکان وەک چینێکی کۆمەڵایەتی تێک‌بشکێنێ. فەیسەڵ، لەو بیرخەرەوە باسکراوەی‌دا، ئامۆژگاریی دۆستە نزیکەکانیی کردووە[191] و گوتوویە: «دەبێ سەرۆکهۆزەکان یا ئاغاکان وا هەست‌نەکەن حکوومەت نیازیەتی تێکیان‌بشکێنێ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، پێویستە ئەوەندەی هەلومەرج دەرفەت‌بدا، جەختیان بۆ بکەینەوە کە خەمخۆری خێر و خۆشگوزەرانیی ئەوانین.»[192] هۆکارەکەی‌تر ئەوەبوو کە موڵکدارانی زەویی نیشتەجێی شارەکان و گەورە ئەفسەرانی پێشووی شەریفی،[193] کە ئەنجومەنی وەزیرانیان لێ پێک‌هات و ئەوانیش بوون بە موڵکداری زەوی، وای لێ‌هات بەرژەوەندیان لەگەڵ چینی موڵکدارانی زەوی و سەرۆکهۆزانی‌تر هەبێ؛ هەرچەندە لەوانەبوو بەرژەوەندەکانیان ناکۆک‌بن، چونکە موڵکدارانی نیشتەجێی شارەکان، بە پێچەوانەی سەرۆکهۆزەکانەوە، زیادبوونی دەستڕۆیی و دەسەڵاتی شاریان پێ باشتربوو. لە هەموو بارێکدا، ئەو قانوونە کە موڵکدارانی نیشتەجێی شارەکان کەڵکیان لێ‌دەبینی، ئاسایی لە بەرژەوەندی سەرۆکهۆزەکانیش‌دا بوو.

بەڵام نەبوونی هاوسەنگی لەناو حکوومەتەکەی مەلیک‌دا، زەمینەی بۆ پارێزراویی جێ‌ورێی سەرۆکهۆزەکان خۆش‌کرد، لەبەر: یەکەم- کۆچی‌دوایی

[191] جەعفەر عەسکەری، نووری سەعید، ناجی شەوکەت، جەعفەر ئەبوتمەن، ناجی سویدی، عەلی جەودەت ئەیووبی و مەلیک عەلیی برای.

[192] Ibid, p. 291.

[193] ئەو ئەفسەرانە بوون کە شان‌بەشانی فەیسەڵ و براکانی لە کوڕانی شەریف حسێن، لە سەروبەندی یەکەم جەنگی جیهانی‌دا، دژ بە تورکان شەڕیان‌کرد.

مەلیکی لێزان، فەیسەڵ لە ١٩٣٣دا و چوونە سەر تەختی حوکمی لاوی بێئەزموون، غازی و دووەم و گرنگترینیان- بەرزبوونەوەی ئەفسەرانی لاوی سوپا وەک هێزێکی سەربەخۆی سیاسی (قۆناغی هەڵکشانی ئەستێرەی بەختی باڵی سەربازی لە ١٩٣٦ەوە، پاش کودەتاکەی بەکر سدقی، درێژدەبێتەوە تا ١٩٤١، کە جووڵانەوەی نەتەوەیی ئەفسەرانی ناوبراو بە جووڵانەوەی ڕەشید عالی گەیلانی سەریئەگرت).* نەبوونی ئەم هاوسەنگییە بە دوو شێوە بە قازانجی سەرۆکهۆزەکان شکایەوە: یەکەم- ئەو سیستەمی دابەشکردنی دەسەڵاتەی کە لە بیری ئینگلیزەکان‌دا بوو سەبارەت بە عیراق، شێلگیرانە تێکوپێکی دا و ئەمەیش لە قۆناغێکی شلۆقی ململانێی جیهانی‌دا، خێراتر هاوپەیمانانی کۆنی سەرۆکهۆزەکانی هێنایەوە مەیدان. لە قۆناغی داهاتووی گەڕانەوەی داگیرکاریی ئینگلیزدا (١٩٤١-١٩٤٥)، ئاسایی بوو ئینگلیزەکان پێڕەوی سیاسەتی پێشووی بەهێزکردنی دێهاتی خێڵەکی بکەنەوە، بەتایبەت کە جووڵانەوەی نەتەوەیی سەربازیی ساڵی ١٩٤١، هێزی خۆی لە خەڵکە شارنشینەکە وەرگرتبوو و هەر کەمتەرخەمی و گوێپێنەدانیشی لە سەرۆکهۆزەکانەوە پێبڕابوو. لەبەرئەوە ئەفسەرانی تازەی پێوەندیی ئینگلیز، هەمان ئەو دەورەیان گێڕا کە ئەفسەرانی سیاسیی سەردەمی داگیرکاری و پشکنێرە کارگێڕییەکانی قۆناغی ئینتیداب گێڕایان. سەرۆکهۆزەکانیش، بە ڕێگەیەکی‌تر، سوودیان لەم بێسەروبەری و نەبوونی هاوسەنگییە بینی. عەبدولئیلا، کە پاش مردنی مەلیک غازی لە ١٩٣٩دا، جڵەوی سەرکردایەتیی حوکمی پاشایەتیی بەدەستەوەگرت و لە دەورانی تەنگوچەڵەمەی ١٩٤١دا سەری خۆی دەرکرد و هەڵات، بەڵام بە هۆی ئینگلیزەکانەوە هێنرایەوە سەر پلەوپایەکەی خۆی؛ ئیتر لەگەڵ نووری سەعیدی گرنگترین کەسێتیی مەملەکەت، پێکەوە پەییان پێبرد کە سەرۆکهۆزەکان دوژمنی ڕاستەقینەی مەملەکەت نین،

---

* پاش ئەوەی سەرۆکخێڵەکان، وێڕای فەتوای مەرجەعەکانی شیعە و سوننە، پشتیان‌کردە جووڵانەوەی مایسی ١٩٤١ و بەشدارییان لە شەڕدا نەکرد، عەبدولئیلا ویستی، لە پاداشدانەوەیان‌دا لەسەر ئەم هەڵوێستە، دووبارە بەهێز و جارێکی‌تر سازوتەیاریان بکاتەوە و تێهەڵکێشی کاری سیاسییان بکا. کاتێکیش خرانە ڕیزی حیزبی ئیتیحادی دەستووریی دەستنێژی نووری سەعید و نوێنەرایەتییان لە پەرلەمان و حکومەت‌دا زیادکرا، ئەم سیاسەتە بە ڕوونی کەوتەڕوو. بڕوانە: حنا بطاطو، العراق، الكتاب الأول، ص١٣١. (و.ع)

بەڵکوو سوپای شاهانە خۆی، هەرچەندە پاکسازییەکی بەرفراوانی تێدا کراوە و لە ڕابوردوودا تەوەری سیاسەتی حوکمی پاشایەتی بووە، متمانەی پێناکرێ. لەبەرئەوە سیستەمی دابەشکردنی هێزە سیاسییەکانی ناوخۆ لە ١٩٤٦-١٩٥٨دا، ئاماژە بۆ جیاوازییەکی بەرچاو لەگەڵ ئەوەی ساڵانی ١٩٢١-١٩٣٢ دەکا. لە کاتێکدا مەلیک و سەرۆکهۆزان و موڵکدارانی زەوی لە ساڵانی بیستدا بە ڕواڵەت و درۆزنانە وایان نیشاندەدا زۆر هاوکاری یەکترن، لە ڕاستیدا بە شێوەیەکی گەرموگوڕ خەریکی ململانێی یەکتری بوون و مەلیکیش لە زۆربەی دۆخەکاندا ژێربەژێر پشتیوانیی ماددی و مەعنەویی جووڵانەوەی نەتەوەییی دەکرد. بەڵام لە ساڵانی ١٩٤٦-١٩٥٨دا، مەلیک و سەرۆکهۆزەکان و موڵکدارانی زەوی دەستیان خستە ناو دەستی یەکتر، چونکە ئەوسا لەبەر گەشەکردنی چینێکی چەپڕۆ یا نەتەوەخوازی توندڕۆ* کە هاوپەیمانی جەماوەری شارەکان بوو و -وەک پاشتر دەردەکەوێ- جێپێیەکی قایمی لەناو سوپا خۆیدا هەبوو، ڕووبەڕووی هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە بووبوونەوە. هەموو ئەم هۆکارانە پێکەوە تەمەنێکی زیاتریان، ئەگەرچی کورتدەبێ، بەخشی بە سەرۆکهۆزەکان.

یەکێک لە ئاماژەکان سەبارەت بە گۆڕانی سیاسەتی حوکمی پاشایەتی بەرامبەر بە سەرۆکهۆزەکان، ژمارەی ئەو کورسییانەیە کە لە خولە جیاجیاکانی پەرلەماندا بەخشراون بەم چینە. وەک خشتەی ژمارە ٢ ڕوونیدەکاتەوە، سەرۆکهۆزەکان ١٩-٢٠٪ی کورسییەکانی پەرلەمانی مەلیک فەیسەڵ و ١٠٪ی پەرلەمانی پشتئەستوور بە هێزی سەربازیی هەبوو، لە کاتێکدا ڕێژەکەیان لە پەرلەمانی نووری سەعید و عەبدولئیلادا گەیشتە ٤٠-٤٢٪، واتە هەمان ڕێژەی کۆمەڵەی دەستووری کە ئینگلیزەکان لە ١٩٢٤دا دایانمەزراند.

---

* پاش دووەم جەنگی جیهانی و لە ئاکامی لێکەوتەکانی جەنگی ساردی (١٩٤٥-١٩٩٠)ی نێوان هەردوو سەربازگەی لیبراڵیی ڕۆژاوا و سۆشیالیستیی ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێبازە شۆڕشگێڕی و چەپڕۆییەکان باڵیان بەسەر چالاکیی ڕۆشنبیری و سیاسیی کۆمەڵی عێراقیدا کێشا. ئامانجی دەستبژاردەی ڕۆشنبیرانی عێراقیش، بوو بە هەڵتەکاندن و ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی. گرتنەبەری ڕێبازە شۆڕشگێڕییەکان و کاریگەریی وتارەکانی جەمال عەبدوناسر و شۆڕشی میسریش، یەکەم هێزی بزوێنەری ئەم ڕێبازە بوون. (و.ع)

**خشتەی ژمارە ٢**

**نوێنەرایەتیی سەرۆکهۆزەکان لە پەرلەمان (لە چەند ماوەیەکی جیاوازدا)[١٩٤]**

| | | ژمارەی کورسیی تەرخانکراو بۆ سەرۆکهۆزەکان | ژمارەی سەرجەمی کورسییەکان | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مەجلیسی مەبعووسانی تورکی لە ١٩١٤دا | ٢[°] | ٣٤[°°] | ٪٦ |
| ٢ | کۆمەڵەی دەستووری کە ئینگلیزەکان لە ١٩٢٤دا دایانمەزراند | ٤١ | ٩٩ | ٪٤١ |
| ٣ | پەرلەمانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە ١٩٢٥دا | ١٨ | ٨٨ | ٪٢٠ |
| | ١٩٢٩ | ١٧ | ٨٨ | ٪١٩ |
| ٤ | پەرلەمانی پشتئەستوور بە هێزی سەربازیی ١٩٣٧ | ٢٢ | ١١١ | ٪١٩ |
| ٥ | پەرلەمانی نووری سەعید و عەبدولئیلا لە ١٩٥١دا | ٥١ | ١٢٧ | ٪٤٠ |
| | ١٩٥٤ | ٥١ | ١١٩[°°°] | ٪٤٢ |
| | ١٩٥٨ | ٥٨ | ١٤٥ | ٪٤٠ |

گوتمان، «چەند کورسییەک تەرخانکرا» بۆ سەرۆکهۆزەکان. ئەمە لە ڕووی ڕەسمییەوە ڕاستنییە، چونکە هەمیشە ڕواڵەتەکانی «هەڵبژاردنی ئازاد» ڕەچاودەکرێن. پشکنێری کارگێڕیی هەردوو لیوای دیوانییە و کەربەلا، ڕاپۆرتێکی

[١٩٤] سەرچاوە: ناوی نوێنەرانی ١٩١٤ لە: مذكرات سليمان فيضي، في غمرة النضال، ص.١٤٠، وەرگیراوە. ناوی نوێنەرانی ١٩٢٤ و ١٩٢٥یش، لە هەردوو ڕاپۆرتی هەواڵگریی ژمارە ٧ی ١٩٢٤/٤/٣ و ژمارە ١٣ی ١٩٢٥/٦/٢٥، بەرودوا لاپەڕە ٧-٩ و ٤-٧ وەرگیراوە. ناوەکانیتر لە "الوقائع العراقية"، یا "محاضر مجلس النواب" وەرگیراون. ناوەکانی پەرلەمانی ١٩٥٤ و ١٩٥٨ نەبێ، کە لە ڕۆژنامەی "صوت الأهالي" (١٩٥٤/٦/١١) و ڕۆژنامەی "الحرية" (١٩٥٨/٥/٦) وەرگیراون.

[°] ئەو نوێنەرانە کە سەرۆکهۆز نین، بەڵام بنچینەیەکی خێڵەکییان هەیە.

[°°] کورسیی تەرخانکراو بۆ عێراقییەکان.

[°°°] شەش کورسی بەتاڵبوو.

چرووپری سەبارەت بە چۆنایەتیی بەڕێوەچوونی ئەم «هەڵبژاردنە ئازادانە» لە دێهاتی خێڵەکی‌دا بۆ بەجێ‌هێشتووین. لە ١٩٣٠/٩/١٠دا ئەمەی نووسیوە:

«دەشێ هەڵبژاردن دابەش‌بکرێ بۆ سێ قۆناغ. یەکەم- قایمقام هێندەی پێی بکرێ، هەوڵی قایمکردنی جێ‌پێی خۆی دەدا؛ پیاوی گونجاو ئامادەدەکا، تا لە لیژنەی پشکنین‌دا دەنگی لەسەر بدرێ. دووەم- دەبێ قایمقام ڕێ‌وشوێن دابنێ، ئەندامێکی زیرەکی لیژنە بنێردرێتە وێستگە لاوەکییەکان، تا مسۆگەری‌بکا سەرۆک‌هۆز بە هەڵبژاردنی هەموو نزیکەکانی و قاوەچی و خزمەتکارەکانی‌تری دیوەخانی، نەبێتە ناوەندێکی گەورەی هێز. چەندین کێشە هەن سەبارەت بەو سەرۆک‌هۆزانە کە ساختەکارییان لە هەڵبژاردن‌دا کردووە، بە جۆرێک کە دەستیان بەسەر هەموو دەنگە هەڵبژێرەکانی هۆزدا گرتووە. پاش ئەوەی قۆناغی دووەم وەکوو پێویست بە تەواوبوون دەگەیێنرێ، زەمینە خۆش‌دەکرێ بۆ سێیەم و دوایین قۆناغ، کە هەڵبژاردنی نوێنەرەکانە. وەک هەمووانیش دەزانن، ئەوە پێش وادەی هەڵبژاردن بە شێوەیەکی نهێنی لەسەر دەستی موتەسەڕیف لە نووسینگەکەی و لە نووسینگەی قایمقامیش بەجێ‌دەهێنرێ.»[١٩٥]

هیچ ئاماژەیەک لەئارادانییە کە شێوازەکانی هەڵبژاردن پاشتر ڕوویان لە چاکی کردبێ. ئەمە جگە لە باس‌نەکردنی چاکسازیی ڕەمزی، کە بە مەرسوومی ژمارە ٦ی ساڵی ١٩٥٢[١٩٦] کۆتاییی بە ڕواڵەتبازیی هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆ هێنا.* نووری سەعید لە یەکێک لە وتارە ڕاشکاوە دەگمەنەکانی‌دا، ساڵی ١٩٤٣ ڕوون و ئاشکرا لە وتارێکی ناو ئەنجومەنی نوێنەران‌دا، ڕووی دەمی کردە ئەو نوێنەرانە کە وەنەوزیان‌دەدا و گوتی: «عوزرخواییتان بۆ دێنمەوە، هەر کەسێک

---

[١٩٥] ڕاپۆرتێکی کارگێڕیی بڵاونەکراوەی ڕۆژی ١٩٣٠/٩/١٠، کە لیواس، پشکنێری دیوانییە و کەربەلا سەبارەت بە ماوەی کۆتاییی‌هاتوو بە ١٩٣٠/٨/٣١ نووسیویە، لاپەرە ٢.

[١٩٦] بڕوانە: الحسني، *تاريخ الوزارات العراقية*، الجزء الثامن، ص٣٢٨، ٣٣١-٣٣٣.

* سیستەمی هەڵبژاردنی پەرلەمانی لە سەردەمی پاشایەتی‌دا، لەو گرنگترین گلەیی و ڕەخنانەیە کە لەم ڕژێمە دەگیرێن. پشت بە هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆ دەبەسترا، واتە هەڵبژاردنی نوێنەرانی پلەدوو (لاوەکی)، کە نوێنەرە پاڵێوراوەکانیان هەڵدەبژارد. لیستی حکوومەت بەردەوام براوە بووە، بگرە زیاتر دامەزراندن بووە، نەک هەڵبژاردن. تەنانەت خەڵکانێکیان پاڵاوتووە، کە لە بنەڕەت‌دا نەیانزانیوە پاڵێوراون. وەک بەسەر جەواهیری‌دا هاتووە، کە ئەوەی بە شیعر دەربڕیوە و گوتوویە: وبأن أروح ضحى وزيرا مثلما**أصفحت عن أمر بليل نائبا. بڕوانە: محمد مهدي الجواهري، مذكراتي، ج٢، منشورات دار المجتبى للطباعة، العراق، ٢٠٠٥. (و.ع)

پلەوپایەکەی و خزمەتەکانی لە دەوڵەتدا هەرچییەک بن، ئەگەر حکوومەت پشتی نەگرێ، ئایا دەتوانێ ببێ بە ئەندامی پەرلەمان؟! ئامادەی بەربەرەکانیی هەر کەسێکی ئێرەم شانازی بە خۆی و جێوڕێ و نیشتیمانپەروەریی خۆیەوە بکا، بتوانێ دەست لە کار بکێشێتەوە و ئەم ئەنجومەنە بەجێبێڵێ. هەڵبژاردن دووپاتدەکەینەوە، تا بزانین ئەگەر ناوی لە لیستی حکومەتدا نەبوو، ئاخۆ جارێکیتر شەرەفمەندمان‌دەکا وەک ئەندام ئامادەی ئەم ئەنجومەنە ببێتەوە؟!»[197]

حکوومەت لە ماوەی نێوان ١٩٤٦-١٩٥٨دا هەوڵی دا نەک هەر لە پەرلەمان، بەڵکوو لە حکوومەتیش‌دا، بەشداری بە سەرۆکهۆزەکان بکا. یەکێک لە کۆسپە سەرەکییەکانی بەردەم ئەم هەوڵەیش، ئاستی نزمی خوێندەواریی چینی سەرۆکهۆزەکان بوو. ئێستە ئەستەمە بزانین ئەم چینە تا چ ڕادەیەک چووبووە ناو بنیاتی حکوومەت. گەلێک نموونە هەیە، دەکرێ لەم بارەیەوە بیهێنینەوە: سەید ئەرکان عیبادی، لە ١٩٥٣-١٩٥٤ و ١٩٥٧-١٩٥٨دا، وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بوو. کازم عیبادیی* مامیشی، عەمید و فەرماندەی هێزی ئاسمانیی عیراق بوو. هەردووکیشیان لە خزمانی شێخ تەکلیف فەرعۆنی** سەرۆکهۆزی فەتلە بوون، کە ئەویش ئەندامی پەرلەمان بوو. ڕایح عەتییەی سەرۆکهۆزی حومێداتیش، لە ١٩٥٢-١٩٥٣دا بە وەزیری کشتوکاڵ دانرا. شێخ سەلمان بەڕاکی سەرۆکهۆزی ئەلبوسوڵتانیش، لە ساڵانی چلدا چەند جارێک بوو بە وەزیری ئابووری. میری ڕەبیعەیش، لە گەرمەی ڕاپەڕینی میللیی ١٩٤٨دا، بوو بە وەزیری بێوەزارەت.

---

[197] محاضر جلسات مجلس النواب، الاجتماع العادي في ١٩٤٣، ص٢١.

لە لاپەڕە ٢٠ی بەشی حەوتەمی سەرچاوەی پێشوو وەرگیراوە.

* ئەرکان عیبادی، لە سەرۆکهۆزانی ئالفەتلەیە، ١٩٢٥ لەدایکبووە و ١٩٦٩ مردووە. لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ساڵی ١٩٤٧دا، بوو بە نوێنەری دیوانییە و چەند جارێکیش دانرا بە وەزیری بێوەزارەت و وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی. هەرچی کازم عیبادیی مامیشیەتی، لە سەردەمی پاشایەتیدا، بوو بە فەرماندەی هێزی ئاسمانی. (و.ع)

** تەکلیف فەرعۆن: سەرۆکهۆزێکی گەورەی خێڵاتی ئالفەتلەیە، ساڵی ١٩٠٤ لەدایکبووە و ١٩٥٨ مردووە. لە گەورە موڵکدارانی زەویی ناوچەی فوراتی ناوەڕاست بوو. (و.ع)

نیشانەیەکی هاوپەیمانیی نێوان مەلیک و سەرۆکهۆزەکانیش، هاوسەرگیریی عەبدولئیلا بوو لەگەڵ کچی ئەمیری ڕەبیعە.*

بە هەمان شێوە، حیزبە سیاسییەکان زۆر پشتیان بە سەرۆکهۆزەکان دەبەست، تا ببنە ئەندامیان. لەبەرئەوە زۆربەی سەرۆکهۆزە گەورەکان چوونە ناو حیزبی ئیتیحادی دەستووری، کە نووری سەعید لە ١٩٤٩دا دایمەزراند.** هەر یەکە لە عەبدوڵا یاسینی سەرۆکهۆزی مەییاح، کە تیرەیەکی بەنیڕەبیعەیە و محەمەد حەبیبی میری ڕەبیعە و مووحان خەیروڵای سەرۆکهۆزی حومەیێد و عەبدولموحسین جریانی سەرۆکهۆزی ئەلبوسوڵتان و خەوام عەبد عەباسی سەرۆکهۆزی بەنیئوزێرج و مەجید خەلیفەی سەرۆکهۆزی ئەلبومحەمەد و سەرۆکهۆزانیتری موڵکداری زەوی، ئەندامانی دەستەی باڵای بەڕێوەبردنی حیزبەکە بوون.[198] سەرووبەر ١٨ سەرۆکهۆز لەم دەستەیەدا بوون، لە کاتێکدا سەرجەمی ژمارەی ئەندامان ٤٨ بوو. لە شوێنێکیتردا بە درێژی لا لەم حیزبە و ئامانجەکانی دەکەینەوە. ئەمجارە هەر لەوە دەدوێین کە هۆیەکی سەرەکیی دامەزراندنی، وەک دەردەکەوێ، ئەنجامی ڕاپەڕینی میللیی بەناوبانگی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ بوو، کە کێشایەوە بۆ ڕووخانی کابینەی وەزارەتی عیراقی و هەڵوەشانەوەی پەیماننامەی پۆرتسمۆت، یا ئێرنست بێڤن - ساڵح جەبر. ئەم ڕاپەڕینە، گەورەترین بەڵگەی ئەو تینوتوانی ڕێکخستنە بوو کە هێزە بەرهەڵستە نەتەوەیی و چەپڕۆکانی دژ بە ڕژێمی حوکمدار بەدەستیانهێنابوو. وا دیارە قەناعەتی بە نووری سەعیدیش هێنابوو کە بە ناچاری بەرژەوەندە بنچینەییەکانی وڵات ڕێکبخاتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی نووری سەعید باوەڕی بە ژیانی حیزبایەتی

---

* عەبدولئیلای سەروەسێت، هویامی کچی محەمەد حەبیبی میری ڕەبیعەی لە ١٩٥٣دا هێنا؛ لەو ئافرەتانە بوو کە ساڵی ١٩٥٨ بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە توانیی خۆی لە کوشتاری کۆشکی ڕیحاب ڕزگاربکا. (و.ع)

** حیزبی ئیتیحادی دەستووری: یەکێکە لە حیزبە لیبراڵەکانی سەردەمی پاشایەتی، نووری سەعید لەگەڵ ئەحمەد موختار بابان و ئەرکان عیبادی و عەبدولوەهاب مەرجان و خەلیل کەننە دایمەزراند. پاش دەرچوونی مەرسوومی هەڵوەشانەوەی حیزب و کۆمەڵەکان کە حکوومەتی دوازدەیەمی نووری سەعید لە ١٩٥٤دا دەریکرد، هەڵوەشایەوە. بڕوانە: خالدة ابلال الجبوري، التحليل التأريخي للنية السياسية للأحزاب العراقية ١٩٤٦-١٩٥٨، محاكاة للدراسات والنشر، دمشق، ٢٠١٢، ص٧٠. (و.ع)

[198] ناوەکان لە لیستێکی ناونیشان "حیزبی ئیتیحادی دەستووری"ی بەڕێوەبەرێتیی ئاسایشی بەغدا وەرگیراون.

نەبوو و پێی باشتربوو بە شێوازێکی نارەسمی کاربکا، تەمەنی حیزبەکەی (حیزبی ئیتیحادی دەستووری) درێژنەبوو. لە هەمان کاتدا، ڕژێم هەر دەزگایەکی چینەکانیتری لە دێهاتدا سەرکوتکرد و هەڵوێستیشی لەم ڕووەوە لەو سەرنجەی بەڕێوەبەری پۆلیسی لیوای دیوانییەدا بەسەر داوانامەی یەکێک لە حیزبە هەرە ناوەندگر (معتدل)ەکانەوە، کە ئەویش حیزبی نیشتیمانیی دیموکراتی (الحزب الوطني الديمقراطي)*یە، بۆ کردنەوەی لقێکی خۆی لەو لیوایە، نیشاندراوە. لە نامەیەکی ڕۆژی ١٩٤٧/١/٢١دا بۆ موتەسەڕیف، نووسیویە: «لە بەر ڕووناکیی ئەو ڕاستییەدا کە ئەم لیوایە یەکێکە لە گرنگترین لیوا هۆزنشینەکان و زۆربەی دانیشتووانەکەیشی خەڵکی سادەن، ڕەنگە بڕیاردان لەم داوایە ببێتە هۆی تێکدانی ئاسایشی گشتی!»[١٩٩]

ساڵانی هەوەڵی حوکمی پاشایەتی، نموونە هەن سەبارەت بە هەوڵەکانی هێنانەمەیدانی سەرۆکهۆزان و ترنجاندنیانە ناو جوغزی چالاکیی سیاسیی نیمچە ڕێکخراوی خەڵکانی حوکمبەدەستی شارنشین. یەکێک لەو گرنگترین نموونانە، «حیزبی تەقەدوم»ە،** کە ساڵانی بیست دامەزرێندرا و ئامرازێکی تەواو پەرلەمانی بوو. لەوەیش گرنگتر، حیزبی برایەتیی نیشتیمانی (الأخاء الوطني) بوو، کە ١٩٣٠ لەسەر دەستی یاسین هاشمی و ڕەشید عالی و کەسانیتر دامەزرێندرا، وەک ئامرازێکیش بەکارهێنرا بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. سەرەتا ئامانجی ئەوەبوو

---

* حیزبی نیشتیمانیی دیموکراتی: حیزبێکی لیبراڵی سەردەمی پاشایەتییە، ساڵی ١٩٤٦ لە لایەن کامل جادرچی و محەمەد حەدید و حسین جەمیل و عەبدولکەریم ئوزەری و عەبدولوەهاب مەرجانەوە دامەزرا. دوچاری گەلێک دابەشبوونی ترسناک بوو، چونکە چەندین بۆچوونی فیکریی تێدابوو. پاش دەرچوونی مەرسوومی ساڵی ١٩٥٤، هەڵوەشێندرایەوە. بۆ درێژەی ئەم باسە، بڕوانە: فاضل حسين، تاريخ الحزب الوطني الديمقراطي، مطبعة الشعب، بغداد، ١٩٦٣، ص٣٠ و ئەوەبەدوا. (و.ع)

[١٩٩] نامەکە لە فایلێکی ئاسایشی بەغدادایە، بە ناونیشانی "حیزبی نیشتیمانیی دیموکراتی"، بەرگی یەکەم.

** حیزبی تەقەدوم: یەکەم حیزبی پەرلەمانییە لە عیراق، عەبدولموحسین سەعدوون ساڵی ١٩٢٥ داوای دامەزراندنیی کرد و دەستەی بەڕێوەبردنەکەی، ئەرشەد عومەری، موحسین ئەبوتەبیخ، ئیبراهیم یووسف و گاتع عەوادیی گرتبووە خۆی. ئامانجی دامەزراندنیشی، پاڵپشتیی وەزارەتی عەبدولموحسین سەعدوون و تێپەڕاندنی قانوونەکانی بوو لە ئەنجومەنی وەزیران. بڕوانە: عبدالجبار حسن الجبوري، الأحزاب والجمعيات السياسية في القطر العراقي ١٩٠٨-١٩٥٨، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ص٦٩. (و.ع)

پەیماننامەی ئەنگلۆ-عیراقیی ساڵی ١٩٣٠ هەڵوەشێنێتەوە.[٢٠٠] ئەمە هانی نووری سەعیدی دا، کە پاشتر بوو بە سەرۆکوەزیران، حیزبە تازەکەی خۆی (عەهدی عیراقی) پێکبهێنێ.

بەگشتی، نەزانراوە مەلیک فەیسەڵ خۆیشی تێکۆشیبێ سەرۆکهۆزەکان و ساداتی ناوچەی فورات ڕێکبخا بۆ بێهێزکردنی حیزبی ئەخاء (حزب الأخاء). بەپێی نامەیەکی ڕۆژی ١٩٣١/٢/١٢ی ڕائید ویلکینزی جێگری پشکنێری گشتیی پۆلیسی عیراق، بۆ ڕاوێژکاری ئینگلیز لە وەزارەتی ناوخۆ، ژمارەیەک سەرۆکهۆز و سەید چوونەتەپاڵ حیزبی عەهدی عیراقی، کە مەلیک ڕێکیخستووە* و چەندین جاریش چاویان بە مەلیک و نووری سەعید کەوتووە. ڕێنوێنی و گفت و بەڵێنی ناردنی بڕەپارەیەکی گەورەیش هەبوون، تا حیزبەکە لەسەر بناغەیەکی دروستی دارایی بنیاتبنرێ. مەلیک پێیگوتوون: یەکجار بێزارە لە چالاکییەکانی یاسین هاشمی و جارێکیتر متمانە و چاکەی مەلیکی پێنابڕێن. ئامۆژگاریشیکردوون تا ئەوپەڕی نهێنی بپارێزن و پێیڕاگەیاندوون نووری سەعید سەرۆکی ڕاستەقینەیانە، جا ئیتر لە دەسەڵاتدا بێ وەک سەرۆکوەزیران، یان نا و ڕێنوێنیشی سەبارەت بە حیزبەکە بۆ موتەسەڕیف و قایمقامەکان دەرکردووە.»[٢٠١]

ئێستە دەچینە سەر بەشێکیتری سیاسەتی حکوومەتی پاشایەتی بەرامبەر بە سەرۆکهۆزەکان، ئەویش باج و دەرامەتەکانی زەویوزارە. بۆ تێگەیشتن لەم مەسەلەیەیش، با جارێکیتر بڕوانینە خشتەی ژمارە ١- پاشکۆی ١ و داهاتەکانی

---

[٢٠٠] لە نامەیەکی تایبەتی ڕائید ویلکینزدا بۆ ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ، ئەمە نووسراوە: «شێخ مووحان خەیروڵا و شێخ عەبدوڵا یاسین و چەند کەسێکیتر، ڕۆژی ١٩٣٠/٩/٣٠ لە ماڵی هاشمی کۆبوونەوە. هاشمی داوای لێکردن بە توندی بەرهەڵستیی حکوومەت و تێپەڕاندنی پەیماننامەکە بکەن.»

* حیزبی عەهدی عیراقی، لەسەر دەستی نووری سەعید دامەزرێندرا، نەک مەلیک. بە عەهدی عیراقی ناویینا، بۆ هێنانەوەیادی جەمعییەتی عەهد، کە لە سەردەمی عوسمانیدا پێکهێنرا و خۆیشی ئەندامێکی بوو. حیزبەکە لە ١٩٣٠/١١/١٤دا دامەزرا. نووری سەعید، جەمیل مەدفەعی، جەعفەر عەسکەری، جەمیل بابان، عەبدولحسێن چەلەبی، ئیبراهیم واعیز و فائیق شاکیر، لە دیارترین سەرکردەکانی بوون و زۆربەیان لە حیزبی تەقەدومەوە، کە عەبدولموحسین سەعدوون پێکیهێنابوو، هاتبوون. بڕوانە: عبدالجبار حسن الجبوري، جريدة المدى، ٢٦٢٢٠١٢. (و.ع)

[٢٠١] نامەکە لە فایلێکدایە بە ناونیشانی "نامە تایبەتەکانی ڕائید ویلکینز"، لە کتێبخانەی ئاسایشی بەغدا. لەو سەرۆکهۆزە جێی مەبەستانەیش، جبیل عەتییە، جەعفەر ئەبوتەبیخ و کەسانێکیتر.

ماوەی نێوان ۱۹۳۱-۱۹۵۵ و ۱۹۲۱-۱۹۳۰ی زەویوزاریش بەراوردبکەین. ڕاستییەکەی، هەر بەراوردکردنێک مایەی سەرلێشێواندنە، چونکە قانوونەکانی باجی سەر زەوی لەو دوو ماوەیەدا جیاوازن. بەڵام با سەرەتا بەراوردەکە بکەین و پاشان ڕوونیبکەینەوە بۆچی چەواشەکەرە.

بەگشتی، دەسکەوتەکانی زەوی ئاماژە بۆ زیادبوونی کاریگەریی هەردوو چینی موڵکدارانی زەوی و سەرۆکهۆزەکان دەکا. جا لە کاتێکدا دەرامەتەکانی ماوەی نێوان ۱۹۲۱-۱۹۳۰ی زەوی ۱۱۷۰۰۰ ڕووپێ بووە، واتە ٢٧,٦٪ی سەرجەمی دەرامەت؛ لە ماوەی نێوان ۱۹۳۱-۱۹٤۰دا، ۷-۱۰,٥٪ بووە. لە دووەم جەنگی جیهانیشدا (واتە سەروبەندی دووەم داگیرکاریی ئینگلیز)، زیادبوو و گەیشتە ڕێژەی ۱۷,۷٪. لە ماوەی تەقینەوەی نەوتیشدا، نێوان ۱۹۵۱-۱۹۵۵، کەمبووەوە و گەیشتە ۱,۷٪. هەر لەم ماوەیەی دواییدا، دەشێ دەرامەتەکانی پیشەسازیی نەوت بە هۆی سەرەکیی کەمبوونەوەی ڕێژەی دەرامەتی زەویوزار دابنێین. بەڵام دەبێ سەرنجبدەین دەرامەتی زەوی پاش ۱۹۵۰ بە شێوەیەکی گشتی کەمبووەتەوە. بە هەمان شێوە، پوختەی دەرامەتی زەوی لە ماوەی نێوان ۱۹۳۱-۱۹٤۰دا، لە هی ماوەی نێوان ۱۹۲۱-۱۹۲۹ کەمتربووە، بەڵام ئەمە بەشێکی دەبرێتەوە بۆ دابەزینی نرخی کەرەستە کشتوکاڵییەکان لەو ماوەیەدا.

گوتمان: بەراوردکردن مایەی سەرلێشێواندنە، لەبەرئەوەی باجی سەر بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، بەهۆی هەردوو قانوونی ۸۳ی ساڵی ۱۹۳۱ و ٥۹ی ساڵی ۱۹۳۳وە، بوو بە باجێکی ناڕاستەوخۆی بەکاربردن (استهلاک).* لە کاتێکدا تەنیا ئەو بەرهەمە کشتوکاڵییانە کە دەبرێنە ناو بازاڕ، باجیان بە بڕی تێکڕای ۱۰٪ی بەهاکەی لێوەردەگیرێ. ئەوە بەپێی قانوونی ژمارە ٦٤ی ساڵی ۱۹٤۳ و قانوونی ژمارە ٥۱ی ساڵی ۱۹٤۸ زیادکرا، تا ببێتە ۱۱-۱۲,٥٪. ئەم باجانە لە چەند بازاڕێکی دەستنیشانکراو وەردەگیرێن بۆ ئەم مەبەستە و بەپێی ئەو نرخانەیش کە دەسەڵاتدارانی باجسەندن دیارییاندەکەن، حیسابدەکرێن (عەمبارکراویش، قانوونی ٦۳ی ساڵی ۱۹۳۸ و دەستکارییەکانیی بەسەردا دەسەپێندرێن).

---

* باجی بەکاربردن: باجێکە دەخرێتە سەر خەرجکردن بۆ کڕینی کاڵا یا خزمەتگوزاری، بە شێوەیەکی ئاسایی ناڕاستەوخۆ دەبێ، وەک باجی فرۆشراو و باجی زێدەبایی. وێڕای ئەوە، دەشێ ڕاستەوخۆیش بێ، وەک باجی شەخسی. (و.ع)

ئەم باجە تازەیەی بەکاربردن چی دەگەیێنێ؟ کارڵ ئیڤەرسۆن لە زانکۆی کۆپنهاگن دەڵێ: «ئەستەمە باج لە کشتوکاڵ وەربگیرێ.» چونکە «هەندێک پێیان وایە تەنانەت باجە سەپێندراوەکانی سەر بەرهەمە ئاژاڵی و کشتوکاڵییەکانیش کە بە شێوەیەکی سەرەکی شتێکی بەکاربردن ناو پێکدەهێنن، بە کارکردنە سەر نرخ دەگواسترێنەوە بۆ بەکاربەر. چەند تێڕوانینێکی جیاواز سەبارەت بەم بابەتە هەیە، بەڵام زەحمەتە گواستنەوەی تەواوی ئەم بارە گرانە بۆ بەکاربەر ببینین، لە بارودۆخێکدا ئەگەر بەکاربردن بارانە (باجی بار)ی ناردنەدەرەوەی لەگەڵ بێ، وەک لە عیراق وەهایە.»[٢٠٢] نابێ پێمان وابێ ئەمە زۆری جووتیارانی ئارخەیانکردووە، چونکە پاشتر دەبینین چۆن سەرۆکهۆزەکان و موڵکدارانی زەوی بەردەوام هەر هەمان موڵکانە و پشکی کۆنی بەرهەمی کشتوکاڵییان لە جووتیار کۆکردووەتەوە.

پێش ئەوەی باسی دەرامەتەکانی زەوی بەجێبێڵین، با بچینە سەر بارانە و گومرگی ناڕاستەوخۆ، کە -وەک لە خشتەی ژمارە ١، پاشکۆی ١دا دەردەکەوێ- قورساییی سەرەکیی باجی چووەتە سەر. لێکۆڵینەوەی بارانە سەپێندراوەکان کە دووئەوەندەی باجەکانن، بۆمان ڕووندەکاتەوە کە بارانە هەر کەوتووەتە سەر چەند کاڵایەکی کەم. لە ١٩٥٠دا، بارانەی سەر شەکر گەیشتە نزیکەی ٢٥٪ی سەرجەمی دەرامەتەکانی بارانە. بارانەی سەر چنراوەکانیش هەمان بایەخیان هەبوو، لە کاتێکدا بارانەی سەر چا گەیشتە نزیکەی ١٠٪.[٢٠٣] ئەگەر چاوێک بخشێنین بە ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەیەکی دکتۆر گریچیلی لە کۆلیجی نۆشداریی بەغدا (لە خشتەی ژمارە ٣دا نیشاندراوە) سەبارەت بە نەریتە خۆراکییەکانی دانیشتووانی بەغدا، دەتوانین تێبگەین ئەم هەموو بارانەیە چ چینێکیان تەنگەتاوکردووە.[٢٠٤]

---

202 Karl Iverson, A Report on Monetary Policy in Iraq, (Copenhagen: Ejnar Munkagaard for the Natioal Bank of Iraq, 1954) p. 61.

203 Ibid, pp. 62-63.

204 A. Gritchley, "Observations on a Socio-Medical Survey in Iraq", Journal of the Iraqi Medical Professions, IV No. 2, June 1956, pp. 70-78.

خشتەکە لە لاپەڕە ٧٨دایە.

**خشتەی ژمارە ٣**

**گومرگانە چ چینێکی زۆر زیاتر تەنگەتاوکردووە**
**خەرجیی حەفتانەی دانیشتووانی بەغدا لە چا و شەکر و**
**ڕێژەیان لە سەرجەمی خەرجیی خۆراکدا**

| زنجیرە | چین | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| ١ | خەڵکی هەرە هەژاری دانیشتووی زنجەکان (کوختەکان) | ٪٢٦ |
| ٢ | کرێکارانی موسوڵمانی هەژاری هێڵی ئاسن | ٪١٦ |
| ٣ | فەرمانبەرانی مەسیحیی خاوەن مووچەی باشی هێڵی ئاسن | ٪١٠ |
| ٤ | عیراقییەکانی خاوەن‌داهاتی لە ١٠٠٠ەوە بۆ پتر لە ١٠,٠٠٠ دینار | ڕوون‌نەبووەوە (گرنگ‌نییە) |

ڕێوشوێنە هەرە یەکالاکەرەوەکانی حکوومەتی پاشایەتی بۆ قایمکردنی جێ‌پێی سەرۆکهۆز، سیاسەتی یەکلاکردنەوەی زەوی‌وزار بوو، کە بە شێوەیەکی بنچینەیی لە قانوونی ژمارە ٥٠ی ساڵی ١٩٣٢ و قانوونی ژمارە ٥١ی ساڵی ١٩٣٢دا بەرجەستەبوو.* ئەم قانوونانە، لە ڕووی کاریگەریی بەرچاویانەوە و هێندەی بەستن بە چینی سەرۆکهۆزەکانەوە، ددان‌پێدانانێکی قانوونیی ئەو پرۆسەیە بوون کە ساڵانێک بوو لە دێهاتی خێڵەکی‌دا کاری پێ‌دەکرا؛ کە سەرۆکهۆزەکان زەوی‌وزاری هاوبەشی هۆزیان زەوت‌دەکرد و موڵکایەتیی زەوییان لە چنگی دراوسێ بێ‌هێزەکانیان دەردەهێنا و پەلیشیان دەکێشا بەرەو زەوییە دەست‌لێ‌نەدراوەکانی

* بە دەرچوونی ئەم قانوونانە کە ڕێیان دا سەرۆکخێڵەکان زەوییە کشت‌وکاڵییەکان بە ناوی خۆیانەوە تۆماربکەن، سیستەمی کۆمەلایەتیی دێهات لە عیراق، لە خێڵایەتیی باوکسالارییەوە گۆڕا بە نیمچەدەرەبەگی یا دەرەبەگیی ڕاستەوخۆ. بەوپێیە حکوومەتی پاشایەتی بەرپرسی ڕاستەوخۆی دامەزراندنی شێوازی دەرەبەگی یا نیمچەدەرەبەگی و ڕەنگ‌ڕشتنی ئەم قۆناغەی مەرگەساتێکە، کە هەڵکەوتی کۆمەلایەتیی بە درێژیی ساڵانی داهاتوو گرتەوە و لە ڕووی ئابووری و کۆمەلایەتییەوە زۆر خراپ بەسەر جووتیاران و دانیشتووانی دێهات‌دا شکایەوە. بڕوانە: رسول فرهود هاني الحسناوي، الإقطاع وحياة أهل الأرياف في الفرات الأوسط، مؤسسة النبراس للطباعة والنشر، النجف، ٢٠١٣. (و.ع)

دەوڵەت. موڵکایەتیی ئەم هەموو زەوییە دەرەبەگییانە، وەک موڵکایەتییەکی تایبەت و پوخت و قەتیسکراو و خۆڕایی، بەخشرا بە سەرۆکهۆزەکان.

پێش ئەوەی ئەم سیاسەتە لە ١٩٣٢دا جێبەجێبکرێ،[٢٠٥] زۆربەی زەوییەکانی عیراق لە ڕووی قانوونییەوە هیی دەوڵەت، واتە زەویی میری بوون. ژمارەیەکی زۆری موڵکدارانی زەوی، هەرچەندە بە کردەوە ئەم زەوییانەیان لەژێر دەستدا بوو، بەڵام هیچ قەواڵەیەکی قانوونییان بەدەستەوە نەبوو بیسەلمێنێ ئەو زەوییانەیان یا چنگکەوتووە، یان دەوڵەت بەکرێ پێیداون. موڵکایەتییە -بە ڕێژە- بچووکەکان نەبێ، وەک زەویی کراو بە ڕێگەوبان و موڵک و وەقف، زەوییەکانیتر هەموویان زەویی تاپۆ بوون. زەویی کراو بە ڕێگەوبان، ئەو زەوییانەن کە تەرخانکراون بۆ خزمەتی گشتی. زەویی موڵکیش، ئاماژەیە بۆ زەوییەک وەک موڵکایەتیی تایبەت خاوەنی هەبێ و سنوورەکانی تەنیا بە زەوییەکانی دەوروبەری شار دیاریبکرێن. وەقفیش کە مێژوویەکی درێژی ئیسلامیی هەیە، ئاماژەیە بۆ زەویی تەرخانکراو بۆ مەبەستی ئایینی یا خێرخوازی. هەرچی زەوییەکانی تاپۆیشن، وەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، بەرهەمی قانوونی ساڵی ١٨٥٨ی زەویوزاری تورکییە، کە ساڵی ١٩٣٢ لەبەر هەبوونی قەواڵەی نانیزامی یا گومانلێکراوی تورکی، بە پووچەڵکراوە دانران (پێشیاندەگوترێ قەواڵەکانی تاپۆ).

قانوونە تازەکانی ژمارە ٥٠ و ٥١ی ساڵی ١٩٣٢ و ٢٩ی ساڵی ١٩٣٨، چەشنێکی تازەی ئەو شێوە موڵکایەتییە قانوونییەیان هێنایە گۆڕێ کە بە لەزمە ناودەبرێ و چەندین شێوەیتری موڵکایەتیش بە قانوون ڕێکخرا. ئەو شێوە موڵکایەتییانەیش کە پێویستدەکا لەبەر بایەخیان زیاتر ڕوونبکرێنەوە، بریتین لە

---

[٢٠٥] وتووێژە قانوونییەکانی پاش ئەم قۆناغە، بە زۆری لەسەر ئەمانە گیرساونەوە: ١. خوێندنەوەی قانوونە پێوەندیدارەکانی ناو کۆمەڵە قانوونەکانی کامیل سامەرائی کە بەم ناوەوەن: "قوانین التسویة واللزمة والعقر... الخ والتعلیمات والبیانات والأنظمة ذات العلاقة"، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٤٨؛ ٢. منظمة الزراعة والأغذیة التابعة للأمم المتحدة، حول مشاكل الأراضي في منطقة الشرق الأدنی، صلاح الدین، العراق، تشرین الأول ١٩٥٥؛ ڕاپۆرتی مێزگردی R-3 کە ساڵح حەیدەر نووسیویە و ئەمە ناونیشانیەتی "القیود العامة علی الأراضي المستغلة من الأهالي"؛ ڕاپۆرتی «معلومات البلاد: العراق، رقم Cl 9».

میری و تاپۆ و لەزمە.* موڵکایەتیی کۆتایی لەم سێ شێوەیەدا، هەر بە هیی دەوڵەت دادەنرێ. لەبەرئەوە هەموویان، لە ڕووی قانوونییەوە، بە زەویی میری دەژمێردرێن. یەکەمیان بۆ جوێکردنەوە لە دووەکەی‌تر، بە زەویی میریی پوخت ناودەبرێ. دەوڵەت بەشێکی گەورەی زەویی میریی پوخت لە دەستی خۆی‌دا هێشتووەتەوە، لە کاتێک‌دا بەشەکەی‌تری بە عەقدێکی ڕاستەوخۆی بەکرێدان، یا بە مەزاتێکی ڕواڵەتی کە ماوەکەی لە سێ ساڵ تێ‌ناپەڕێ، داوە بە کەسەکان، کە زۆربەیان سەرۆکهۆزن. ئەوەی ڕاستی بێ، زەوییەکانی بەکرێ‌دراون بە سەرۆکهۆزەکان، هەر لە چنگی سەرۆکهۆزدا دەبن و بە میرات لە باوکانەوە بۆ کوڕان دەمێننەوە. شێوەی تاپۆ و لەزمە، بە ڕواڵەت گواستنەوەیەکی مەرجداری موڵکایەتییە لە دەوڵەتەوە بۆ کەسەکان. خشتەی ژمارە ٤، جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان ئەو دوو شێوە موڵکایەتییە ڕوون‌دەکاتەوە:

**خشتەی ژمارە ٤**

جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان موڵکایەتیی تاپۆ و موڵکایەتیی لەزمە

| زنجیرە | موڵکایەتیی تاپۆ | موڵکایەتیی لەزمە |
|---|---|---|
| ١ | دەوڵەت مافی کۆتایی موڵکایەتیی زەویی لە دەست‌دایە. | دەوڵەت مافی کۆتایی موڵکایەتیی زەویی لە دەست‌دایە. |
| ٢ | تاکەکەس مافی سوودوەرگرتن لە زەوی بەدەست‌دێنێ، ئەگەر سەلماندی ماوەی دە ساڵ بە شێوەی وەسفکراو لە قانوون‌دا ڕەنێوی‌دێنێ. | تاکەکەس مافی سوودوەرگرتن لە زەویی دەبێ، ئەگەر لە ماوەی پازدە ساڵی پێش قانوونەکەدا بە شێوەیەکی بەرهەمهێن ڕەنێوی‌هێنابێ. لە دەستکاریی ١٩٥٢دا، ماوەی سێ ساڵ کراوە بە |

* میری و تاپۆ و لەزمە: چەند زاراوەیەکی تایبەت بە موڵکایەتیی کشتوکاڵین لە عیراق، پاش بڕیاردان لە قانوونی تورکیی ١٨٥٨ و چاکسازییەکانی ١٨٦٩-١٨٧٢ی مەدحەت‌پاشا، کەڵاڵەبوون. ئەگەرچی ئەوانە زەوی‌وزاری میرین، هەموویان هیی دەوڵەتن، بەڵام جیاوازییان تێدا دیارە. میریی پوخت، ئەو زەوییانەن کە موڵکایەتییان لە دەستی دەوڵەتدایە. دوو شێوەکەی‌تر بە عەقدێکی ڕاستەوخۆی بەکرێدان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو خراوەتە سەر کەسان و بەتایبەت سەرۆکهۆزەکان و دەستڕۆکان، بەڵام – لە ڕاستی‌دا– بە درێژایی ژیان لە دەستیان‌دا دەمێننەوە. (و.ع)

| | | |
|---|---|---|
| | | بناغەی بەدەستهێنانی مافی سوودلێوەرگرتن. |
| ٣ | زەوی شیاوی بە میرات مانەوەیە و دەکرێ بفرۆشرێ. | زەوی شیاوی بە میرات مانەوەیە، بەڵام مەرجە حکوومەت پێش فرۆشتن ڕازیبێ. |
| ٤ | زەوی دەدرێتەوە بە دەوڵەت، ئەگەر ماوەی سێ ساڵ ڕەنێوینەهێنێ. | زەوی دەدرێتەوە بە دەوڵەت، ئەگەر ماوەی چوار ساڵ ڕەنێوینەهێنێ. |

وەک لە خشتەکەدا دەبینین، دەشێ هەردووکیان بە میرات بمێننەوە و بگواسترێنەوە بۆ کەسانیتر، لە کاتێکدا لە تاپۆدا هیچ مەرجێکی گواستنەوە نییە. هەرچی لەزمەیشە، ڕەزامەندیی حکوومەتی بۆ تەواوکردن پێدەوێ. لەبەرئەوە -لە ڕاستیدا- هەردووکیان و بەتایبەت تاپۆ، لە موڵکایەتیی تایبەت جیاوازنین، بەتایبەت کە حکوومەت مافی لەبەرچاوگیراوی خۆی بەکارناهێنێ بۆ گێڕانەوەی ئەم موڵکایەتیانە. شایانی سەرنجدانە، کە شەقڵێکی لەزمە پێش دەستکاریی ١٩٥٢ (کە بە قانوونی ژمارە ٣٦ی ساڵی ١٩٥٢ هات)، ئەوەبوو کە ڕەنێوهێنانی زەوی لە ماوەی پازدە ساڵی پێش ڕاگەیاندنی یەکلاکردنەوەی زەویی ئەو مەڵبەندەدا، بەس بوو تا ببێتە بناغەی بەخشینی لەزمە. ئەمە بە ڕاستی وا دەگەیێنێ، ئەگەر موڵکداری زەوی تەنانەت ساڵێک پێش ڕاگەیاندنی یەکلاکردنەوەکە، پەلی بە کشتوکاڵەکەی کێشا بەرەو زەوییە بەیارەکانی دەوروبەری، یا ئاوەڵکێشێکی لەم زەوییانەدا دانا و بووژاندنیەوە، ئەمە بەسە بۆ ئەوەی کە مافی لەزمەی پێببەخشرێ. دەستکاریی ١٩٥٢* بڕیاری دا سێ ساڵ ڕەنێوهێنانی بەرهەمداری زەوی، بە بناغەیەکی تەواوی بەخشینی مافی لەزمە دابنرێ.

شەقڵێکیتری گرنگی یەکلاکردنەوە تازەکە، بەدەر لەوە کە تاپۆ لەسەر بنچینەی قەواڵەکانی موڵکایەتی بە نیازپاکی دەدرا، ئەوەبوو کە موڵکایەتیی زەوییەکانی دەوڵەت بە خۆڕایی بگواسترێنەوە و موڵکدار بەپێی قانوونی ٧٣ی

---

* ئەم قانوونە کە بە قازانجی سەرۆکخێڵانی موڵکدار بوو، پاش هەڵکشانی ڕاپەڕین و جووڵانەوە سیاسی و ئایدیۆلۆجییەکانی ناو شارەکانی عیراق بڕیاری لێدرا. هۆیەکەیشی ئەوەبوو کە حکوومەت دەیویست سەرۆکخێڵەکان بە لای خۆیدا ڕابکێشێ، یا -لایەنی کەم- لە بەرهەڵستیی ڕژێمی سیاسیی تازەی وڵات لایانبدا و بێلایەنیانبکا. (و.ع)

ساڵی ١٩٣٦، هەر ئاوانە [باجی مافی ئاو] بدا،[٢٠٦] کە بەپێی قانوونی ژمارە ٢٠ی ساڵی ١٩٣٩یش خۆی لێ دەربازکرد، چونکە ڕێی دا سوودمەندە تازەکان بڕەپارەیەکی دیاریکراو بدەن و لێی ڕزگاربین. دەستکاریی ساڵی ١٩٤١ی ئەم قانوونە، بڕەکەی کەمکردەوە بۆ ٢٠٪، ئەگەر پێش تێپەڕینی ١٠ ساڵ دابێتی. هەڵاوسانی نرخی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە دەورانی دووەم جەنگی جیهانیدا و زیادبوونی بە تێکڕایەکی خێراتر لە نرخی بەرهەمەکانیتر، خۆدەربازکردنی لەم باجانە ئاسانکرد؛ بە جۆرێک کە پاش جەنگ وای لێهات، هەر لە گواستنەوەی تازەی موڵکایەتیی زەوی وەردەگیرا.[٢٠٧]

لە ڕێگەی خشتەی ژمارە (٥)ەوە، دەتوانین لە ئەنجامەکانی سیاسەتی بەکلاکردنەوە لە دوادواکانی ساڵی ١٩٥٤ و کۆتاییی ساڵی ١٩٥٧دا تێبگەین. پتر لە ١٠ ملیۆن مشارە زەویی کشتوکاڵی (پتر لە ٦ ملیۆن ئەکر[٢٠٨])ی موڵکی دەوڵەت، کە دەکاتە نزیکەی ٢١٪ی سەرجەمی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە عیراق، ئاخروئۆخری ساڵی ١٩٥٤ بەپێی شێوازی لەزمە بەخشرا بە چەند کەسێکی دەستنیشانکراو. بە هەمان شێوە، ١١ ملیۆن مشارە (نزیکەی ٧ ملیۆن ئەکر) (٢٢٪ی کۆی زەوییە کشتوکاڵییەکان) بە شێوازی تاپۆ بەخشرا.* ئەمە تەنیا دانپێدانانی قەواڵە تورکییە کۆنەکانی نەگرتەوە، بەڵکوو بەخشینی مافی تازەیش بەو کەسانە کە ئەم قەواڵانەیان نەبووە و هەر ئەوەندە شێوەی ڕەنێوهێنانیان

---

[٢٠٦] ئاوانە سەبارەت بە تاپۆ بریتیبوو لە: ١. ئەو زەوییانە کە بە ئاوی سەرزەوی ئاودەدران، ئاوانەیان دەگەیشتە ٥-١٠٪ی بەهای بەروبووم، پشتبەستوو بە شێوەی ئاودێری: هەمیشەییە، یا نانیزامی؛ ٢. ئەو زەوییانە کە بە ئاوهەڵکێش ئاودەدران، ئاوانەیان دەگەیشتە ١-٢٪ی بەهای بەروبوومی کشتوکاڵی. هەرچی لەزمەیشە، هەموو ئاوانەیەکی دەگەیشتە بەرودوا ١٠-١٥٪ و ١-٢٪. ئاشکرایە خاوەنانی ئاوهەڵکێشەکان ئەو تاقمە بوون کە ئەم ڕژێمە چاودێرییەکی زیاتری کردوون.

[٢٠٧] منظمة الأغذية والزراعة التابعة للأمم المتحدة، مركز مشاكل الأراضي في الشرق الأدنى، العراق، تشرين الثاني ١٩٥٥؛ Country Information Report: Iraq, No. CI 9, pp. 16-18.

[٢٠٨] ئەکر دەکاتە ٤٠٤٦٫٨٦م٢ و مشارە یەکسانە بە یەک دۆنم، واتە ٢٥٠٠م٢.

* دەوڵەتی عوسمانی تاپۆی بەخشی بەو موڵکدارانە کە زەویی کشتوکاڵییان پاش ساڵی ١٨٦٩ بە زیادکردنی ئاشکرا دەکری، یا بەکرێدەگرت. دەوڵەتی عیراق، لە کاتێکدا پاش ساڵی ١٩٢١ سیستەمی لەزمەی گەڵاڵەکرد و تاپۆی نەدا یا نەبەخشی بە موڵکدارەکان، لەوانەیە ویستبێتی گیروگرفتی لە شێوەی گیروگرفتەکانی دەوڵەتی عوسمانی نەخوڵقێنێ. (و.ع)

بەپێی قانوونی زەویوزار بسەلمێنن. سوودمەندی ڕاستەقینە لەم یەکلاکردنەوەیەدا، هەر جووتیاران و سەرکارانی عیراق نەبوون، بەڵکوو سەرۆکهۆزەکان و موکدارانی زەوی و فەرمانبەرە گەورەکانی حکوومەتیش بوون. ئەگەرچی سەرۆکهۆزان و گەورە موڵکدارانی زەوی ترومپایان هەیە، بەڵام سەرمایەدارانی شاریش کە لە دێهات بە گوبانییە (الكبانية) ناسراون و ئامرازی دەستیان بۆ چوونە مەیدانی کشتوکاڵ ترومپاکانیانن، کەڵکیان بینی. پێویستە بیرمان نەچێ، لە ساڵی ١٩٣٢ەوە دەستکرا بە موڵکاندنی زەویی دەوڵەت بە ناوی ئەم و ئەوەوە. بە چاوپۆشین لە مافی تاپۆ کە حکوومەتی تورکی پاش ساڵی ١٨٥٨ بەخشیی، دیاردەی موڵکایەتیی تایبەت و نیمچەتایبەتی زەوی، پەرەسەیەکی تا ڕادەیەکی زۆر نوێیە.

**خشتەی ژمارە ٥**[٢٠٩]

**یەکلاکردنەوەی موڵکایەتیی زەوی لە دوادواکانی ١٩٥٤ و ١٩٥٧دا**

**(لە هەزاران مشارەدا) (مشارە یەکسانە بە ٠,٦٢ ئەکر، یا ٢٥٠٠م٢)**

| جۆری موڵکایەتی | زەویی یەکلاکراوە لە دوادوای ١٩٥٤دا | | | | زەویی یەکلاکراوە لە دوادوای ١٩٥٧دا | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | زەویی لەبار بۆ کشتوکاڵ | ڕێژەی سەدی | زەویی نالەبار بۆ کشتوکاڵ | سەرجەم | سەرجەم | ڕێژەی سەدی |
| موڵک | ٢٠٠ | ٠,٤ | ٣٣ | ٢٣٣ | ٢٤١ | ٠,٢ |
| ڕێگەپێدارۆییو | ١٠٥ | ٠,٢ | ٣٦٢٠ | ٣٧٢٥ | ٥٧١٧ | ٦,٩ |
| وەقف | ٦٨٦ | ١,٣ | ٥٣ | ٧٣٩ | ٨٥١ | ١,٣ |
| تاپۆ | ١٠٩١٤ | ٢٢,١ | ٨٤٣ | ١١٧٥٧ | ١٢٧٣٠ | ١٥,٤ |
| لەزمە | ١٠٣٢٦ | ٢١ | ٦٦١ | ١٠٩٨٧ | ١٢٠٩١ | ١٤,٦ |
| میریی پوخت | ٢٦٩٤٠ | ٥٥ | ١٣٢٣٠ | ٤٠١٧٠ | ٥٠٨٣٩ | ٦١,٦ |
| سەرجەم | ٤٩١٧١ | ١٠٠ | ١٨٤٤٠ | ٦٧٦١١ | ٨٢٤٦٩ | ١٠٠ |

---

[٢٠٩] سەرچاوە: سەبارەت بە ژمارەکانی ساڵی ١٩٥٤، بڕوانە: المديرية العامة لتسوية الأراضي، دراسات عن أعمال تسويات حقوق الأراضي في العراق، (بغداد، مطبعة العاني، ١٩٥٥)، ص٣٤. سەبارەت بە ژمارەکانی ساڵی ١٩٥٧یش، بڕوانە: جمهورية العراق، وزارة الإقتصاد، المجلس الأعلى للإحصاء، إحصاء الأراضي الزراعية لعام ١٩٥٧، (بغداد، مطبعة الزهراء، ١٩٥٨)، الجدول ٨٥، ص٦٨.

کێشەیەکی‌تر کە خشتەی ژمارە ٥ دەیخاتەڕوو، زەوی‌وزاری پان و بەرینی لەبارن بۆ کشت‌وکاڵ کە هەر وەک موڵکی دەوڵەت ماونەوە، ڕووبەریان دەگاتە ٢٧ ملیۆن مشارە لە ١٩٥٤دا، واتە ٥٥٪ی کۆی زەویی لەبار بۆ کشت‌وکاڵ لە عیراق. بەڵام بەپێی ئاماری کشت‌وکاڵیی ساڵی ١٩٥٢-١٩٥٣، تەنیا ٧,٧ ملیۆن مشارەی لێ بەکرێ‌دراوە بە کەسەکان، کە زۆربەیان سەرۆک‌هۆز بوون،[٢١٠] لە کاتێکدا پاشماوەی ئەم زەوییانە بە دانەچێندراوی ماونەوە.*

پاش ئەوەی بۆچوونێکمان، لە لایەنی قانوونییەوە، لەبارەی سیستەمی زەوی‌وزاری عیراقەوە لا گەڵاڵەبوو، با لە نزیکەوە چاوێک بگێڕین، تا بزانین سەرۆک‌هۆزەکان چۆن زەوییان دەستکەوتووە و ئەم کارەیش لە دێهاتدا ڕاست و دروست چۆن بەڕێوەچووە.

**چنگ‌گیرکردنی سەرۆک‌هۆز لە زەوی:**

لەم باسەدا دەکەومە وت‌ووێژکردن سەبارەت بە دابەشکردنی موڵکایەتییەکانی زەوی‌وزار تەنیا لە هەردوو لیوای عەمارە و کووت. وت‌ووێژەکەم لەم دوو لیوایەدا قەتیس‌کردووە، چونکە:

١. چەند لێکۆڵینەوەیەکی گشتی سەبارەت بەم کێشەیە ئەنجامدراون؛[٢١١]

٢. بابەتێکی بڵاونەکراوەم سەبارەت بەم دوو لیوایە و بەتایبەت عەمارە، دۆزییەوە، ڕووناکیی زیاتر دەخاتە سەر سیستەمی زەوی‌وزار؛

---

[٢١٠] الحكومة العراقية، وزارة الإقتصاد، المجلس الأعلى للإحصاء، تقرير حول الإحصاء الزراعي والحيواني في العراق ١٩٥٢-١٩٥٣، (بغداد، دار الأخبار، ١٩٥٤)، الجدول ٣، ص١٧.

* ئەم زەوییانە لە ڕووی قانوونییەوە بە موڵکی دەوڵەت لەقەڵەمدەدرێن، بەڵام لە ڕاستی‌دا زەوی‌وزار لە عیراق موڵکی خێڵەکانە و بە مۆڵەتی ئەوان نەبێ، کەس ناتوانێ دەستیان بۆ ببا. ئەمە گرفتێکی ئاڵۆزی تا ئێستە بەردەوامە، چونکە خێڵەکان لەبەر گەلێک هۆ- زۆری زەوییەکان بەجێ‌دێڵن و دایناچێنن. بەڵام حکوومەت ناتوانێ بیانفرۆشێ، یا بە کرێ بیانداتە خەڵکانی‌تر، لەبەرئەوەی خێڵات ڕازی‌نین خەڵکی بێگانە بێتە سەر زەویی ئاواییەکانیان. (و.ع)

[٢١١] بۆ نموونە بڕوانە:

Dareen Warriner, Land Reform and Development in the Middle East, (The Broadwater Press, Walwyn Garden City- for the Royal Institute of International Affairs, 1957) pp. 139-142.

٣. عەمارە و کووت لە ماوەی نێوان ١٩١٧-١٩٥٨دا، بڕبڕەی پشتی سەرۆکایەتییە گەورەکانی هۆز بوون لە عیراق؛

٤. عەمارە، لەبەرئەوەی سیستەمێکی زەویوزاری تێدا هەبوو، دەورێکی یەکالاکەرەوەی لە مێژووی ماوەی بیستسالی پێشووی عیراقدا گێڕا.[٢١٢]

دەبێ ئەوە بۆ تێگەیشتنی وتووێژەکانی دوایی زانراوبێ، کە زۆربەی زەویی لەباری کشتوکاڵ پێش ١٩٣٢، زەویی میری بوون و حکوومەت بە کرێ دابوونی بە کەسانێک. ئەمە دۆخەکەیە، لایەنی کەم لە ڕووی تیۆری و قانوونییەوە، بەڵام بە کردەوەیش تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستە. دۆخەکە پاش ١٩٣٢ و لە کۆتاییی ١٩٥٢دا بەو شێوەیە کە لە خشتەی ژمارە ٦ی لای خوارەوەدا نیشاندراوە:

**خشتەی ژمارە ٦**

جۆرەکانی موڵکایەتیی زەویوزار

بەپێی ئاماری کشتوکاڵیی ساڵی ١٩٥٢-١٩٥٣[٢١٣]

(یەک مشارە دەکاتە ٠,٦٢ ئەکر)

| | | |
|---|---|---|
| تاپۆ | ١٠,١٠٨,٨٣٥ مشارە | ٤٠٪ی کۆی موڵکەکانی زەویوزار |
| زەویی میریی بەکرێدراو بە لەزمە | ٦,٧١٣,٢٢٤ مشارە | ٢٦٪ی کۆی موڵکەکانی زەویوزار |
| زەویی پوخت | ٧,٧٠١,٩٦٧ مشارە | ٣٠٪ی کۆی موڵکەکانی زەویوزار |
| موڵکایەتییەکانیتری زەویوزار (وەک وەقف و موڵک و ...) | ١,٠١٢,٠١٣ مشارە | ٤٪ی کۆی موڵکەکانی زەویوزار |
| کۆی هەمووی | ٢٥,٥٣٦,٠٣٩ مشارە | ١٠٠٪ |

[٢١٢] ئەم خاڵە لە شوێنێکیتری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا زیاتر ڕووندەکرێتەوە.

[٢١٣] الحكومة العراقية، وزارة الإقتصاد، تقرير عن الإحصاء الزراعي واحصاء المواشي في العراق ١٩٥٢-١٩٥٣، الجدول ٣، ص١٧.

ئەم خشتەیە لە خشتەی پێشوو و -لە ڕووی مێژووەوە- نوێتری ژمارە ٥ زیاتر گونجاوە بۆ مەبەستەکانی ئەم بەندەی کتێبەکە، چونکە خشتەی دوایی بەشێکی گەورەی زەوییە میرییە پوختەکان کە بەکرێدراون و دانەچێندراون، دەگرێتە خۆی. دەبێ بگوترێ، موڵکایەتییەکانی زەوی لە لیوای عەمارە تا ١٩٥٨، لە جۆری زەویی میریی بەکرێدراون؛ لە کاتێکدا لە کووت لە ١٩٣٢ بەدواوە لە جۆری زەویی تاپۆ و لەزمەن.

**موڵکایەتییەکانی زەوی لە عەمارە:**

سیاسەتی ئینگلیز لە موڵکاندنی زەویدا و بەشێکی گەورەی سیاسەتی حکوومەتی پاشایەتیی عیراقیش، بە پێچەوانەی سیاسەتی تورکەوە بوو. خشتەی ژمارە ٧ جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان ئەم دوو سیاسەتە ڕووندەکاتەوە و بپچوونێکمان دەداتێ سەبارەت بەو گۆڕانکارییانە کە لە ساڵی ١٨٦٥ەوە لە 'شەهلا' و 'مەجەڕی کەبیر'ی بە گەورەترین و دەوڵەمەندترین مەڵبەندە ژمێردراوەکانی لیوای عەمارەدا ڕوویانداوە. لە ماوەی نێوان ١٨٦٥-١٩١٧ی حوکمی تورکیدا، حەوت جار شەهلا دابەشکرایەوە و ٩ جاریش مەجەڕی کەبیر. ماوەی نێوان ١٩١٧-١٩٥٨یش، موڵکدارانی مەجەڕی کەبیر هەرگیز نەگۆڕان و تاکە گۆڕانکاریش لە شەهلا، ئەوەبوو کە ساڵی ١٩٢٣ دابەشکرا بەسەر شێخ محەمەد عریبی (کە بەکرێگری بنەڕەتی بوو) و شێخ فالح سەیهووددا و کە شێخ فالحیش مرد، سەدام فالحی کوڕی پشکەکەیی لە مەڵبەندەکەدا بە میرات بۆ مایەوە.

**خشتەی ژمارە ٧**

ڕوونکردنەوەی جیاوازییە بنچینەییەکانی سیاسەتی موڵکاندنی زەویوزار لە نێوان تورکان و هەردوو حکوومەتی ئینگلیز و پاشایەتیی عیراقدا[٢١٤]

---

[٢١٤] سەرچاوە: سەبارەت بە ماوەی نێوان ١٨٦٥-١٩١٧، بڕوانە: المكتب العربي، قبائل نهر دجلة: الزيرج والبومحمد والبودراج، ص١٠-١١. بۆ ماوەی ١٩١٧-١٩٥٨یش، ڕاپۆرتەکانی ساڵانی ١٩١٨ و ١٩٢٠-١٩٢١ و ١٩٢٩-١٩٣٠ی بەڕێوەبردن. ڕاپۆرتی بلاونەکراوەی ساڵی ١٩٤٤ی موتەسەڕیفی عەمارە و ڕاپۆرتێکی بلاونەکراوە سەبارەت بە موڵکایەتییەکانی زەوی لە عەمارە، ساڵی ١٩٥١.

| ماوە | مەڵبەند | سەرۆکهۆزی خاوەنلەزمە (بەکرێگر) | تێبینی |
|---|---|---|---|
| حوکمی تورکی ١٨٦٥-١٩١٧ | مەجەڕی کەبیر (ناوچەکە لە ١٩٥١دا: ١٣٦,٢٢٩ مشارە یا ٨٤,٤٦٢ ئەکرە) | مونشید کوڕی خەلیفە | هەموو ئەو سەرۆکهۆزانە کە ناویان لەم خشتەیەدا براوە، لە خێڵی ئەلبومحەمەدی لیوای عەمارەن. |
| | | وادی مونشید | |
| | | شەبیاع فەیسەڵ | |
| | | ئەبوڕیشە | |
| | | وادی مونشید | |
| | | عرێبی وادی | |
| | | زامل مونشید | |
| | | سەیهوود مونشید | |
| | | خەلیفە وادی و مەجید خەلیفە | |
| حوکمی تورکی ١٨٦٥-١٩١٧ | شەهلا (ناوچەکە لە ١٩٥١دا: ٨٧,٦٦١ مشارە یا ٥٤,٣٤٩ ئەکرە) | مەجید خەلیفە | |
| | | ... فەیسەڵ | |
| | | وادی مونشید | |
| | | شەبیاع فەیسەڵ | |
| | | یاسین فەیسەڵ | |
| | | شەبیاع فەیسەڵ | |
| | | یاسر فەیسەڵ | |
| | | عرێبی وادی | ١٩١٨ مرد |
| ١٩١٨-١٩٥٨ | | محەمەد عرێبی | کوڕی عرێبی وادی |
| | | محەمەد عرێبی و فالح سەیهوود | دابەشکردنەکە لە ١٩٢٣دا بوو، فالح مەڵبەندێکی تریشی وەرگرت. |
| | | محەمەد عرێبی و سەدام فالح | کە فالح مرد، سەدامی کوڕی بووە میراتگری. |

هۆی گۆڕانکارییەکە ئەوەیە کە ئینگلیزەکان لە عریبی ڕازینەبوون و ویستیان پاداشتی فالح سەیهوود بدەنەوە، لەبەرئەوەی لایەنگریان بوو.[٢١٥] نموونەکانی پێشوو حاڵوبارێکی ناوازەنین، بەڵکوو مەسەلەکە زۆربەی مەڵبەندە گەورەکانیتری لیواکەیش دەگرێتەوە (بڕوانە: خشتەکانی ٨، ٩، ١٢، ١٨)، کە ڕەنگدانەوەی ڕێبازی هەلاواردەی سیاسەتی بریتانیایە لە ماوەی ١٩١٧-١٩٥٨دا بۆ چەسپاندنی پێگە و دەسەلاتی سەرۆکهۆزە گەورەکان، بە پێچەوانەی سیاسەتی پێشووی تورکیاوە، کە ئامانجی نەهێشتنی پێگەی سەرۆکهۆزەکان بوو.

دەتوانین دابەشبوونی موڵکایەتییەکانی زەویوزاری عەمارە لە ١٩١٨دا، لە خشتەی ژمارە ٨دا ببینین. ئەم لیوایە کە -بێگومان- بە دەوڵەمەندترین لیوای عیراق دادەنرێ لە بەرهەمهێنانی چەڵتووک و لە زەویی لەباردا بۆ کشتوکاڵ، کە -بە مەزەندەی داوسۆن- لە ١٩٣٠دا گەیشتووەتە ٦،٦٨٠کلم٢ (واتە ٢،٧٦٢،٠٠٠ مشارە، یا ١،٦٥٦،٦٤٠ ئەکر)،[٢١٦] بەلام ڕەنگە لە ١٩١٨دا بە کەمتر مەزەندەبکرێ، تەنیا ٣٣ موڵکدار یا خاوەنلەزمە (مولتەزیم)[٢١٧] لەوێ هەبوو. ئەو خاوەنلەزمانە ٢٩یان سەرۆکهۆز، ٣یان سادات و یەکیان شارییە. هەرە گرنگترین خاوەنلەزمە ئەوانەن کە لە خێڵەکانی ئەلبومحەمەد و ئوزێرج و بەنیلامن و تەنیا لە بنەماڵە حوکمبەدەستەکانی ئەم هۆزانەن.

**خشتەی ژمارە ٨**

دابەشبوونی موڵکایەتییەکانی زەویوزاری لیوای عەمارە لە ١٩١٨دا
لەگەڵ ناوی مەڵبەندەکان و هەرە گرنگترین سەرۆکهۆزەکان[٢١٨]

زانیاری لەبارەی لیواکەوە:

سەرجەمی زەویی داچێندراو وەک لە ١٩٣٠دا مەزەندەکراوە: ٦،٦٨٠کلم٢، یا ٢،٦٧٢،٠٠٠ مشارە، یان ١،٦٥٦،٦٤٠ ئەکر

---

[٢١٥] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٩-١١٠.

[216] Sir Ernest Dowson, An Inquiry in to Land Tenure and Related Questions, p. 11.

[٢١٧] خاوەنلەزمە: مولتەزیم، بەکرێگری زەویی میریی دەوڵەتە.

[٢١٨] سەرچاوە: المکتب العربي، قبائل نهر دجلة، ص١، ٤، ١٠-١١، ١٩، ٢٤؛ ڕاپۆرتەکانی ساڵی ١٩١٨ی بەڕێوەبردن، ل٣١٥.

سەرجەمی ژمارەی دانیشتووان بەپێی سەرژمێریی ناتەواوی ١٩٤٧: ٣٠٨,٠٠٠ کەس

مولّکایەتییەکانی زەوی‌وزار لە ١٩١٨دا:

کورتە:

ژمارەی سەرجەمی مولّکدارانی زەوی: ٣٣

ژمارەی سەرۆکهۆزان: ٢٩

ژمارەی شارنشینان: ١

ژمارەی سادات: ١

| هۆز | بنەماڵە (ماڵ) | سەرۆکهۆز | مەڵبەند | ناحیە | بەروبوومی سەرەکی |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەلبومحەمەد | شوەیمل | محەمەد عرێبی | شەهلا | کەحلا | چەڵتووک |
| ئەلبومحەمەد | شوەیمل | ماجید خەلیفە | مەجەڕی کەبیر و دەوروبەری | مەجەڕی کەبیر | چەڵتووک |
| ئەلبومحەمەد | شوەیمل | فالح سەیهوود | جەمشە و کەسرە و حوفەیرە | قەلعەی ساڵح | چەڵتووک |
| ئەلبومحەمەد | شوەیمل | عوسمان یاسر، تاهیر حاتەم | شەتاوی جرێت | قەلعەی ساڵح | چەڵتووک |
| ئوزێرج | ئامۆزایان | شەوال فەهد، سەلمان مونشید | مەجەڕی سەغیر | مەجەڕی سەغیر | چەڵتووک |
| بەنولام | جەندیل | شبیب مزبان | مەجزەرە | عەمارە | گەنم |
| بەنولام | جەندیل | جەوی لازم | سی‌یەک و دووسی‌یەک | عەلی غەربی | گەنم |
| بەنولام | جەندیل | فالح بونیان | ؟ | عەمارە | گەنم |
| بەنولام | جەندیل | غەزبان بونییە | دوێرج | عەمارە | گەنم |
| بەنولام | عەڕار | کەمەندار فەهد | عەلی غەربی و قوتبە | عەلی غەربی | گەنم |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بەنولام | عەڕار | ئەبوڕیشە | ئومولحەنا و ئومولبرام | عەلی غەربی | گەنم |
| ئەلبودەڕاج | | موتەشەر فەیسەڵ | کومێت، بوغەیلات و هیی‌تر | کومێت | گەنم و جۆ و چەڵتووک |
| سۆدان | | سەیهوود ئەلبوعجێل | بەحاسە | کەحلا | گەنم و جۆ |

تێبینی: موڵکدارانی‌تری زەوی لە سەرۆکهۆزانن و ئەمانەن: ٩ لە سەواعید و ٢ لە بەهادل و ١ لە ئوزێرج و ١ لە بەنی‌لام.

**خشتەی ژمارە ٩**

**دابەشبوونی موڵکدارانی زەویی عەمارە لە ١٩٢١دا،**

**ناوی مەڵبەندەکان و سەرۆکهۆزانی بە ڕێژە گرنگ[٢١٩]**

**کورتە:**

**ژمارەی سەرجەمی موڵکدارانی زەوی: ٤٣**

**ژمارەی سەرۆکهۆزان: ٣٧**

**ژمارەی شارنشینان: ١**

**ژمارەی سادات: ٥**

| هۆز | بنەماڵە | سەرۆکهۆز | مەڵبەند |
|---|---|---|---|
| ئەلبومحەمەد | شوەیمل | حاتەم سەیهوود | شەشیەکی مەڵبەندی شەتاو (الشط)ی موڵکی عوسمان یاسین، ناوبراو نیوەی زەوییەکانیی بەکرێ‌گرتووە. |
| ئەلبومحەمەد | شوەیمل | غەللووب زبوون | هەمان شت. |
| بەنولام | جەندیل | عەلوان جەندیل | ئومولبرام و ٢,٥ی ئومولحەنا کە لە ئەبوڕیشە بەکرێ‌گیراوە. |

219 Administration Reports of Amara for 1920-1921, pp. 5, 19-21, 22, 23.

| | | | |
|---|---|---|---|
| بەنولام | جەندیل | جەتاب سەعید | غریبەی شەرقی |
| بەنولام | جەندیل | یەعگووب کوڕی یووسف | غریبەی غەربی |
| بەنولام | جەندیل | کەنفاز مۆزان | خوبنە |
| بەنولام | جەندیل | مەناتی فەعال | خوبنە |
| بەنیسەعید | بەزوون | ئەبوعۆجە | بەشێکی مەجەڕی سەغیر |

تێبینی: سەرۆکهۆزانیتری تازە: ٢ لە ئەلبومحەمەد، غەزبان بونییە* بە هۆی چالاکییە سیاسییەکانیەوە لابرا، بەڵام لە ١٩٢٢دا دانرایەوە.

لە ساڵانی حوکمی تورکیدا، زۆرترین ژمارەی موڵکدارانی زەوی هەبوو، هەندێکیان لەگەڵ تورکەکان هەڵات و پاشان گەڕایەوە و بە شێوەیەکی کاتی چینێکی پێکهێنا «لەو سەرۆکهۆزانە کە زەوییان نەبوو.» لە ماوەی حوکمی تورکیدا، ژمارەیەک مەڵبەندی موڵکی هەندێ خەڵک هەبوو، واتە هیی پیاوانی شاری، سەرۆکهۆزەکان لە سەروبەندی یەکەم جەنگی جیهانیدا لێیان زەوتکردن.[٢٢٠] ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز لەو لیوایە، هاوڕای گازندەی سەرکاران بوو کە بەردەوام دەیانگوت: «سەرۆکهۆزەکان، لە سایەی حوکمی ئێمەدا بوونە خاوەنی زەویوزارێکی گەورەتر لەوەی سەردەمی تورکی!»[٢٢١]

لە ١٩٢٠یشدا، چەند مەڵبەندێک دابەشکرا، تا چەند ڕووبەرێکی زەوی دابینبکرێ بۆ ئەو سەرۆکهۆزانە کە هیچیان نەبوو (بڕوانە گۆڕانکاریی ناو خشتەی ژمارە ٩). لە ١٩٢١دا، ٤٣ موڵکداری زەوی هەبوو؛ ٣٧یان لە سەرۆکهۆزان، ٥ سادات، ١یان شاری بوو.

---

* غەزبان بونییە: سەرۆکی خێڵی تائیی بەنولامە لە عەمارە. ١٨٩٠ لەدایکبووە و تووشی تەنگپیهەڵچنین و پێکدادان بووە لەگەڵ -لە لایەکەوە- دەوڵەتی عوسمانی و -لە لایەکیترەوە- ئینگلیزەکان. بەشداری جووڵانەوەی جیهادی ژێر سەرکردایەتیی سەیید حەبووبی بووە دژی ئینگلیز و ساڵی ١٩٢٣ بووە بە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندن. ١٩٦٤ لە بەغدا سەریناوەتەوە. (و.ع)

220 Administration Reports of Amara for 1920-1921, p. 26.

221 Ibid, p. 23.

**خشتەی ژمارە ١٠**

**سەرۆکهۆزانی گەورەترین موڵکداری زەوی لە عەمارە**

**لە ١٩٢٠-١٩٢١دا[٢٢٢]**

| هۆز | سەرۆکهۆز | دەرامەتی ساڵی ١٩٢٠ی دەوڵەت لە زەوی بە ڕووپی | دەرامەتی ساڵی ١٩٢١ی دەوڵەت لە زەوی بە ڕووپی |
|---|---|---|---|
| ئەلبومحەمەد | محەمەد عریبی | ٣,٥٦,٠٠٠ | ٤,١٢,٠٠٠ |
| ئەلبومحەمەد | مەجید خەلیفە | ٣,١٣,٢٢٠ | ٣,٦٣,٢٢٠ |
| ئوزێرج | سەلمان مونشید | ١,٥٣,٤٠٤ | ١,٨٨,٤٠٤ |
| ئوزێرج | شەوال فەهد | ١,٥٣,٤٠٤ | ١,٨٨,٤٠٤ |
| ئەلبومحەمەد | عوسمان یاسر | ١,٢١,١٢٥ | * |
| سەرجەم | | ١٠,٩٧,١٥٣ | ١١,٥٢,٠٢٨ |
| سەرجەمی داهاتی زەویی لیوا بە ڕێژەی سەدی | | ١٥,٩١,٧٣١ | ١٧,٧٢,٦٠٦ |
| ڕێژەی سەدی | | ٪٦٨ | ٪٦٥ |

* ئەم مەڵبەندە بە نیوەیی دابەشکرا و سەرۆکهۆز ٥٦,٠٠٠ ڕووپیی دا.

سەرەڕای ئەوە، ژمارەکانی دەرامەتی دەوڵەت لە زەویوزار، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆربەی زەویوزار لە چنگی پێنج یا چوار سەرۆکهۆزی هەردوو هۆزی ئەلبومحەمەد و ئوزێرجدا کۆبووەتەوە. ئەو سەرۆکهۆزانە لە ١٩٢٠دا ٪٦٨ی دەرامەتی دەوڵەتیان لە زەویوزاری لیواکە داوە و لە ١٩٢١یشدا ٪٦٥ (بڕوانە: خشتەی ژمارە ١٠).

سەبارەت بە ١٩٢٩، وێنەکە زیاتر ڕوون و ئاشکرایە (بڕوانە خشتەی ژمارە ١١). لەم ساڵەدا ٨١ موڵکداری زەوی هەبوو: ٥٥یان سەرۆکهۆز و ١٨ شاری و ٧ سادات و ١یان مەلا بوو. وێڕای زیادبوونی ژمارەی موڵکدارانی زەوی لەچاو

[٢٢٢] لە لیستەکانی ناو Administration Reports of Amara for 1920-1921, pp. 13-28 وەرگیراون.

ساڵانی ١٩٢٠ و ١٩٢١دا، دەبێ سەرنجبدەین کە موڵک و ماڵی سەرۆکهۆزەکان تا ڕادەیەکی زۆر بە سەلامەتی ماوەتەوە.

**خشتەی ژمارە ١١**

**دەرامەتی دەوڵەت لە زەویوزار[٢٢٣]**

| پێڕی دەرامەت بە ڕووپی | ژمارەی مولکدارانی زەوی | بنچینە یا بارودۆخی کۆمەلایەتی | | | | ڕێژەی سەدیی سەرجەمی داهات |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | سەرۆکهۆز | سەیید | شاری | مەلا | |
| لە ١٠٠٠ کەمتر | ٨ | ٣ | | ٥ | | ٪٢٢ |
| لە ١٠٠١–٢٠٠٠ | ٣ | ٢ | | ١ | | |
| ٢٠٠١–٥٠٠٠ | ١٣ | ٦ | ١ | ٦ | | |
| ٥٠٠١–١٠٠٠٠ | ١٤ | ٦ | ٥ | ٣ | | |
| ١٠٠٠١–٢٠٠٠٠ | ٢١ | ١٧ | ١ | ٢ | ١ | |
| ٢٠٠٠١–٣٠٠٠٠ | ٧ | ٦ | | ١ . | | |
| ٣٠٠٠١–٤٠٠٠٠ | ٦ | ٤ | ٧ | | | ٪١٧ |
| ٤٠٠٠١–٩٠٠٠٠ | ٤ | ٤ | | | | |
| ٣٠٠٠٠٠–٤٠٠٠٠٠ | ٥ | ٥ | | | | ٪٦١ |
| کۆی هەمووی | ٨١ | ٥٥ | | ١٨ | ١ | ٪١٠٠ |

تەنیا پێنج سەرۆکهۆزی گەورە هاوبەشی ڕێژەی ٦١ی سەرجەمی دەرامەتەکان بوو، لە کاتێکدا ١٠ی‌تر بە ڕێژەی ١٧٪ هاوبەش‌بووە (بڕوانە: هەردوو خشتەی ژمارە ١١ و ١٢). زانیاریی تەواومان نییە سەبارەت بە چۆنایەتیی خەملاندنی ئەم دەرامەتانە، کە دەبێ هەر سەرۆکهۆزێک بیاندا. بەڵام دەزانین داوا لە سەرۆکهۆزانی بەرهەمهێنی چەڵتووک کراوە، -بۆ نموونە- سەرۆکهۆزانی ئەلبومحەمەد، بەپێی بڕیاری ڕۆژی ١٩٢٦/٩/١ی کۆمیسێری باڵا، بڕەپارەیەکی نەختینەی ٧ ڕووپێ و ١٠ عانە بۆ هەر مشارەیەک چەڵتووک بدەن. دەکرێ دوو ئەنجام، بەپێی ئەم ڕاستییە بەدەستبێنین:

[٢٢٣] ئەم خشتەیە پشتبەستووە بە لیستی دەرامەتدەران کە خراوەتە تەک ڕاپۆرتی بڵاونەکراوەی مانگی ئابی ١٩٢٩ی پشکنێری کارگێڕی سەبارەت بە عەمارە.

یەکەم- مادام تێکڕای بەرهەمهێنانی چەڵتووک لە عەمارە بە نزیکەی ٤٠٠کگم بۆ هەر مشارەیەک مەزەندەدەکرێ[٢٢٤] و نرخی بە کۆ فرۆشتنیشی بۆ یەک تەن لە ١٩٢٨دا، بەپێی جۆری برنجەکە، لە نێوان ١١٠-١٨٠ ڕووپیدایە، کەواتە یەک مشارە چەڵتووک داهاتێک دەخاتە دەستی سەرۆکهۆز، بڕەکەی -لایەنی کەم- نزیکەی ٤٤ ڕووپییە. لەبەرئەوە حکوومەت ١٥٪ی بەرهەمی زەوییەکانی وەک لایەنی زۆر وەردەگرێ، کە نیوەی تێکڕای ڕەچاوکراوی پشکی حکوومەتە، وەک قانوونی ژمارە ٤٢ی ساڵی ١٩٢٧ دیارییکردووە (بڕوانە: خشتەی ژمارە ٢، ستوونی ٧- پاشکۆی ١).

**خشتەی ژمارە ١٢**

سەرۆکهۆزە گەورە و خاوەن موڵکوماڵە مامناوەندییەکانی عەمارە
لە ساڵی ١٩٢٩دا[٢٢٥]

ژمارەی سەرجەمی موڵکدارانی زەوی: ٨١

| هۆز | سەرۆکهۆز | دەرامەت بە ڕووپی |
|---|---|---|
| ئـ سەرۆکهۆزە گەورەکان | | |
| ئەلبومحەمەد | محەمەد خەلیفە | ٣,٩٢,٧٠٠ |
| ئوزێرج | سەلمان مونشید | ٣,٦٩,١٨٥ |
| ئوزێرج | شەوال فەهد | ٣,٦٩,١٨٥ |
| ئەلبومحەمەد | محەمەد عرێبی | ٣,١٧,٦٦٠ |
| ئەلبومحەمەد | فالح سەیهوود | ٣,٠٨,٢٥٠ |
| سەرجەم | | ١٧,٥٦,٩٨٠، واتە هاوتای ١٧٪ی دەرامەت |
| ب. سەرۆکهۆزانی خاوەن موڵکوماڵی مامناوەندی | | |
| بەنولام | کەمەندار فەهد | ٨٥,٥٠٠ |

[٢٢٤] ئەم خەمڵاندنە ساڵی ١٩١٨ لە لایەن فەرمانبەرانی دەرامەتەوە ئامادەکراوە. بڕوانە: ڕاپۆرتەکانی ساڵی ١٩١٨ی بەڕێوەبردن، ل٣٢١. حکوومەت تێکڕای بەرهەمهێنانی هەر مشارەیەکی لە ١٩٢٥دا بە ٥٥کگم مەزەندەکردووە بۆ زەوییە بەرهەمهێنەکانی چەڵتووک لە دیوانییە، هەرچەندە شارەزایانی کشتوکاڵ بە ٦٣٠ کیلۆی دەخەمڵێنن. بڕوانە: احمد فهمي، المدير العام للحسابات، تقرير حول العراق، ص٨٢

[٢٢٥] سەرچاوە: خشتەکە لە لیستی دەرامەتدەران دەرهێنراوە، خراوەتە تەک ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی مانگی ئابی ١٩٢٩ی پشکنێری کارگێڕیی عەمارە.

| | | |
|---|---|---|
| ئەلبومحەمەد | حموود خەلیفە | ٧٤,٠٠٠ |
| ئەلبومحەمەد | حاتەم سەیهوود | ٦٤,٠٠٠ |
| ئەلبومحەمەد | تاهیر حاتەم | ٦٠,٠٦٠ |
| بەنولام | جەوی لازم | ٣٨,٠٠٠ |
| بەنولام | غەزبان بونییە | ٣٨,٠٠٠ |
| ئەلبومحەمەد | غەلووب زبوون | ٣٧,٨٠٠ |
| * | شامووخ فارس | ٣٤,٤٥٠ |
| بەنولام | شبیب مزبان | ٣١,٠٠٠ |
| ئەلبودەراج | متەشەر فەیسەڵ | ٣٠,٨٠٠ |
| سەرجەم | | ٤,٩٧,٦١٠، واتە هاوتای ١٧٪ی دەرامەت |

* نەمتوانی دیاریبکەم ئەم سەرۆکهۆزە سەر بە چ هۆزێکە.

دووەم- ئەنجامگیرییەکەیتر پێوەندیی بەو سەرۆکهۆزەوە هەیە کە مەرەزەیکردووە، وەک شێخ مەجید خەلیفە، دەرامەتە دراوەکەی بە دەوڵەت گەیشتە ٣,٩٢,٧٠٠ رووپی. زەویی بەمەرەزەکراو لە ١٩٢٩دا، دەبێ نزیکەی ٥٦,٦٠٠ مشارە (واتە کەموزۆر ٣٤,٧٠٠ ئەکر) بووبێ. ئەمە ئەگەر گریمان هەموو ئەو رووبەرانە کە باجیان بەسەردا سەپێندراوە، رووبەری داچێندراو بن، مەسەلەکەیش وەهانییە. لەبەرئەوە دەبێ سەرجەمی داهاتی لایەنی کەم ٢٤,٢٠,٠٠٠ رووپی بێ، بەدەر لەو چارەکە کە وا دانراوە پشکی ئەو ماوەیەی جووتیارانی لیواکە بێ.

**خشتەی ژمارە ١٣**

دەرامەتی دەوڵەت لە پێنج گەورە سەرۆکهۆزی عەمارە

بە بەراورد لەگەڵ دەرامەتی دراو بە دەوڵەت لە پێنج لیوای هەر دوازدە

لیواکەی عیراق لە ١٩٢٨-١٩٢٩دا[٢٢٦]

سەرجەمی داوای دەوڵەت لە دەرامەتی پێنج گەورە سەرۆکهۆزی عەمارە، ١٧,٥٦,٦٨٠ رووپی بووە.

[٢٢٦] بروانە: خشتەی ژمارە ١٦.

دەرامەتی دراوی لیواکان بە دەوڵەت لە ١٩٢٨دا[٢٢٧]

| | |
|---|---|
| هەولێر | ٥,٠٣,٦٣٣ |
| دلێم | ٢,٧٣,٣٤٨ |
| کەربەلا | ٢,٠١,٥٧٩ |
| کەرکووک | ٤,٨٤,٥٢٥ |
| سلێمانی | ٣,٥٩,٩٦٩ |
| سەرجەمی دەرامەتی پێنج لیوا | ١٨,٢٣,٠٥٤ رووپی |

دەیشتوانین بۆچوونێک سەبارەت بە زۆریی داهاتی سەرۆکهۆز گەڵاڵەبکەین، بە تەماشاکردنی داوای دەرامەتی دەوڵەت لە پێنج گەورە سەرۆکهۆزی عەمارە، کە گەیشتە ١٧,٥٦,٩٨٠ رووپی و کەموزۆر هاوتای تەواوی دەرامەتەکانی خەزێنەی ساڵی ١٩٢٨ی پێنج لیوای عیراقە لە کۆی ١٤ لیوا، کە سەرجەمی دەرامەتی دراوی ئەم پێنج لیوایە گەیشتووەتە ١٨,٢٣,٠٥٤ رووپی (بڕوانە: خشتەی ژمارە ١٣).

سادات و پیاوانی شارنشین، وەک لە خشتەی ژمارە ١١دا دەردەکەوێ، لەچاو سەرۆکهۆزەکاندا، بە موڵکداری بچووکی زەوی دادەنرێن. پیاوانی شارنشین بە شێوەیەکی ئاسایی لە چینی سەرمایەدارانی شارن، کە لە دێهاتی عەمارە بە گوبانییە ناسراون. لەوە دەچێ ئەو ڕێگەیە کە ئەم گوبانییانەی پێ بەرزبووەوە و بوونە خاوەنی زەویوزار، وەک لە خشتەی ژمارە ١٤دا دەکەوێتەڕوو، تا ڕادەیەکی زۆر ئەوەبێ کە ئاوهەڵکێشیان کڕیوە.

**خشتەی ژمارە ١٤**

خاوەنایەتیی ترومپاکانی لیوای عەمارە لە ئابی ١٩٢٩دا[٢٢٨]

| | |
|---|---|
| ژمارەی سەرجەمی ترومپاکان | ١٠٥ |
| ژمارەی ترومپای سەرۆکهۆزەکان | ٦١ |
| ژمارەی ترومپای هاوبەشی سەرۆکهۆزەکان و سادات | ٢ |

[٢٢٧] الحکومة العراقیة، التقریر السنوي لعملیات مدیریة الایرادات التابعة لوزارة المالیة ١٩٢٨-١٩٢٩، ص٣٠-٣١.

[٢٢٨] ئەم زانیارییانە لە لیستێکی ژمارەی ئاوهەڵکێشەکان وەرگیراوە، کە خراوەتە تەک ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی مانگی ئابی ١٩٢٩ی پشکنێری کارگێڕیی عەمارە.

| | |
|---|---|
| ژمارەی ترومپای سادات | ٩ |
| ژمارەی ترومپای هاوبەشی سەرۆکهۆزەکان و شارنشینان | ٣ |
| ژمارەی ترومپاکانی شارنشینان | ٣٠ |

ژمارەی موڵکدارانی زەوی لە ١٩٤٤دا زیادبوو، تا گەیشتە ١٨١ (بڕوانە: خشتەی ژمارە ١٥). واتە ژمارەکە لەچاو ساڵانی بەرودوا ١٩١٨ و ١٩٢٩دا، بوو بە دووئەوەندە و پاشان سێئەوەندە (بڕوانە: خشتەی ژمارە ١٦). ژمارەی شارنشینانی موڵکداری زەوی لە ١ەوە ساڵی ١٩١٨، زیادبوو بۆ ١٨ لە ١٩٢٩دا و پاشان ٣٣ لە ١٩٤٤دا. سەرباری ئەوە، ئەگەر هەردوو خشتەی ژمارە ١١ و ١٥ بەراوردبکەین، دەردەکەوێ زیادبوونەکە تا ڕادەیەکی زۆر لە ژمارەی موڵکدارانی خاوەن موڵکایەتییەکی مامناوەندیدایە. ساڵی ١٩٤٤ تەنیا ٩ کەس زەویوزاریان بە ڕووبەری ١٢-١٠٠ مشارە هەبوو و ٢٩یش ڕووبەری زەوییەکانیان ١٠١-١٠٠٠ مشارە بوو، لە کاتێکدا ١٢٥ موڵکداریش هەبوو، خاوەنی زەویی ڕووبەر ١٠٠١-٣٠,٠٠٠ مشارە بوو. موڵکایەتیی زەویوزاریش لە دەستی سەرۆکهۆزە گەورەکاندا مایەوە، بەبێ ئەوەی کەس دەستیان بۆ بەرێ. حەوت سەرۆکهۆز هەبوو، هەر یەکەیان خاوەنی ١٠٠,٠٠١-٤٠٠,٠٠٠ مشارە بوو.

بارودۆخەکە لە ١٩٥١دا وەک خۆی مایەوە و بە شێوەیەکی بنچینەیی نەگۆڕا. ئەو ساڵە ٨ بنەماڵەی سەرۆکهۆز هەبوو، ٥٣٪ی ڕووبەری سەرجەمی موڵکایەتیی زەویی عەمارەی هەبوو و ١٨ سەرۆکهۆزیتریش خاوەنی ١٩٪ی بوو (بڕوانە: خشتەی ژمارە ١٧). لەم خشتەیەوە دەبینین سەرۆکهۆز و ئەو بنەماڵانە کە خاوەنی گەورەترین مەڵبەند بوون، ئەوان خۆیان زۆرترین کرێیان لە ١٩٢٩دا دەدا بە دەوڵەت. بەڵام ئاشکرایە هێزی بەرهەمهێنانی مەڵبەندەکە، نەک قەوارەی، داهاتی سەرۆکهۆز و پاشان بایەخەکەی دیاریدەکا. مەڵبەندەکانی سەرۆکهۆزانی ئەلبومحەمەد و ئوزێرج وا ناسرابوون کە

بەرهەمیان لە مەڵبەندەکانیتر زیاترە. وێڕای ئەوە، تەنیا بەشێکی چکۆلەی مەڵبەندە گەورەکان* لە ساڵانی چل و پەنجادا بەکردەوە دادەچێندران.[٢٢٩]

دەتوانین بە بەراوردکردنی خشتەی ژمارە ١٧ لەگەڵ خشتەکانی ژمارە ٨ و ٩، سەرنجی خاڵێکیتری گرنگ بدەین، ئەویش ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆری مەڵبەندە گەورەکان (ئەو مەڵبەندانەن کە لە خشتەی ژمارە ١٧دا ئاماژەیان بۆ کراوە)، سەرباری گۆڕانی قەوارەی هەندێ مەڵبەند (هەندێکیان هەر بەناو گۆڕدرا)، هەر لە چنگی هەمان سەرۆکهۆزەکان یا کوڕانیاندا پاش مردنیان ماونەوە. ئەگەرچی ئەم زەوییانە لە ڕووی قانوونییەوە بە زەویی بەکرێدراوی دەوڵەت دەژمێردرێن، بەڵام بەکردەوە مۆرکی موڵکایەتییەکی نیمچەتایبەتیان هەیە. بەم شێوەیە کوڕان عەقدی بەکرێگرتنی زەوییان لە باوکانیانەوە بۆ دەمێنێتەوە. سەرەڕای ئەوە، حکوومەت - وەک دەبینین- هەر شتێکی کەم وەردەگرێ لەو سوودانە کە سەرۆکهۆزەکان لەم زەوییانە دەستگیریان دەبن.

**خشتەی ژمارە ١٥**

**دابەشبوونی موڵکایەتییەکانی زەویی عەمارە لە ١٩٤٤دا[٢٣٠]**

**(ڕووبەری سەرجەمی موڵکایەتییەکانی زەویوزار دەگاتە ٣,٦٤٧,٧٩٢ مشارە و مشارەیش دەکاتە ٠,٦٢ ئەکر)**

| قەوارەی موڵکایەتییەکانی زەوی | ژمارەی موڵکداران |
|---|---|
| لە ١٢-١٠٠ مشارە | ٩ |
| لە ١٠١-١٠٠٠ | ٢٩ |

---

* سەرۆکخێڵە موڵکدارە گەورەکان، هەموو ساڵێک بەشێکی فراوانی زەوییەکانیان بەجێدەهێشت و دایانەدەچاندن، بۆ -گوایە- بەهێزکردن و هێشتنەوەی پیت و فەڕیان. ئەمەیش دەبووە مایەی تاڵاوچێشتنی جووتیاران، چونکە بەروبووم و دەرامەتیان کەمدەبووەوە. لە کاتێکدا هێندێ کەس ئەوەیان بە هۆی بنچینەیی باشتربوونی کشتوکاڵ و بەرهەمداریی سەردەمی پاشایەتی داناوە (و.ع)

[٢٢٩] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی مانگی مایسی ١٩٤٤ی موتەسەڕیفی عەمارە بە ناونیشانی "ترکة العقود المباشرة وتأثیرها السيء علی لواء العمارة"؛ ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ساڵی ١٩٥٢ سەبارەت بە موڵکایەتیی زەویوزار لە عەمارە.

[٢٣٠] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ڕۆژی ١٩٤٤/٥/٩ی موتەسەڕیفی عەمارە بە ناونیشانی "ترکة العقود المباشرة وتأثیرها السيء علی لواء العمارة"؛ ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ساڵی ١٩٥٢ سەبارەت بە موڵکایەتیی زەویوزار، لە کتێبخانەی ئاسایشی بەغدادایە.

| | |
|---|---|
| له ١٠٠١-١٠٠٠٠ | ٩٣ |
| له ١٠٠٠١-٣٠٠٠٠ | ٣٢ |
| له ٣٠٠٠١-٥٠٠٠٠ | ٢ |
| له ٥٠٠٠١-١٠٠٠٠٠ | ٩ |
| له ١٠٠٠٠١-٤٠٠٠٠٠ | ٧ |
| سەرجەم | ١٨١ |

**خشتەی ژمارە ١٦**

**ژمارە و چینی موڵکدارانی زەویی عەمارە لە ماوەی نێوان ١٩١٨-١٩٥١دا**

| ساڵ | ژمارەی هەموو موڵکدارانی زەوی | ژمارەی سەرۆکهۆزان | ژمارەی سادات | ژمارەی شارنشینان | ژمارەی مەلایان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩١٨ | ٣٣ | ٢٩ | ٣ | ١ | |
| ١٩٢١ | ٣٤ | ٣٧ | ٥ | ١ | |
| ١٩٢٩ | ٨١ | ٥٥ | ٧ | ١٨ | ١ |
| ١٩٤٤ | ١٨١ | ١٤٨[٢٣١] | | ٣٣ | |
| ١٩٥١ | ١٧٧ | ١٤٤[٢٣٢] | | ٣٣ | |

**خشتەی ژمارە ١٧**

**سەرۆکهۆزانی گەورە و مامناوەندیی عەمارە لە ١٩٥١دا[٢٣٣]**

**پوختەی دۆخی موڵکایەتییەکانی زەوی لە ١٩٥١دا:**

**ڕووبەری سەرجەمی موڵکدارانی زەوی: ١٧٧**

**سێ سەرۆکهۆز و کوڕانی چوار سەرۆکهۆزیتر پێکەوە ١،٨٢٤،٨٤١ مشارە، یا ٥٣٪ی ڕووبەری سەرجەمی موڵکایەتییەکانی زەوییان هەیە. ١٠ سەرۆکهۆزیتر خاوەنی ٦٨٩،٥٦ مشارە، یا ١٩٪ی ڕووبەری سەرجەمی موڵکایەتییەکانی زەوییە.**

---

[٢٣١] ژمارەکە، ژمارەی سەرۆکهۆزان و سادات دەگرێتەوە. سەرچاوە: بڕوانە ناوەڕۆکی بابەتەکە.

[٢٣٢] ژمارەکە، ژمارەی سەرۆکهۆزان و سادات دەگرێتەوە. سەرچاوە: بڕوانە ناوەڕۆکی بابەتەکە.

[٢٣٣] سەرچاوە: ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوە سەبارەت بە موڵکایەتییەکانی زەویزاری عەمارە، لە کتێبخانەی ئاسایشی بەغدادایە.

| هۆز | سەرۆکهۆز | رووبەری مەڵبەند بە مشارە | ناوی مەڵبەند | ناحیە | کرێی بە رووپی دراو لە ١٩٢٩دا[٢٣٤] |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەلبومحەمەد | مەجید خەلیفە و کورانی | ١٣٦,٢٢٩ | مەجەڕی کەبیر | مەجەڕی کەبیر | ٤,٩٥,٧٠٠[٢٣٥] |
| ئەلبومحەمەد | محەمەد عریبی | ٦٦,٢٣٦ | کەحلا[٢٣٦] | کەحلا | ٣,١٧,٦٦٠ |
| ئەلبومحەمەد | تاهیر حاتەم | ٤٤,٥٩٩ | کەسرە و جەمشە | قەلعەی ساڵح | ٦٠,٠٦٠ |
| ئەلبومحەمەد | حاتەم سەیهوود | ٣٣,٨١٧ | بەحاسە | کەحلا | ٦٠,٠٠٠ |
| ئوزێرج | کورانی شەوای فەهد | ١٤٨,٤٥٠ | مەجەڕی سەغیر | مەجەڕی سەغیر | ٣,٦٩,١٨٥ |
| ئوزێرج | موتڵەگ سەلمان، کوڕی سەلمان مونشید | ٧٢,٦٨٨ | مەجەڕی سەغیر | مەجەڕی سەغیر | ٣,٦٩,١٨٥ |
| بەنولام | کورانی عەلوان جەندیل | ١٣٨,٣١٢ | ئومولحەنا و ئومولبرام | شێخ سەعد | ٢٠,١٢٥ |
| بەنولام | حاتەم غەزبان | ٩٠,٧٥٩ | ئومولحەنا و ئومولبرام | کومێت | ٣٨,٠٠٠ |
| بەنولام | یەعگووب یووسف | ٩٦,٢٤٢ | غریبەی غەربی | شێخ سەعد | ١٥,٥٠٠ |
| بەنولام | زیاب جانب سەعید | ٦٦,٨٦٨ | غریبەی غەربی | شێخ سەعد | ١٣,٠٠٠ |

[٢٣٤] کرێ، یا هەمان سەرۆکهۆز یا باوکی یا خزمێکی بە شێوەیەکی گشتی بە ڕێژەی جیاواز لە هەمان مەڵبەندا دەیدا (بڕوانە: ناوەڕۆک).

[٢٣٥] ٣,٩٢,٧٠٠ ڕووپی و ٧٤,٠٠٠ ڕووپێی زیادیش دەگرێتەوە، مەجید و موشەتەت و حموود داویانە و هەموویان بەڕودوا سەر بە ماڵی خەلیفەن.

[٢٣٦] ناوی تەواوی کەحلای غەربی (کحلاء الغربیة)یە و بەشێکە لە شەهلا (شهلاء)ی کۆن.

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بەنولام | شبیب مزبان | ٥١,٦٢١ | مەجزەرە | عەمارە | ٣١,٠٠٠ |
| بەنولام | کەمەندار فەهد | ٦٥,٦٠٢ | فەهدییە (عەلی غەربی) | عەلی غەربی | ٨٥,٥٠٠ |
| بەنولام | کوڕانی کەنفاز مەوازن | ١٢٩,١٤٠ | کەریمە | عەلی غەربی | ١٣,٢٥٠ |
| بەنولام | مەناتی فەعال | ٧٩,٧٠٤ | حەرکانییە | عەلی غەربی | ١٣,٢٥٠ |
| ئەلبودەراج | کوڕانی محەمەد حەتاب | ٣٧٥,٦٠٣ | بوغەیلات و جەفجافە | کومێت | ١٨,٠٣٠ |
| ئەلبودەراج | کوڕانی فەیسەڵ | ٢٣٨,٦٧٨ | کومێت | کومێت | ٣٠,٨٠٠ |
| بەنوسەعید | گاسد حەمدان | ٣٩٩,٧٢٦ | ڕوەیزات و شەتانییە | مەجەڕی سەغیر | ٢١,٤٠٠ |
| بەنوسەعید | فالح ئەبوعوجە | ٢٥٨,٧٠٣ | جزیرەی سەید ئەحمەدی ڕوفاعی | مەجەڕی سەغیر | ٦,٦٥٠ |

ڕووبەری مەڵبەندەکانی هەندێ سەرۆکهۆز، بە زۆر گەورە لەقەڵەمدەدرێن، بە شێوەیەک کە بەراوردناکرێن بەو مەڵبەندانەی وا ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەخۆوەی دین. سەرەڕای ئەوە، ئەو زەوییانە کە هەر پیاوماقووڵێکی ئەوروپا خاوەنیان بوو، بە یەکترەوە نەبەسترابوون و بە تەنیشت یەکترەوە نەبوون، بەڵکوو چەند ڕووبەرێکی فراوان لێکیدادەبڕین و ئەمە جۆرێک لە بەناویەکداچوونی مەزراکانی خوڵقاندبوو. لەبەرئەوە تاکە دێیەک بە زۆری ناچاردەبوو لایەنگری چەند پیاوماقووڵێک بێ.[٢٣٧] بە پێچەوانەی مەڵبەندەکانی سەرۆکهۆزەکانەوە، کە ئاسایی یەکپارچە و لە هەمان ناحیە یا قەزادا دەبن.

[237] Henri Pirenne, Economic and Social History of Medieval Europe (New York: Harcourt, Brace, ABC, Harvest Books), 1937, p. 59.

مایەوە بڵێین، وەک چاوەڕوانیش دەکرا، ئەم چینە دەوڵەمەندەی سەرۆکهۆزانی موڵکداری زەوی بوو کە بە درێژیی چل ساڵی تەمەنی مەملەکەتی عیراق، ئەندامە هەمیشەییەکانی خۆی بە پەرلەمان بەخشی.

**خشتەی ژمارە ١٨**

**سەرۆکهۆزانی ئەندامی هەمیشەییی پەرلەمان لە ماوەی نێوان ١٩٢٤-١٩٥٨دا**

| هۆز | ئەلبومحەمەد | ئەلبومحەمەد | ئەلبومحەمەد | ئوزێرج | ئوزێرج | بەنولام | بەنولام |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەرۆکهۆز | محەمەد عریبی | مەجید خەلیفە | فالح سەیهود | شەوای فەهد یا عەبدولکەریمی کوڕی | سەلمان مونشید یا موتڵەگی کوڕی | عەلوان جەندیل | شبیب مزبان |
| کۆمەڵەی دامەزراندنی ساڵی ١٩٢٤ | × | | × | × | | × | × |
| پەرلەمانی ١٩٢٥ | | × | | | × | × | |
| پەرلەمانی ١٩٢٩ | | | | × | | × | |
| پەرلەمانی ١٩٣٧ | | | × | × | | × | |
| پەرلەمانی ١٩٤٧ | ×[٢٣٨] | × | | × | | | × |
| پەرلەمانی ١٩٥١ | × | × | | × | | | |

[٢٣٨] ئەم سەرۆکهۆزە ئەو ساڵە و ساڵی دوایی ئەندامی ئەنجومەنی پیران بوو.

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پەرلەمانی ١٩٥٤ | × | × | | | × | | |
| پەرلەمانی ١٩٥٨ | × | × | | | | | |

تێبینی: ئەمە لیستێکی هەمەلایەنە نییە، چەند خولێکی دیاریکراو لە خولەکانی پەرلەمان هەڵبژێردراون بۆ لێکۆڵینەوە.

**موڵکایەتیی زەوی لە کووت:**

بەڵگەنامەکانی لەبارەی کووتەوە لە بەردەستدان، زۆر لە هیی عەمارە کەمترن، بەڵام بەشی ئەوە دەکەن وێنەیەکی وردمان سەبارەت بە دابەشبوونی موڵکایەتییەکانی زەویی ئەو لیوایە بدەنێ.

کووت، نموونەیەکی زیندووی شێوەی گواستنەوەی موڵکایەتیی چەند رووبەرێکی پان و بەرینی زەوییەکانی دەوڵەتە بۆ ژمارەیەکی یەکجار دیاریکراوی سەرۆکهۆزەکان و هەندێ موڵکداری زەویی خەڵکی بەغدا. ١,٧٧٠٫٨٩٧ مشارە زەوی بە لەزمە و ٧٤٦,٤٧٧ مشارە بە تاپۆ بەخشران،[٢٣٩] لە کاتێکدا جۆرەکانیتری موڵکایەتی، بە چاوپۆشین لە موڵکایەتییەکانی دەوڵەت،[٢٤٠] بایەخێکی ئەوتۆیان نییە (وەک موڵک، کە گەیشتە ٨٦ مشارە و وەقفیش ٣٩٥ مشارە).

هەردوو خشتەی ژمارە ١٩ و ٢٠ دابەشبوونی موڵکایەتییەکانی زەویی وەک تاپۆ یا بە لەزمە لە سەروبەندی شۆڕشی ١٩٥٨دا ڕوووندەکەنەوە. ٢٢ کەس ٨٢٪ی کۆی زەوییەکانی تاپۆی لیواکەی هەیە. ٤٩ کەسیش خاوەنی ٧٣٪ی زەوییەکانی لەزمەیە. بە واتایەکیتر، موڵکایەتییەکانی زەوی لە کووت، لەچاو عەمارەدا، وا نین کە کەمتر لە

---

[٢٣٩] المديرية العامة لتسوية الأراضي، "دراسات عن أعمال تسوية حقوق الأراضي في العراق"، بغداد، مطبعة العاني، ١٩٥٥، ص٣٤.

[٢٤٠] ئاماری کشتوکاڵیی ساڵانی ١٩٥٢-١٩٥٣، کە بە ئامارێکی کۆن دەژمێردرێ، ڕوونیدەکاتەوە ١١٢,٩٣٦ مشارە زەویی میریی بەکرێدراو هەبووە. بڕوانە: الحكومة العراقية، تقرير عن الإحصاء الزراعي وإحصاء المواشي لعام ١٩٥٢-١٩٥٣، الجدول ٩٠، ص٦٧. ٢,٥٣٣,٤٣٩ مشارە زەویی پوختی میریش هەبووە، بەکارهێنراوە بۆ کشتوکاڵ، هەرچەندە موڵکدارانی زەوی دەستیان بۆ درێژکردووە.

چنگی کەسانێکی کەمژمارەدا کۆبووبنەوە. سەرباری ئەوە، موڵکداری زەوی بە لەزمە، بە زۆری هەر خۆیشی موڵکداری زەوییەکەیە بۆ تاپۆ.

گەورەترین موڵکدارانی زەویی بە تاپۆ و بە لەزمە، ئەمانەن:

١. لە چینی سەرۆکهۆزەکان: محەمەد حەبیبی میری ڕەبیعە و عەلی حەبیبی برای، عەبدوڵا یاسین و بەلاسم یاسینی برای، سەرۆکهۆزانی تیرەی مەییاح لە بەنیڕەبیعە؛ هەریەکە لەو سەرۆکهۆزانە زەوییەکی هەیە، ڕووبەرەکەی لە نیو ملیۆن مشارە زیاترە.

٢. لە چینی سادات: ناسر بەهییە (٥٩.٢٥٠ مشارە لە ٢٠ دێ) و حامید سەید (٦٦,٥٠٠ مشارە لە ١٦ دێ).

(٣) لە چینی سەرمایەدارانی شار (گوبانییە یا موڵکداران): عەبدولمونعیم خزێری* (٨٣,٠٠٧ مشارە لە ١٨ دێ)، خەتاب خزێری (٥٥,٢٠٠ مشارە لە ١٣ دێ)، مەحموود سوبحی دەفتەری** (٣٩,٧٠٠ مشارە لە ٨ دێ)، عەلی مومتاز دەفتەری (١٩,٧٥٠ مشارە لە ٣ دێ) و خێزانی ساڵح جەبر*** (٣٠,٧٠٠ مشارە لە ٥ دێ).

---

* خێزانی خزێری- الخضيري: دەچێتەوە سەر خێڵی شەمەر. خزێریش لە ناوی باپیریانەوە هاتووە، خزێر کوڕی بجلی کوڕی محەمەدە. شوێنی نیشتەجێبوونیان دابەشبووە بەسەر نێوان بەغدا و عەمارە و بەسرە و کووتدا، چل ساڵ لەمەوبەر لە بەغدا گیرسانەوە. پاش دامەزرانی دەوڵەتی عیراق، زۆریان لێ بووە ئەندامی پەرلەمان و ئەنجومەنی پیران. (و.ع)

** خێزانی دەفتەری: بنەماڵەیەکی بەغدایی بە ئەسڵ تورکمانە، کوڕەکانی لە پایەکانی کارگێڕیدا دامەزرێندران، گرنگترینیان یەکەم بەڕێوەبەری شارەوانیی بەغدایە لە سەردەمی عوسمانیدا، لە کاتێکدا یەکەم ئەمینی پایتەختیش لە بەغدا ساڵی ١٩٣١، لە خێزانی دەفتەرییە. (و.ع)

*** خێزانی ساڵح جەبر: ئەم خێزانە لە ناوەندی کۆمەڵایەتیدا، ناسراونەبوو، بەڵکە بنەماڵەیەکی سادەی ناسرییە بوو، دەچێتەوە سەر خێڵی بەنیزەید. پاش ئەوەی ساڵح جەبری کوڕی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانی لە ١٩٤٨دا بەدەستەوە گرت، ناسرا و ناوبانگی دەرکرد. وێدەچێ موڵکایەتییە کشتوکاڵییەکەی، پاش وەزارەت بەدەستەوەگرتنی ساڵح جەبر پەیدابووبێ. ڕەنگە پاش دووەم ژنهێنانی لە خێزانی جریان لە حلە کە لە موڵکدارە گەورەکان بوو، بووبێتە خاوەنی ئەو زەوییانە. بڕوانە: فاطمة صادق عباس السعدي، صالح جبر ودوره السياسي في العراق حتى عام ١٩٥٧، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠٨. (و.ع)

**خشتەی ١٩**

**موڵکایەتییەکانی زەویی کووت بە لەزمە لە ١٩٥٨دا[٢٤١]**

**ڕووبەری سەرجەمی زەویی بەخشراو بە لەزمە ١,٧٧٥,٨٩٧ مشارە، ١،٦١٢,١٥٣ مشارەی لەبارە بۆ کشتوکاڵ.**

| ڕووبەری موڵکایەتییەکانی زەوی | ڕووبەری سەرجەمی موڵکایەتییەکانی زەوی | ژمارەی موڵکدارانی زەوی |
|---|---|---|
| نێوان ٨٠,٠٠٠-٢٠٠,٠٠٠ مشارە | ٧١٦,٣٣٣ | ٥ |
| نێوان ٢٠,٠٠٠-٧٠,٠٠٠ مشارە | ١٩٣,٧٢٣ | ٨ |
| نێوان ١٠,٠٠١-٢٠,٠٠٠ مشارە | ٢٣٩,٨٦٧ | ١٧ |
| نێوان ٦,٠٠٠-١٠,٠٠٠ مشارە | ١٤٢,٣٤٣ | ١٩ |
| سەرجەمی ڕووبەر | ١,٢٩٢,٢٦٦ کە دەکاتە ٧٣٪ی هەموو زەوییە بەخشراوەکان بە لەزمە | ٤٩ |

**خشتەی ٢٠**

**دابەشبوونی موڵکایەتییەکانی زەویی کووت بە تاپۆ لە ١٩٥٨دا[٢٤٢]**

**سەرجەمی ڕووبەری زەوییەکانی تاپۆ: ٧٤٦,٤٧٧ مشارە، لەوە ٦١٨,٩٧٣ی لەبارە بۆ کشتوکاڵ**

| ڕووبەری موڵکایەتییەکانی زەوی | سەرجەمی ڕووبەری موڵکایەتییەکانی زەوی | ژمارەی موڵکدارانی زەوی |
|---|---|---|
| نێوان ٢٠,٠٠٠-٧٠,٠٠٠ مشارە | ٤٧٩,٨٠٠ | ١١ |
| نێوان ١٠,٠٠١-٢٠,٠٠٠ مشارە | ١١٤,٩٠٠ | ٧ |
| نێوان ٣,٠٠٠-١٠,٠٠٠ مشارە | ٢٢,٤٤٥ | ٤ |
| سەرجەمی ڕووبەر | ٦١٧١٤٥ کە دەکاتە ٨٢٪ی هەموو زەوییە بەخشراوەکان بە تاپۆ | ٢٢ |

---

[٢٤١] سەرچاوە: پەیامێکی بڵاونەکراوەی ژمارە ١١٠١ی ڕۆژی ١٩٥٨/١/٢٢ی بەڕێوەبەری گشتیی بەڕێوەبەرایەتیی یەکلاکردنەوەی زەویوزار، سەید مەکی جەمیل، بۆ وەزیری داد.

[٢٤٢] هەمان سەرچاوە.

**خشتەی ٢١**

**مولکایەتییەکانی زەویی سەرۆکهۆزانی بەنیڕەبیعە**

**لە هەردوو قەزای کووت و حەیی سەر بە لیوای کووت لە ١٩١٧دا[٢٤٣]**

| تیرە | شوێنی مەڵبەند | سەرۆکهۆز | مەڵبەند |
|---|---|---|---|
| ئیمارە | لە چەمی غەڕافەوە بەرەوژوور شانبەشانی بەری دەستەڕاستی ڕووباری دیجلە | حاجی فەرحان | یووسفییە، مەحرەم، ئومبانی |
| ئیمارە | بە هەمان شێوە | عەلی حەبیب | جراح، مزاک، دوبیە |
| ئیمارە | بە هەمان شێوە | محەمەد ئەمیر (سەرگەورەی سەرۆکهۆزەکان) | حوسەینییە، حەمیدییە، شریمات، جەزیرە، ئەبوزەفر، ئەبوحەماڕ، حەد |
| ئیمارە | لە کووتەوە بەرەوژوور لەسەر بەری دەستەچەپی ڕووباری دیجلە | شەمان و محەمەد کوڕانی شەمران | ئومبولەیل، دەهرە |
| ئیمارە | بە هەمان شێوە | سەللومی و هەرسێ براکەی کوڕانی محەمەد کوڕی حموود | چەمی زامن (ضامن) |
| ئیمارە | بە هەمان شێوە | موتەڕ کوڕی نامووس، ڕەشید کوڕی ناسیف | جەببال، بەتتار |
| ئیمارە | بە هەمان شێوە | نەفل و برای کوڕانی نامووس | شریماتی کووت |
| ئیمارە | بە هەمان شێوە | وادی محەمەد حەبیب | بزرکییە (زەویی تاپۆی فەهدپاشا) |

---

[٢٤٣] المكتب العربي، فرع البصرة، قبائل نهر دجلة، ص١٤، ١٧-١٩.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئیماره | بە هەمان شێوە | زکاح کوڕی فەیسەڵ | ئومجریان (تاپۆی کوڕانی فەهدپاشا) |
| ئیماره | بە هەمان شێوە | دەواح کوڕی سخام | توێسات (تاپۆی کواجب(؟) نعووم سەرکیس) |
| مەبیاح | لەسەر غەڕاف | محەمەد یاسین | عۆدە (تاپۆی عەبدولکەریم کوڕی فالحپاشا، سولەیمانییە، جەمیلییە (تاپۆی محەمەد یاسین و عەبدولعالی کوڕی سولەیمان مەنسوورپاشا) |
| مەبیاح | بە هەمان شێوە | باشئاغا | بەشی چێندراوی مەڵبەندی سولەیمانییە |
| مەگاسیس | لە بەری دەستەڕاستی ڕووباری دیجلە لە کووتەوە بۆ باشوور | جەدووع کوڕی سولەیسە | نیوەی ئومحەلانە |
| مەگاسیس | بە هەمان شێوە | ناسر کوڕی عیسا | چارەکێکی ئومحەلانە |
| مەگاسیس | بە هەمان شێوە | زەمزیر کوڕی سەلمان | چارەکێکی ئومحەلانە |
| مەگاسیس | بە هەمان شێوە | ئیبراهیم کوڕی عەزیز | موڵکایەتییەکی هاوبەشی عاسی و ساڵح و خەیزەران و سابیس |
| مەگاسیس | بە هەمان شێوە | گومەڕ کوڕی عەزیز | بە هەمان شێوە |
| مەگاسیس | بە هەمان شێوە | عەباس کوڕی عەزیز | بە هەمان شێوە |
| سەڕاج | لە گۆشەی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە و غەڕاف | گساب کوڕی عەتار | حومەیدییە و بوجەیعییە و تۆیسات (هەمان ئەوانەی لای سەرەوە نییە) |

| | | | |
|---|---|---|---|
| سەڕاج | لەسەر غەڕاف | موهەلهەلی کوڕی حەلان | نەهر کوڕی جەسام |

موڵکایەتییەکانی زەویی کووت، زیاتر لە هەر لیوایەکیتر، کاری هاوبەشی نێوان سەرۆکهۆزان و موڵکدارانی زەویی بەغدایی، کە ڕژێمی پاشایەتی بەتایبەت لە ساڵانی دواییدا تا ڕادەیەکی زۆر پشتی پێبەست، نیشاندەدەن. قەڵای موڵکایەتییەکانی زەویی موڵکدارانی بەغداییش، قەزای سوێرەی باکووری کووتە، لە کاتێکدا سەرۆکانی هۆزی بەنیڕەبیعە بە تیرە جیاجیاکانیانەوە دەستیان بەسەر موڵکایەتیی زەویی تەواوی باشووری کووت و حەیدا گرتووە و جووتیارە بچووکەکانیش بوونەتە خاوەنی ڕووبەری ١٤٣,٠٨٠ مشارە لە پرۆژەی دوجێلە کە ساڵی ١٩٤٥ کرایەوە.

تەماشاکردنێکی دابەشبوونی موڵکایەتییەکانی ئەم زەوییانە لەو قەزایانەدا ساڵی ١٩١٧، کە ٢٦ سەرۆکهۆزی موڵکداری زەوییان هەبوو (بڕوانە: خشتەی ژمارە ٢١)، دەریدەخا کە دابەشبوونی ئێستەی ئەم موڵکایەتییانە، هەر درێژکراوەی بارودۆخەکەی پێشووە، ئەوە نەبێ کە زیاتر پەلیان بۆ زەوییە بەیارەکانی دەوڵەت کێشاوە؛ لەو ڕێگەیەوە کە هەم ئاوهەڵکێشیان داناوە و هەم دەوڵەت ددانی بەم پەلکێشییەیاندا ناوە.[٢٤٤]

[٢٤٤] بۆ نموونە، عەبدوڵا یاسین لە مایسی ١٩٣٠دا هەر ٤٠,٠٠٠ مشارەی هەبوو (ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی مانگی مایسی ١٩٣٠ سەبارەت بە کووت، لاپەڕە ٤). لە ١٩٣٨یشدا، موڵکایەتییەکەی لە زەوییەکانی لیوادا گەیشتە ١٧٤,٢٣٠ مشارە. ئەمە جگە لەو زەوییانە کە بە تاپۆ هەیبوون و لەو زەوییە تەواوە میرییانەیش کە چووە سەریان و دەستی بەسەردا گرتن.

## باسی هەشتەم

# ناوەرۆکی سیستەمی زەویوزار و بەردەوامیی پێگەی سەرۆکهۆز لە کۆمەڵدا

**کۆچە گەورەکانی جووتیاران:**

دوو خەسڵەتی ناکۆک مێژووی عیراقیان لە سی ساڵی دواییدا[245] پێ جوێکراوەتەوە: لە لایەکەوە زۆریی زەویی لەبار بۆ کشتوکاڵ،[246] بەبێ ئەوەی جووتیار هەبن ڕەنێوی‌بێنن؛ لە لایەکیترەوە، ژمارەیەکی زۆری جووتیار دێهاتیان بەجێهێشتووە. لێرەدا نامانەوێ بڵێین ئەمە لەبەرئەوەیە کە سیستەمی سەرۆکهۆزان بە شێوەیەکی بنچینەیی بەردەوامە و لەئارادایە، چونکە گەشەکردنی شارەکان لە چەند کۆمەڵێکیتردا ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی ناوچە دێهاتییەکانی بەرەو خۆی ڕاکێشاوە.* ئێمە ڕاستییەکی بە زۆری لەبیرکراو دەزانین، ئەویش ئەوەیە کە: جووتیاران بەگشتی نایانەوێ بارودۆخی کۆمەڵایەتی و پیشەییان لە بناغەوە بگۆڕن. بەڵام پێوەندیی نێوان جووتیاری عیراقی و زەوی، بەهۆی ڕەگوڕیشە نوێیەکەیەوە وەک دەشتەکییەکی گەڕۆک، بەتایبەت لە ناوچەکانی بە ئاوی سەرزەوی ئاودراوی باشوور، پێوەندییەکی پتەو و هەمیشەیی نەبووە. لافاوی بەردەوام و وشکەساڵیش لەئارادابوون، کە بوونەتە هۆی ناسەقامگیریی کشتوکاڵ. وشککردنی هەندێ لقی

---

[245] واتە سالانی سی و چل و پەنجای سەدەیێ بیستەم.

[246] پشت بە ژمارەکانی بەڕێوەبەرایەتیی یەکلاکردنەوەی زەویی کشتوکاڵی لە ١٩٥٤دا، ٤٩,١٧٠,٧٢٩ مشارە زەویی لەبار بۆ کشتوکاڵ هەبووە، نیوەی بەکارنەهێنراوە. براونە: المديرية العامة لتسوية الأراضي، دراسات عن أعمال تسويات حقوق الأراضي في العراق، ص٣٤.

* تالاوچێشتنی جووتیارانی دێهات بەدەست دەرەبەگ و سەرۆکخێڵانی موڵکدارەوە، هۆی سەرەکیی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆریان بووە بۆ بەغدا و بەسرە و کەرکووک. بەڵام تاکە هۆیش نەبووە، چونکە کۆچکردن تەنانەت پاش بڕیاردان لە قانوونی چاککردنی ساڵی ١٩٥٨ی کشتوکاڵیش، هەر بەردەوام بووە. شارەکان لای خەڵکی دێهات، هەمیشە مایەی لەخشتەبردن و ڕاکێشان بوون، لە کاتێکدا زەویی کشتوکاڵی لە یادەوەریی عیراقیدا، هەر داماوی و نەداری و ماندوویی و تالاو و ژان دەگەیێنێ. (و.ع)

ڕووبار و جۆگەکان، نەخشی لەوەدا هەبووە. بەڵام ئەگەر ئەم هۆکارانە بە تەواوی لەبەرچاوبگرین، سەرباری هۆکارەکانیتر، ناتوانین لێکدانەوەیەک بدۆزینەوە بۆ زانینی خێرایی و قەوارەی پەرەسەندن لە عیراق، بەتایبەت کاتێک زەوی بەرفراوانبووبوو و هێزی کاریش کەم، جگە لەو ڕاستییە کە پێوەندییە باوەکانی بەرهەمهێنانی زەوی و هەلومەرجی باڵادەستی کۆمەڵایەتی و ئابووری کشتوکاڵیان هەژارخستووە و وایان لێکردووە بەشی گوزەرانی ژیانێکی شەرەفمەندانەی جووتیار نەکا.

بەپێی ئامارە تەواونەکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ئامار،[٢٤٧] ژمارەی ئەو کەسانەی کە ساڵی ١٩٤٧ لە بەغدا دەژیان و لە دەرەوەی هاتبوونە دنیاوە، دەگەیشتە ١٧٣,٣٢١ کەس و ٢٢٪ی دانیشتووانی لیواکەیان پێکدەهێنا. لە کاتێکدا ئامار و ڕێژە سەدییەکان لە لیوای بەسرە، ٥٩,٠٠٨ کەس و ١٩.٦٪ بوون. ئەمە جگە لە باسکردنی کۆچکردن بۆ کوێت و زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووانی شارەکانی ناوەندی لیواکان؛ هەموو ئەمانەیش لەسەر حیسابی گوندەکان! ناوەندی سەرەکیی ئەم جموجووڵانەی دانیشتووان، لیوای عەمارە بوو، کە نزیکەی ١٠١,٢٤٢ کەسی دانیشتووانی لەدەست دا، واتە ٢٥.٥٪ی کۆی دانیشتووانی لیواکە.* ئەم کۆچانە بە شێوەیەکی بەرچاو کاریانکردە سەر لیوای کووتیش، چونکە ٢٧,٧٨٠ کەسی دانیشتووانی خۆی لەدەست دا، واتە ڕێژەی ١٢,٤ی کۆی دانیشتووانی لیوا. ئەم کۆچانە لە ساڵانی نێوان ١٩٤٧-١٩٥٧دا تاویانسەند. شارەزایەکی نێودەوڵەتی کە لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ئامار کاریکردووە، پشتبەستوو بە ئەنجامە سەرەتاییەکانی سەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧، مەزەندەیکردووە کە نزیکەی ٣٣٠,٠٠٠ کەس لە دێهاتەکان گواستوویەتەوە بۆ

---

[٢٤٧] ئەم ژمارانە لە ڕێی دکتۆر فوئاد مووسا، بەڕێوەبەری گشتیی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ئامارەوە لە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی، پەیداکراون.

* لیوای عەمارە یەکەم ناوەندی کۆچی بەرەو بەغدا و بەسرەی پێکهێنا. حەننا بەتاتۆ باسیکردووە کە چارەکێکی ژمارەی پارێزگاکە بەجێیهێشتووە و کۆچیکردووە. هۆی سەرەکی ئەوەیە کە مەرەزەکردن لە عەمارە ئەرکێکی دووئەوەندە و هەڵپێچانێکی زیاتری وەرزێر و جووتیارانی لە لایەن سەرۆکهۆزان و موڵکدارانەوە پێدەوێن. (و.ع)

ناوەندی شارەکان و قەزا و ناحیەکانی هەر چواردە لیواکەی عیراق[٢٤٨] و ١٥٩,٠٠٠ هەر ڕوویکردووەتە بەغدا و ٤٣,٠٠٠یش شاری بەسرە.

خشتەی ژمارە ٢٢ ڕوونیدەکاتەوە چۆن ئەم کۆچانە کاریانکردە سەر ناوچە دێهاتییەکانی لیوا عەرەبییە جیاجیاکان.[٢٤٩]

خشتەی ژمارە ٢٢
کۆچ لە ناوچە دێهاتییەکانی لیواکانی عیراق و
بە پێچەوانەیشەوە (١٩٤٧-١٩٥٧)

| لیوا | دانیشتووانی ساڵی ١٩٤٧، بەبێ شاری ناوەندی لیوا | کۆچ لە ١٩٤٧-١٩٥٧ بۆ دێهاتی لیوا و بە پێچەوانەوە (جگە لە شاری ناوەندی لیوا) | ڕێژەی سەدیی زیاد و کەم کردنی دانیشتووان |
|---|---|---|---|
| عەمارە | ٢٥٨,٩١١ | ٩٣,٧٢٦- | ٣٦.٢٪- |
| کووت | ٢٠٨,٧٠١ | ٣٤,٦٤٤- | ١٦,٦٪- |
| مونتەفیق | ٣١٧,٨٢٩ | ٣٧,٥٠٤- | ١١,٨٪- |
| حللە | ٢٢٤,٦٢٩ | ٢١,٣٤٠- | ٩,٥٪- |
| دیوانییە | ٢٤٨,٢٤٠ | ٢٣,٣٣٢- | ٦,٧٪- |
| دلێم | ١٥٨,٠٦٤ | ٩,٣٢٦- | ٥,٩٪- |
| کەربەلا | ١٠٥,١١٤ | ٦,٦٢٢+ | ٦,٣٪+ |
| بەسرە | ٢٦٧,٣٦٤ | ٤٣,٥٦٤- | ١٦,٣٪- |
| بەغدا | ٢٩٦,٦٠٥ | ٩٧,٨٨٠+ | ٣٢,٠٪+ |

عەمارە، جارێکیتر زۆرترین ڕێژەی لەدەستدانی دانیشتووانی هەبوو، واتە نزیکەی ٣٦٪ی دانیشتووانی دێهاتی خۆی. بەگشتی، ئەو لیوایانە کە موڵکایەتیی زەوییان تێدا لە چنگی کەمینەیەکی کەمژمارەدا چڕبووەتەوە، گیرۆدەی زۆرترین ڕێژەی کۆچی لە

[٢٤٨] کورتەی ڕاپۆرتی ئەو شارەزا نێودەوڵەتییە لەم سەرچاوەیەدا دەبینی: عبدالرزاق الهلالي، الهجرة من الريف الى المدينة، بغداد، مطبعة النجاح، ١٩٥٨، ص‌ص١٦١-١٧٢.

[٢٤٩] کۆچی گەورەیش لە ناوچە دێهاتییەکانی لیوا کوردییەکاندا، بەتایبەت لە سلێمانی، هەبووە.

دێهاتەوە بوون.* بەڵام چەندین هۆکاریتر نەخشیان هەبوو لە بەرەو شار داکشانی دانیشتووانی دێهاتی لیوای بەسرەدا، کە وردە موڵکداری زەویی تێدا بڵاوبووبوونەوە و دۆخی جووتیاری لە هیی لیواکانیتری عیراق باشترنەبوو.

ئەو هەوڵە کە ساڵی ١٩٣٣ درا بۆ بەستنەوەی جووتیار بە زەوییەکەیەوە، پەردەی هەڵماڵی لە ڕووی ترسناکیی کێشەی کۆچکردنی جووتیاران و زەویچۆڵکردنیان، کە لە سەرەتاکانی ئەو ساڵەوە دەستی پێکرد. ماددەکانی ١٤، ١٥ و ١٦ی قانوونی ماف و ئەرکەکانی وەرزێران، وای بڕییەوە کە جووتیار یا سەرکار مافی نییە مەڵبەند یا مەزراکەی بەجێبێڵێ، ئەگەر دەستبەجێ هەموو قەرزە کشتوکاڵییەکانی نەداتەوە بە خاوەنزەوی و هیچ خاوەنزەوی یا ئیدارەخانەیەکی حکوومی یا شارەوانی یان کۆمپانیایەکی تۆمارکراویش بۆی نییە کاریپێبکا، ئەگەر خاوەنی ئەو زەوییە کە کاری تێدا کردووە، بەڵگەیەکی نەداتێ و پشتگیریینەکا کە پێویستی پێی نییە، یا هیچ قەرزێکی لا نەماوە. ئەگەر ئەو ڕاستییەمان ڕەچاوکرد کە تەنیا ژمارەیەکی کەمی جووتیار لە عیراق قەرزداری خاوەنی ئەو زەوییە نەبوو کە کاری تێدا کردووە، دەتوانین پەی بە ناوەڕۆکی ئەم قانوونە ببەین.[٢٥٠] کۆیلایەتیی ڕاستەقینەی جووتیار هەر ئەو بەڵێنە بوو کە قانوونی ژمارە ٢٨ی ساڵی ١٩٣٣ دای. بەڵام خۆشبەختانە عیراق وا ڕانەهاتبوو بە دڵسۆزی قانوونەکانی خۆی جێبەجێبکا و

---

* لەبەرئەوەی چڕبوونەوەی موڵکایەتی لە عەمارە و کووت و مونتەفیک دەرکەوتووە، کۆچکردن لەم لیوایانەوە لەوانیتر زیاتربووە. هەروەها ئەم ناوچەیە سەرەتاکانی دامەزرانی تەرزی دەربەگایەتیی لە عیراقدا بەخۆوە دیوە، پاش بڕیارەکانی مەدحەتپاشا و دەستبەسەرداگیرانی زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییە بەپیت و نزیکەکانی ڕووبار لە مونتەفیک و عەمارە و کووت و بەسرە لە لایەن بنەماڵەی سەعدوونەوە. زۆربەی کۆچەران لە عەمارەوە چوونە بەغدا و لێی نیشتەجێبوون، لە کاتێکدا زۆربەی کۆچەرانی مونتەفیک ڕوویانکردە کوێت و لەوێ گیرسانەوە و توێژی بەدۆنیان پێکهێنا. (و.ع)

[٢٥٠] لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٣١ی بریتانیادا بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان، گوتراوە: ژمارەیەکی کەمی جووتیار هەن قەرزیان لەسەر نەبووبێ. بنەڕەتی قەرزداری لەو ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرێ کە کاتێک جووتیار بۆ یەکەمجار لە زەویدا کاری پێدەکرێ، پێویستی بە شتێکە پێی بژێ، تا وەرزی کۆکردنەوەی بەروبووم دەستپێدەکا. کە بەروبوومەکە دابەشدەکرێ، دەبێ ئەوەی کە وەریگرتووە، بیداتەوە. بەڵام جاروبار ناتوانێ ئەوە بکا، لەبەر یا خراپبوونی بەروبوومەکە، یان جاروبار دانەوەکەی بە ڕەزامەندیی جووتیار دوادەخرێ. بڕوانە: بریتانیای مەزن، وەزارەتی موستەعمەرەکان، ڕاپۆرتی تایبەت بە پەرەگرتنی عیراق لە ماوەی نێوان ١٩٢٠-١٩٣١دا، ل.٢٤٠.

هەر قانوونێکیش هەڵکەوتی کۆمەڵایەتی ڕەتیبکاتەوە، تا مەودایەکی دوور بەجێناهێنرێ. لەبەرئەوە کۆچکردن لە دێهاتەوە بە خێرایی بەردەوامبوو، تا گەیشتە ئاستێک کە مایەی نیگەرانییەکی زیاتر بێ.

**هەندێ شوێنەواری کۆچی جووتیاران:**

دەکرێ بە ئاسانی بزانین کۆچی خێرای سەدان هەزار مرۆڤ، چ کارێکی کردووەتە سەر حاڵوباری دێهات لە عیراق، چونکە شیرازەی ئابووریی تێک دا و هێزی لەبەر دێهات بڕی و بەغدای خستە ژێر باری قورسی دانیشتووان و کۆمەڵێک گیروگرفت. لە تێبینییەکی پێشوودا نیشانمان دا کە عەمارە دەورێکی یەکلاکەرەوەی لە مێژووی نوێی عیراقدا گێڕا. دەبێ ئێستە بنچینەی ئەم تێبینییە ڕوون و ئاشکرا بێ، چونکە ئەو پەرەسانە کە پێشتر باسمانکردن، پشکی عەمارەیان تێدا زۆر گەورە بوو. پرۆسەیێک لەئارادابوو، دەتوانین ناوی عەماراندن (عمرنة)ی بەغدا و بە ڕادەیێکی کەمتریش بەسرەی لێبنێین. ئەم پرۆسەیە کاریکردە سەر هەموو لایەنەکانی ژیان لە پایتەختدا. عەمارە، سەرەتا، بەشێکی ڕواڵەتەکانی دێهاتی خۆی گواستەوە بۆ بەغدا.*

ساڵی ١٩٥٦ نزیکەی ١٦,٤١٣ زنج هەبوو، بەسەر نۆ ناوچەی گەورەی بەغدادا دابەشبووبوو و ٩٢,١٧٣ کەسیان تێدابوو، واتە تێکڕا ٥,٦ کەس لە هەر زنجێکدا،

---

* بەغدا، دوچاری دوو قۆناغی کۆچی گەورە بوو: یەکەم- لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە چەند گەڕەکێکی تایبەت دامەزران بە ناوی خێڵات یا ئەو شارانەوە کە ڕۆڵەکانیان لێیەوە هاتنە بەغدا، وەک تەکارتە (تکریتییەکان) و دوورییەکان و ئەنبارییەکان. وا باسکراوە کە هۆیەکەی بڵاوبوونەوەی چاوەقووڵە (تاعوون) بووە لە بەغدا، کە زۆربەی دانیشتووانی شارەکەی لەناوبردووە. دووەم- لە سەدەی بیستەمدا بوو و بە چوار قۆناغدا تێپەڕی: یەکەم- لە یەکەم جەنگی جیهانییەوە تا دووەم جەنگی جیهانی کە کۆچی تێدا سادە و کەم بوو. دووەم- لە کۆتایی دووەم جەنگی جیهانییەوە دەستی پێکرد تا لافاوهەستانی ساڵی ١٩٥٤ کە کۆچی تێدا زیاتربوو. قۆناغی سێیەم- کە گەورەترینیانە، لە نێوان ساڵانی ١٩٥٤-١٩٥٨دا بوو، کۆچی بە شێوەیەکی بەرفراوان تێدا دەرکەوتەوە، لەبەر زیانەکانی لافاو و دامەزراندنی ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە (مجلس الإعمار) و زیادبوونی دەرامەتی نەوت، کە هەلی زیاتری کاریان لە شارەکاندا ڕەخساند. چوارەم- پاش شۆڕشی ١٩٥٨ بەردەوامبوو، لە ئەنجامی بێهێزبوونی سەرۆکهۆزان و دەرەبەگەکاندا و هەڵگەڕانەوەی جووتیارانیش لێیان. بڕوانە: ریاض ابراهیم السعدي، الهجرة الداخلية للسكان في العراق ١٩٤٧-١٩٦٠، دار العراق للنشر، بغداد، ١٩٧٦. (و.ع)

که بریتی بوو له هۆدەیێک.[٢٥١] ئەمە تەنیا یەکبەشی کۆچەران بوو، لە کاتێکدا ئەوانیتر خۆیان لە ناوچە قەرەباڵغەکانی شاردا قەتیسکردبوو، یا لە جۆرە خانوویەکیتری قوڕیندا دانیشتبوون. دکتۆر گریچیلی لە کۆلیجی نۆشداریی بەغدا لە ١٩٥٢دا، کەوتە بەسەرکردنەوەی مەیدانیی کۆمەڵێک لەم زنجانەی پایتەخت کە لافاوە کارەساتبارەکەی ١٩٥٤ ڕایماڵیبوون. ئەو زەوییە کە ئەم زنجانەی لەسەر بوون، بریتیبوو لە زبڵخانە، شارەوانیی بەغدا و خەڵک بەکاریاندەهێنا بۆ تێدا فڕێدانی خۆڵوخاشاک و پاشەڕۆکی مرۆڤ و ئاژاڵ. ئاوەڕۆی ئاوی سەرزەویش، پیسوپۆخڵیی خۆی دەخستە ئەم خاکە و ئاوە پیسەکە بە نێوان زنجەکاندا دەڕۆی. بەگشتی، ئەو دانیشتووانەی عەمارە، نەیاندەتوانی زنجەکانیان لەم زبڵخانەیە بەدەر لە شوێنێکیتر دابنێن، چونکە ئەگەر لە شوێنێکیتر دایانبنایە، دەبوو کرێی شوێنەکە بدەن و ئەوەیشیان پێ هەڵنەدەسووڕا. دکتۆر گریچیلی زنجی وا وەسفکردووە: کۆختەیەکی یەکژووریی بە حەسیر و قوڕ سەرگیراوە، هەواگۆڕکێیەکی خراپی هەیە و ئەوپەڕی قەرەباڵغە، هیچ تایبەتمەندییەکی نییە و بە زۆری ئاژاڵەکانیان و ئەندامانی خێزانی پێکەوە گرتووەتە خۆی. هیچ ڕێوشوێنێکی لەشساغی لە زنج یا ناوچەکەدا نییە، لەبەرئەوە دانیشتووان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی پیسایی دەکەن. سەرچاوەیەکی ئاوی سازگاری خواردنەوەیش نییە، دەبوو لە دەوروبەری ناوچەکەیان ئاوبهێنن و لە دەفرێکدا عەمباریبکەن، پێیدەڵێن گۆزە.[٢٥٢] ناوماڵی ئاساییان سندووقێکی تەختە و کەمێک قاپوقاچاخ و تەختێکی نوستنە، هەموو نوێن و ڕاخەرێکی خێزانی لەسەر کەڵەکەدەکرێن، ئەندامانی خێزانیش لەسەر ئەرز دەخەون. هەموو پارووپەک کە ئەو خەڵکە دەیخۆن، پیسبووە و تێکڕای مردنی منداڵ لە هەموو ١٠٠٠ حاڵەتێکی دووگیانیدا ٣٤١ە.[٢٥٣] ئاشکرایە ئەم هەلومەرجەی گوزەران، نەک هەر بۆ تەندروستیی دانیشتووانی زنجەکان خۆیان، بەڵکوو بۆ تەندروستیی هەموو دانیشتووانی بەغدایش مەترسییە.

---

[٢٥١] الحكومة العراقية، وزارة الإقتصاد، المجلس الأعلى للإحصاء، تقرير عن إحصاء المساكن في بغداد لعام ١٩٥٦، ص١٠، ١٥.

[٢٥٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.

[٢٥٣] سەرچاوەی پێشوو، خشتەی ٤، پاش ل٧٨.

حکوومەت هیچ ڕێوشوێنێکی بەرچاوی بۆ کەمکردنەوەی ئێش‌وئازاری دانیشتووانی زنجەکان،* یا چارەسەری گیروگرفتەکانیان، دانەناوە. دوادواکانی کانوونی یەکەمی ١٩٥٧، تاکە شتێک کە موتەسەڕیفی بەغدا توانیی بیکا، دەرکردنی بەیاننامەیەک بوو، لەوبارەوە کە «خۆی شێلگیرانە کار بۆ چارەسەری ئەم گیروگرفتانە دەکا» و «کێشەکەی لە بریتانیا و دەوڵەتانی‌تری ئەورووپایی خوێندووە.»[٢٥٤] وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی، شوباتی ١٩٥٨ لەبەردەم لیژنەی دارایی لە ئەنجومەنی پیران‌دا، ڕایگەیاند: حکوومەت باشترین چارەسەری بۆ گیروگرفتەکە دۆزیوەتەوە، کە بریتییە لە دابەشکردنی زنجەکان بۆ سێ پۆل:

یەکەم- ئەو خێزانانەی کە ئەندامێکیان سەربازە،

دووەم- ئەو خێزانانەی کە ئەندامێکیان پۆلیسە،

سێیەم- خێزانەکانی‌تر.

هەردوو پۆلی هەوەڵ خزمەتی حکوومەت دەکەن و دواجار دەبنە خاوەنیماڵی تایبەتی خۆیان. بەڵام خێزانەکانی‌تر، بەپێی ڕێوشوێن و قانوونەکانی تەندروستیی گشتی، لە شار دووردەخرێنەوە.[٢٥٥]

ئەم هەڵاواردنە، خاڵێکی‌تر سەبارەت بە جموجووڵی کۆچکردن لە عەمارەوە دەخاتەڕوو. ئەمە هەمیشە مەسەلەیەکی مایەی سەرسووڕمان بووە! لە وڵاتێکدا کە حکوومەت و گەل زۆر لە یەکتر دابڕاون، چۆن حوکمدار -وێڕای ئەوە- دەتوانێ لە سەروەختی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان‌دا، وەک لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ و تشرینی دووەمی ١٩٥٢دا ڕووی دا، فەرمان بە پۆلیس و هێزە چەکدارەکانی‌تر بدا تەقە لە دانیشتووان بکەن و ئەوانیش گوێڕایەڵی بن؟! ئایا پۆلیس خۆی بەشێکی ئەم گەلە و هاوبەشی ئێش‌وئازار و نارەزایەتییەکەی نەبووە؟ لەوانەیە لێرەدا نەتوانین خەسڵەتی قبووڵنەکراویی حوکم بە شێوەیەکی هەمەلایەنە لێکبدەینەوە و نایشمانەوێ بەدوای چەندین هۆی شاراوەی ئەم مەسەلەیەدا بچین.

---

* زنج: کۆختە، خانووی نیشتەجێبوونە لە قامیش دروستکراوە، بە شێوەی لاکێشەیە، درێژیی ٥-٦ مەتر و سەری بە چروپڕی بە قامیش گیراوە، پێی دەگوترێ خێزەرە. حەسیری قامیشی -لایەنی کەم- بە دووچین لەسەر دادەنرێ، تا باران دانەدا. (و.ع)

[٢٥٤] ڕۆژنامەی عیراقیی "الزمان"، ژمارەی ڕۆژی ١٩٥٧/١٢/٣٠.

[٢٥٥] الزمان، ٢٠ شباط ١٩٥٨؛ هەروەها بڕوانە: ژمارەی ڕۆژی ١٩٥٨/٢/١٤.

ئێمە لەم لایەنەوە تەنیا بایەخ بە نەخشی پیاوانی خێڵەکانی عەمارە لەم دیاردە مێژووییەدا دەدەین. بەغدا تا ڕادەیەکی زۆر هێزەکانی پۆلیسی، وەک لە گەلێک کاروباری‌تریش‌دا، کران بە عەمارەیی و ئەمە مۆرکێکی هەڵواردەی پێ‌بەخشی، تا لە قۆناغێکی دوایی ژیانی ڕژێمی پاشایەتیی عیراق‌دا، بووە ئامرازێکی نەریتیی سەرکوتکردن. هیچ جۆرە هاوسۆزییەک لە نێوان پیاوانی خێڵەکان و پیاوانی شاردا نییە، هۆیەکەیشی ئەوەیە کە ئەم دوو تاقمە پێشتر هیچ بەسەریەکەوەبوون و تێکەڵییەکی لە نێوان‌دا نەبووە. ئەو تاقە شارییە کە پیاوی ئاسایی خێڵ دەیناسێ، بازرگان یا سوودخۆرە و هەردووکیشیان نموونەیەکی باڵای ژیانی شارنشینی نین.*
لەبەرئەوە ئەو سیفەتە کە دراوەتەپاڵ پیاوی شاری، هەر قۆڵبڕین و فێڵ و گزی بووە. کاتێک پیاوی خێڵ، لەبەر تەنگپێ‌هەڵچنینی پەیتاپەیتای سەرۆک‌هۆزەکان، ناچاربوو بگوازێتەوە بۆ شار، لە شوێنی تازەی کارەکەی بەدەر، زۆر تێکەڵی دانیشتووانەکەی نەبوو. لەوە بترازێ و لەبەر تین‌وتاوی هەل‌ومەرجەکە، خۆی لە زنجەکەی‌دا، لە چەند ناوچەیەکی دابڕاوی ناو شاردا، تەریک‌کرد؛ ئیتر بووە خاوەنی میوانخانە و چایخانە و کۆڕ و کۆبوونەوەی کۆمەڵایەتیی خۆی. چینی کرێکاری شاریش پێشوازیی لێ‌نەکرد، چونکە پێی وابوو نەیاریەتی و ململانێی لەگەڵ دەکا لەسەر ئەو پاروە نانە کە بە کەمە تەندروستیی جەستە بێ‌داروبارەکەی پەیدای‌دەکا.[٢٥٦] مەسەلەکە شتێکی لەناکاو نییە، ئەگەر بزانین حکوومەتی پاشایەتی لە ساڵانی چل و پەنجادا کەوتە ناو گێژاوی قەیرانێک، پاش ئەوەی بەرەوبەڕووی دژایەتییەکی تاوسەندووی دانیشتووانی شار بووەوە، ئیتر دەیویست ئەم مەودا کۆمەڵایەتییە کە پیاوانی شاری لە پیاوانی خێڵەکان دادەبڕی، بۆ بەرژەوەندی خۆی

* حەننا بەتاتۆ دەیەوێ ڕوونی‌بکاتەوە کە ئەو کۆچەرانەی ناو بەغدا هاوسۆزییان لەگەڵ شوێنکەوتەکانی جووڵانەوەی نیشتیمانی و شۆڕشگێڕیی دژ بە حوکمی پاشایەتی لا پەیدانەبوو، چونکە تێڕاونینێکی خراپی کۆنیان دژ بە شار هەبوو، لە یادەوەرییان‌دا تێکەڵ بە لێکێشانەوە و دزی و سوودخۆری و سووکایەتی‌پێکردن و .. بوو؛ ئەگەرچی شوێنکەوتەکانی جووڵانەوەی نیشتیمانی، دوایین ئامانجیان ئارەزووی چاککردنی حاڵ‌وباری کۆچەران بوو. (و.ع)

[٢٥٦] خاوەن‌کارانی بیانی و عیراقی سکاڵا لە لێنەوەشاوەیی کرێکاری عیراقی دەکەن. ئەمە لەچاو کرێکارانی باش فێرکراو و کرێی زیاتر وەرگری وڵاتانی‌تردا ڕاستە، بەڵام ئەو ڕەنجە کە کرێکاری عیراقی لە کارەکەی‌دا دەیدا، زیاترە لەو هێزە کە لە خۆراکە سادە و بەزۆری پیسەکەی بەدەستی‌دێنێ.

بەکاربێنێ و ژمارەیەکی گونجاوی کۆچەرانی عەمارەیش بخاتە ناو هێزەکانی پۆلیس و سوپاکەی خۆی.

ئەو چەندین مانگە کە بۆ ئەم توێژینەوەیە لە کتێبخانەی ئاسایشی بەغدا بەسەرمبردن، دەرفەتم بۆ هەڵکەوت چاوم بە ژمارەیەک پۆلیسی خەڵکی عەمارە بکەوێ، ئەرکیان پاسەوانی بوو. پاش چەند مانگێک لە یەکترناسین، بە وریایی و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەو مەسەلەیەم لا کردنەوە: کە ئاخۆ حکوومەت چۆن دەتوانێ بەشێکی گەل دژی بەشێکیتر بەکاربێنێ؟ لێرە وەڵامی یەکێکیان دێنمەوە، چونکە بە جۆرێکی ڕاستگۆیانە وەڵامی ئەوانیتر دەنوێنێ، گوتی: «مامەکەم،[257] دەبێ بژین.. چەند مانگێک لەمەوبەر، پیاوێک نزیک بە زنجەکەمان دراوسێکەیی کوشت، چونکە دوو سەلک تەماتەی لە کۆختەکەی دزی. مامە گیان، حەزدەکەم پێت بڵێم.. کێ نان و بەرگی خۆداپۆشینم بداتێ، لە ڕێزەی باوکمدایە!*»

دەتوانین قەوارەی ئەو هەژارییە بزانین کە شانوشکۆی جووتیاری شکاند، لەو مەسەلەیەوە کە ئامادەبوو هەر کارێکی دەستی بکا لە شاردا، جا ئیدی هەرچەندێک مایەی سووکایەتی و داماوی بێ؛ لە کاتێکدا ساڵانێکی لەمەوبەر هەر کارێکی، جگە لە جووتیاریی، بە مایەی شانئارداویبوون و ڕیسوایی دەزانی. لە هێندێ کاتیشدا، کە پیاوانی خێڵەکان لە سەردەمی داگیرکاریی ئینگلیزدا ناچاردەکران ڕێگەی سەربازی لێبدەن، پاش تەواوکردنی کارەکە ڕازینەدەبوون هیچ کرێیەک وەربگرن و بەهانەیان ئەوە بوو کە ئەوان کارەکەیان هەروا بە خۆڕایی کردووە و ئەگەر پارەیەکی لەسەر وەربگرن، دەچنە ڕیزی کۆلی[258] و کرێکارانی بەکرێکارکردوو.

هەژاریی هاوبەش، نە هیچ شێوە هەستێکی هاوبەشی لە نێوان دانیشتووانی زنجەکان و کرێکارانی شاردا خوڵقاند و نە دانیشتووانی زنجەکانیشی لە یەکتر نزیکخستنەوە. ئەگەر یەکێک پێی وابێ هاودەردیی هاوبەش جۆرە هاوسۆزییەکی دوولایەنە لە نێوان دانیشتووان‌دا دێنێتەگۆڕێ، دەبێ خۆی لەم خەیاڵە ڕزگاربکا.

---

[257] «مامەکەم»، زاراوەیەکە، عیراقییەکان کاتێک یەکیان قسە بۆ ئەویتر دەکا، بەکاریدێنێ.

* مەبەستی ئەو پەندە میللییە باوەیە کە دەڵێ: «اللي ياخذ أمي، يصير عمي»، (ئەوی دایکم بەرێ، دەبێتە مامم)، بەڵگەی ئەو بێباکی و خۆپارێزییەیە بەرامبەر بە ڕووداو و هەڵوێستە سیاسییەکان کە زۆربەی خەڵکی لە کۆمەڵی عیراقیدا پێ جویدەکرێتەوە. (و.ع)

[258] کۆلی Coolies، کرێکارانی نەشارەزای هیندی و چینین.

هەژاری و کڵۆڵی، تەنانەت ئەگەر هاوبەشیش بن، مرۆڤ لە براکەی دادەبڕن، غەریزە کۆمەڵایەتییەکەی لەکاردەخەن، ئەوپەڕی دڕدۆنگیدەکەن بەرامبەر بە ئەوانیتر و وای لیدەکەن زیاتر و زیاتر بچێتەوە ناو قاوغی خۆی.*

شوێنەوارێکیتری دابارینی جووتیاران بەسەر بەغدادا، پەلهاوێشتنی لەڕادەبەدەری هێزە نەشارەزاکانی کار بوو لە شاردا. بە پێچەوانەی ئەو کەموکووڕییە بەرچاوە کە لە پیشەوەرە شارەزاکاندا هەبوو، ژمارەیەکی زۆری هێزی کاری نەشارەزا خرایە مەیدان و ئەم پەرەسە تازەیە، کێشایەوە بۆ خراپتربوونی ئاستی گوزەرانی کاسبکارە هەژارەکان، نەک هەر لە ڕووی کەمبوونەوەی کرێیانەوە، بەڵکوو گەلێک لەم کرێکارانە تووشی بێکاری هاتن؛ چونکە کۆچەرانی تازە هێزی کاری خۆیان بە هەر نرخێک بووە خستەڕوو و هەر پارەیەکیشیان وەربگرتایە، زۆر زیاتر بوو لەوە کە سەرۆکهۆز دەیدانێ. ئەوانە چەندەها سەعات و تەنانەت لە دوازدە سەعات پتر لە ڕۆژێکدا، بەبێ بەزەیی‌پێداهاتنەوە، کاریاندەکرد. گەلێکیشیان دەبوو هەموو بەیانییەک چەند سەعاتێک لە زنجەکانی دەوروبەری شارەوە بڕۆنە شوێنی کارەکەیان لە ناوجەرگەی شاردا و ئێوارانیش هەمان شت دووپاتبکەنەوە.

مرۆڤ کاتێک هەوڵدەدا کاریگەریی خۆبەخۆی کۆچی جووتیاران لەسەر کرێکارانی شار هەڵبسەنگێنێ، دوچاری گەلێک دژواری دەبێ، چونکە -یەکەم- هیچ لێکۆڵینەوەیەک سەبارەت بە هەلومەرجی کار، یا کرێی کرێکاران، یا هەبوونی بێکاری، یان ماوەکەی نییە و دووەم- ئەو کرێکارانە کە هەمان پیشەیان هەیە، کرێی جیاواز لە ناوچە جیاجیاکانی وڵات وەردەگرن. سێیەم- هۆکاریتریش هەن دەور دەگێڕن، وەک: بێبازاڕیی ساڵانی سی و هەڵاوسانی ساڵانی چل و پەنجا. لێکۆڵینەوەی پێویستیش نین لەو ڕووەوە کە ئەوە چ کارێکی کردووەتە سەر گوزەران. لەبەرئەوە ئەو ژمارانە کە لە خشتەی ژمارە ٢٣دا هاتوون، هەر زانیارییەکی گشتی و ناڕاستەوخۆ سەبارەت بە کاریگەریی

---

* مەینەتی و کوێرەوەری کۆمەڵی عیراقییان لەبەریەکهەڵوەشاند، نەک بە پێچەوانەوە، وەک لە کۆمەڵەکانیتردا باوە؛ چونکە ستەمکاری و برسێتی و ئاژاوە و جەنگ و ئابڵووقەدان، هەموویان کاری خراپن و باڵیان بەسەر چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتدا کێشاوە و جۆرێک لە توقین و ترس و بیم و دڵەڕاوکێیان بەرامبەر بەویتری جیاواز لە ڕۆشنبیری و تێڕوانینندا خولقاندووە. (و.ع)

کۆچ لە تێکڕاکانی کرێدا دەخەنە بەردەست. دەبینین تێکڕای کرێی ڕۆژانەی هێزی کاری نەشارەزا لە ساڵانی سیدا، بە بەراورد لەگەڵ هاوشێوەکەی لە ساڵانی بیستدا، کەم و لایەنی کەمی لە ڕۆژێکی ساڵی ١٩٢٦دا ٧٥ فلس بووە، لە کاتێکدا ساڵی ١٩٣٠ ڕۆژانە ٣٧ فلس بووە. ئەگەر بشێ هۆی ئەوە ببەینەوە بۆ بێبازاڕیی ساڵی ١٩٢٩، هێشتا دەبێ بە بایەخەوە سەرنجبدەین کە کرێی هێزی کاری شارەزا هەرگیز کاری تێنەکرا و وەک خۆی مایەوە، هۆی ئەوەیش بەردەوام دەگمەنیی ئەم جۆرە هێزی کارەیە. جارێکیتریش ناتوانین لە سایەی نەبوونی هیچ ژمارەیەکدا لەم لایەنەوە سەبارەت بە تێچووی گوزەران، هیچ ئەنجامێک لەو داکەوتنەیتری ساڵی ١٩٣٥ی ئاستەکانی کرێی کرێکارانی نەشارەزا بەدەستبێنین.

لەو قۆناغەی دواییشدا، ئەنجومەنی باڵای ئامار خشتەیەکی سەبارەت بە تێچووی گوزەران دەرکرد، ئاماژەی تێدا کردبوو بۆ زیادبوونی نرخی فرۆشی پارچە بە پارچەی کەرەستەی خواردەمەنی و جلوبەرگ و شتیتر لە ساڵی ١٩٣٩ەوە، کە خێزانی ئاسایی کرێکارانی نەشارەزا بەکاریاندێنن[٢٥٩] (بڕوانە: خشتەی ژمارە ٢٤). بەپێی ئەم خشتەیە و ئەگەر گریمان ڕاستە، ئەوا ئەو کرێکارانە کە لە ١٩٣٩دا ڕۆژانە ٤٠-٦٠ فلسیان وەردەگرت،[٢٦٠] دەبوو لە ١٩٥٢دا، ئەگەر پێویست بووایە پارێزگاریی هەمان ئاستی گوزەرانی ساڵی ١٩٣٩یان بکەن، ڕۆژی ٢٠٠-٣٠٠ فلس وەربگرن، مادامێکی تێچووی گوزەران نزیکەی پێنجئەوەندە زیادیکردبوو. بەڵام ڕاپۆرتێکی نهێنی کە نووسینگەی کاری نێودەوڵەتی بۆ حکوومەتی عیراقی ئامادەکردووە، نیشانیداوە: ئەو زانیارییانە کە حکوومەت خستوونیە بەردەستی شارەزاکەیان و ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانییەیش کە بە ئەنجامی گەیاندووە، بۆیان دەرخستووە: «ژمارەیەکی کەمی کرێکاری شاریی نەشارەزا هەن ڕۆژانە کرێیەکی لە ٢٠٠ فلس کەمتر وەردەگرن، لە کاتێکدا زۆربەیان ڕۆژانە ٢٠٠-٢٥٠ فلسیان دەستگیردەبێ.» ئەگەر تێچووی گوزەرانیش لەبەرچاوبگیرێ، ژمارەیەکی زۆری کاسبکار هەن لە ئاستێکی

---

[٢٥٩] الجمهورية العراقية، وزارة الإقتصاد، المجلس الأعلى للإحصاء، موجز إحصائي ١٩٥٧، (بغداد، مطبعة الزهراء، ١٩٥٨) ص١٥١.

[٢٦٠] ئەگەر گریمان، پێم وایە پاساوی خۆیشی هەیە کە وا دانراوە، تێکڕاکانی کرێ لە ١٩٣٩دا لەچاو ١٩٣٣دا نەگۆڕاون.

گوزەرانی مەمرەومەژی، یا لەو نزمتردا، دەژین. بەوپێیە ڕوون‌دەبێتەوە کە کرێکاری نەشارەزا سەرباری ئەو گەشەکردنە کە بەغدا بەخۆوەی دی، لە ساڵی ١٩٣٩ بەدواوە گیرۆدەبوو و داهاتە ڕاستەقینەکەی زیانی بەرکەوت. بێ‌گومان هۆیەکی سەرەکیی ئەم زیانە، دابارینی هێزی کاری جووتیاران بوو بەسەر شاردا، کە هەلێکی گەورەی بۆ بازرگانان ڕەخساند تا بکەونە پاشەکەوتی بڕەپارەیەکی گەورە و بێبەشکردنی کرێکارانیش هەم لە بەشێکی ئەو داهاتە کە دەستیان دەکەوت و هەم پشکی خۆیان لە موڵک و خانووبەرەی شار.

**خشتەی ژمارە ٢٣**

کرێی کرێکاران (١٩٢٦-١٩٥٣)

| ساڵ | خاوەن‌کار | کرێی ڕۆژانەی کرێکاری نەشارەزا (بە فلس) | کرێی ڕۆژانەی کرێکاری شارەزا (بە فلس) |
|---|---|---|---|
| ١٩٢٦[٢٦١] | بەندەری بەسرە | ٧٥ | ٤٣٥-١٨٧ |
| | کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی | ٩٢-٧٥ | ٤٥٠-٣٠٠ |
| | تێکڕای ئاسایی بازاڕ | ٧٥ | ...... |
| ١٩٣٠[٢٦٢] | بەندەری بەسرە | ٦٠ | ٤٣٥-١٨٧ |
| | کۆمپانیای نەوتی عیراق | ٧٥ | ٤٥٠-٣٠٠ |
| | تێکڕای بازاڕی بەغدا | ٧٥-٧٣ | ...... |
| ١٩٣٥[٢٦٣] | تێکڕای گشتی | ٤٠-٦٠ (بۆ گەوران) | |
| | | ١٠-٤٠ (هێزی کاری منداڵ) | |

[261] Great Britain, Colonial Office, Report by H. B. N. G. to the Council of the L. of N. on the Administration of Iraq for 1926, P. 29.

کرێ بە ڕووپی هاتووە و کراوە بە فلس، هەر ٧٥ فلس یەک‌ڕووپییە.

[262] Great Britain, Colonial office, Report on program of Iraq, 1920-1931, P. 245-246.

[263] Department of Overseas Trade, Exergonic Conditions in Iraq 1923-1935, Report by J. F. summer scale, Commercial Secretary of Britain Embassy (London: H. M. Stationary office, 1936) P. 30.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٥٣ | تێکڕای گشتی لە بەغدا | کەمتر لە ٢٠٠–٢٥٠[٢٦٤] | ٥٠٠–١٢٠٠[٢٦٥] |

**خشتەی ژمارە ٢٤**

## تێچووی گوزەرانی کرێکارانی نەشارەزا لە شاری بەغدا[٢٦٦]

## (تێکڕای بنەڕەتی ساڵی ١٩٣٩ دەکاتە ١٠٠)

| ساڵ | خواردەمەنی | جلوبەرگ | سووتەمەنی و ڕووناککردنەوە | بەکرێگرتن | ماددەیتر | ژمارەی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٣٩ تێکڕای مانگانە | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |
| ١٩٤٥ | ٦٥٥ | ٧٩١ | ٤٥٦ | ٣٣٤ | ٤٤٩ | ٥٩٠ |
| ١٩٤٨ | ٨٠٦ | ٨٤١ | ٤١١ | ٣٣٣ | ٤١٣ | ٦٧٣ |
| ١٩٥٢ | ٦٦٥ | ٦٧٤ | ٤٠١ | ٢٨٩ | ٣٤٩ | ٥٦٤ |
| ١٩٥٣ | ٥٦٠ | ٥٥٨ | ٣٩٣ | ٣٠٠ | ٣٣٩ | ٤٩٠ |
| ١٩٥٤ | ٥٤٨ | ٥٢١ | ٥٩٠ | ٣٠٠ | ٣٣٨ | ٤٨٠ |
| ١٩٥٥ | ٥٧٢ | ٥١٣ | ٤٠٢ | ٣٠٠ | ٣٣٧ | ٤٩٥ |
| ١٩٥٦ | ٦١٦ | ٥١٣ | ٤١٨ | ٣٠٠ | ٣٦٧ | ٥٢٧ |
| ١٩٥٧ | ٦٥١ | ٥١٦ | ٤١٥ | ٣٠٠ | ٤٠٥ | ٥٥٤ |

---

264 International Labor Office (Confidential) Report to the Government of Iraq on the Development of a Social Security System (Geneva, 1954) P. 12-13.

ڕاپۆرتەکە لە ئیدارەخانەی کار و دەستەبەری کۆمەڵایەتییە.

٢٦٥ ئیدارەخانەی کار و دەستەبەری کۆمەڵایەتی (دائرة العمل والضمان الاجتماعي).

٢٦٦ الحكومة العراقية، وزارة الإقتصاد والمجلس الأعلى للإحصاء، ملخصات إحصائية ١٩٥٦، ١٩٥٧، الجدول ١٩٣، ص١٥٨ والجدول ١٩٢، ص١٥٢، بەرودوا.

## باسی نۆیەم

### هۆیە بنچینەییەکانی کۆچی جووتیاران:
### شوێنەوارەکانی سیستەمی زەوی‌وزار و دەزگای سەرۆکایەتیی هۆز

بەرپرسانی لیواکان لە سەرەتاکانی ١٩١٩ەوە، بەردەوام بەدەست کەمی و دەگمەنیی جووتیارانەوە دادوبێدادیان بوو. تەنانەت پلانەکانی کاروباری سادەی وەک جۆگەلێدان یا بنیاتنانی بەنداو لەسەریان، بەزۆری دەستیان لێهەڵدەگیرا، چونکە ژمارەی جووتیاران بەشی‌نەدەکرد. ئەم کەم‌وکوورپییە، بە درێژیی چل ساڵی دوایی، هەمیشە بەهانەی هەموو ناوچەکانی عیراق بوو. لە هەمان کاتدا -وەک بینیمان- ئەو جووتیارانە کە لەم زەوی‌وزارانەدا کاریان‌دەکرد، وازیان لە جووتیاری هێنا و بە ژمارەیەکی گەورەوە ڕوویان‌کردە شارەکان. ئەم مۆرکەی کشت‌وکاڵی عیراقی، ئەنجامی ئاسایی و مسۆگەری کارەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتیی سەرۆکایەتیی هۆز بوو. ئەم سیستەمە، چۆن کاری‌کردە ژیانی جووتیاران؟ ئەو بابەتەیە کە لە بەندی دوایی‌دا لێی دەتوێژینەوە.

#### هەلومەرجی ژیانی جووتیاران:

زۆربەی زۆری چینی جووتیار سەر بەو چینە هەژارەی وەرزێرانە کە لە باشووری عیراق بە پاڵە (الطوایف)[٢٦٧] ناودەبرێ. ئەوانە بڕبڕەی پشتی وڵاتن، بەڵام ڕەنج‌دەدەن و بە هەزارحاڵ دەژین. دشداشە دڕاوەکانیان، تاقە بەرگێکی بەریانە. پێکەوە لەگەڵ گامێش یا مانگاکانیان لە کۆختەی بە حەسیر و قوڕ دروستکراودا بەسەر یەکدا کەڵەکەبوون، پیسایی و خوڵ‌وخاشاک لە هەموو لایەکەوە دەوری‌داون. خۆراکیان بریتییە لە کەمێک خورما و نیسکێنە، جۆ یا برنج و کەمێک شتی‌تری دەنێنە بەر. ئەوەی دەیخۆن، جۆری ناسراوی خورما یا برنج نییە، بەڵکوو شتێکی هاوشێوەیە. هەموو جۆرە خواردنێک لە عیراق، بەپێی

[٢٦٧] الطوائف، گۆڕدراوی زاراوەی (طائفة)یە، واتە تیرەی جووتیار و تاقمی خزمەکانی، ڕەنگە لە شەبەنگ (الطیف)، واتە خەیاڵ و خەونەوە هاتبێ. (و.ع)

چینەکانی کۆمەڵ پۆلێنکراون. لەبەرئەوە سێ جۆر برنج هەیە: جۆری پەسەندترینیان ناوی برنجی عەنبەرە و دەنکەکەی سپی و بچووکە و تەنیا بە دەوڵەمەندان دەفرۆشرێ. هاونیشتیمانی ئاسایی ئەو برنجە ئاساییە بەکاردێنێ کە پێیدەگوترێ نەعیمە، دەنکەکەی سپی و گەورە و درشتە. ئەو عیراقییانەیش کە یەکجار هەژارن و چینی پاڵە سەر بەوانن، درشتترین جۆری برنج، کە حوێزاویی ناوە و جۆرێکی دزێوی نانی لێ دروستدەکرێ، بەکاردێنن.

هاودەمی هەموو کاتێکی جووتیاران کرمی ئەنگلستۆمایە،* کە پزیشکان دەڵێن دەبێتە هۆی ئەوپەڕی کەمخوێنی و تینوتوانی کارکردنیش کەمدەکاتەوە. ئەوانە هەمیشە میوانی بەردەوامی لیستێکی درێژی نەخۆشییەکانیترن. ئەم نەخۆشییانە ئاسایی بەبێ چارەسەر یا دەستنیشانکردن وازیان لێدەهێنرێ. بنکە تەندروستییە حکوومییەکانیش دەگمەن و دوورن. بەڵام تەنانەت لەو دۆخە تا ڕادەیەک کەمانەیشدا کە جووتیاران چارەسەری تێدا وەردەگرن، مادامێکی جووتیار دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ژینگە و ئەو هەلومەرجەی ژیان کە کردوویە بە قوربانیی ئەم نەخۆشییە، چارەسەرەکە بەفیڕۆدەچێ. پزیشکێکی عیراقی ئەم گیروگرفتەی بە شێوەیەکی زیندوو وەسفکردووە،[٢٦٨] کاتێک گوتوویە: «نەخۆش دەچێتە نەخۆشخانە. کە یەکەمجار تەماشایدەکەی، تێدەگەی بەدەست ئەنگلۆستۆماوە دەناڵێنێ. شیکردنەوەی تاقیگەیش ئەوە دەسەلمێنێ. پلەی بەرزی کەمخوێنییەکەی و دۆخی ئەو برسێتییە بێوێنەیە کە گیرۆدەی بووە، لە ناخەوە ڕاتدەچڵەکێنن. دەبینی پلەی هیمۆگلۆبینی خوێنی لە ٢٠٪ تێناپەڕێ و خانەکانی خڕۆکەی سووری ٢ ملیۆن/سم$^{٣}$ە. هەر ئەوەندەی خواردن و توخمی ئاسنی بە دەم بدرێتێ، حاڵوباری ڕوو لە چاکی دەکا. هیمۆگلۆبین لە ماوەی مانگێکدا لە خوێنیدا زیاددەبێ، تا دەگاتە ڕێژەی ٥٠٪ و خڕۆکە سوورەکانی خوێنیش دەبن بە ٣ ملیۆن/سم$^{٣}$. ئەوجا چارەسەری دژی ئەنگلستۆمای دەردێتێ، چونکە حاڵی

---

* ئەنگلستۆما، گرنگترین نەخۆشیی بڵاوی ناو عیراقە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا. بڵاوبوونەوەی -بە پلەی یەکەم- دەگەڕێتەوە بۆ نەزانی و هەژاری و کەمتەرخەمی. بڕوانە: مرسيس دير هاكوبيان، حالة العراق الصحية في نصف قرن، دار الرشيد للطباعة، بغداد، ١٩٨١، (و.ع)

[٢٦٨] لە توێژینەوەیەکی بڵاونەکراوەی دکتۆر مەهدی مورتەزاوە، بە ناونیشانی "الظروف الصحية في العراق".

پێشووی ڕێی‌نەدەدا ئەم چارەسەرە وەربگرێ. ڕێژەی هیمۆگلۆبینی بە چەند هەفتەیەک دەگاتە ٦٥٪ و خڕۆکە سوورەکانی خوێنیش دەبنە ٣,٥ ملیۆن/سم$^3$ و ئیتر هەست بە چاکبوونەوە دەکا و دەبینی گوڕ و زووخێکی تێ‌دێتەوە و دەبووژێتەوە. دەیەوێ بچێتەوەماڵی خۆی و سەر کارەکەیشی و دەبێ بهێڵی بچێتەوە بۆ هەمان ژینگە. پاش ساڵێک، دیسان دێتەوە بۆ نەخۆشخانە، چونکە تووشی هەمان نەخۆشی هاتووەتەوە.»

دەتوانین بە گوێ‌گرتن لە گۆرانییەکانی جووتیاران، ئەو خەم و خەفەتە بەدی‌بکەین کە باڵی بەسەر ژیانیان‌دا کێشاوە. ئەم دێڕە شیعرەی لای خوارەوە لە دێهاتی باشووری عیراق زۆر بڵاوە:[٢٦٩]

مالچ يا يمه اليوم جبتيني للظيم
والدنيا بس وياي تمطر بلا غيم

دایە ئەمڕۆ چیتە وا منت هێناوەتە ناو ئەم کوێرەوەرییە،
دنیا هەر لەگەڵ من بەبێ هەور باران دادەکا.

زۆرداریی ژیان و خۆلێ‌بێ‌دەنگ‌کردنی، وەک بەشێکی سیستەمی سروشت، پێکەوە لە گۆرانییەکەدا هەستیان پێ‌دەکرێ. بەڵام ئیتر جووتیاران بەرە بەرە و زیاتر کەوتنە پرسیار، سەبارەت بە ناچاریی ئەم شێوازی ژیانەیان، وەک لەم گۆرانییە نوێترەی جووتیارانی ئەلبومحەمەددا دەردەکەوێ:[٢٧٠]

يا ربي هيچ وياي مابيها معنى
ينتفع بيه الغير -مو حق- تعبنا
ورد أشرد لبغداد من هلعشيرة
لا تجبر المكسور، لا عدها غيرة
ورد أشرد لبغداد من هلفلاحة
لاتشبع الجوعان ولا بيها راحة

---

[٢٦٩] لە دەستنووسێکی بڵاونەکراوەوە، بە ناونیشانی "معلومات عن ريف العمارة".

[٢٧٠] ئەمە نموونەیەکی چەند گۆرانییەکە، بە هاوکاریی جووتیارێکی تەمەن سی‌وپێنج ساڵی خێڵی ئەلبومحەمەدی عەمارە، کە کانوونی دووەمی ١٩٥٨ دەرگاوانی کۆمپانیایەکی بازرگانی بوو لە بەغدا، کۆم‌کردەوە.

وصفج الراح بالراح راح الوقت راح
وأنا أركض وتعبان ما حصلت راح

خودایە، ئەم شێوە ڕەفتارە لەگەڵم، مانای تێدانییە
هەق نییە ماندوێتییەکەمان خەڵکیتر سوودی لێببینێ
دەمەوێ لەم عەشیرەتە هەڵێم بەرەو بەغدا
نە شکاو هەڵدەبەستێ و نە غیرەتی هەیە
دەمەوێ لە جووتیاری هەڵێم بەرەو بەغدا
برسی تێرناکا و حەوانەوەی تێدانییە
دەست بە دەستدا بدەم – کاتەکە ڕۆیی و ڕۆیی
منیش هەر ڕادەکەم و ماندووم، ئاسوودەییم دەستنەکەوت

ئەم گۆرانییە دەریدەخا جووتیارانی ئەلبومحەمەد بیری تازە کاری تێکردوون و پەسەندیدەکەن، چونکە پێوەندیی بە ژیانیانەوە هەیە. هەڵوێستی جووتیارانیش بەرامبەر بە هۆزەکانیان، شایانی سەرنجدانە، چونکە ئیتر باوەڕیان پێیان نەما، لەبەرئەوەی چیتر وەک جاران، کە ئاواییەکەیان نەکرابوو بە شوێنی بازرگانی، تەسکینی و یارمەتیی پێنەدەبەخشین. بەردەوامیی پێوەندییە خێڵەکییەکانیشیان، واتە بەسترانەوەیان بە سەرۆکهۆزەوە، هەر بەردەوامیی کوێرەوەریی ئەوانی دەگەیاند. لێرەوە پێویست بوو خۆ لە کۆت و پێوەندی خێڵ ڕزگاربکەن و هەڵێن و دوور بڕۆن.

هۆیەکی ئەو کوێرەوەرییە کە جووتیار دەیچێشت، ئەو پاداشتە کەمە بوو کە وەک پشکێکی بەرهەمی زەوی وەریدەگرت. پشکەکەی لە بەروبووم بوو و لە لیوایەکەوە بۆ لیوایەکیتر جیاوازبوو. هۆکاریتریش نەخشیان لە دیاریکردنی پشکەکەیدا هەبوو، لەوانە: ئاخۆ زەوییەکە دەوڵەمەند و پڕداهاتە یا هەژار و کەمڕیژەوە، بە باران یا ئاوی سەرزەوی یا بە کروود[٢٧١] یان ئاوهەڵکێش ئاودەدرێ، جووتیار بە شێوەیەکی هەمیشەیی یا کاتی کاری تێدا دەکا. لەوانەبوو پشکەکەی کەم بێ، تا ڕادەی ٢٥٪ لە ناوچەی باشوور کە بە ئاوی سەرزەوی ئاودەدرا، یا بگاتە ٦٠٪ لە زەوییەکانی

[٢٧١] کەراد، ئامێرێکی سەرەتاییی ئاوهەڵدانە، ئاو بە پێستەی گەورە هەڵدەدرێ، دۆلکەی پێدەگوترێ، ئاژاڵ بە گوریس ڕایدەکێشێ و بەرزدەکرێتەوە.

هەولێر و سلێمانیی باکووری عیراق، کە بە باران ئاودەدران و کشتوکاڵیان تێدا زیاتر لە هەڵکشان‌وداکشاندایە و کەمتر جێگیرە.

لە عەمارە، بە پێچەوانەی لیواکانی‌ترەوە، سەرۆکهۆز زەوی بەکرێ‌دەدا بە چەند سەرکارێک، بە کرێیەکی جێگیر کە ئاسایی بریتی‌دەبێ لە بەروبووم.[٢٧٢] ئەمە زامنکردنی پێ‌دەگوترێ. سەرکارانیش پێ‌بەپێ بە کرێ دەیدەن بە جووتیاران، بەگشتی بەرامبەر بە پشکێکی بەرهەم. وا چاوەڕوان‌دەکرێ سەرۆکهۆز پشکە نەگۆڕەکەی خۆی بە چاوپۆشین لە خراپی یا کەمیی بەروبوومەکە، وەربگرێ، دەبێ جووتیار و سەرکار هەر خۆیان سەرەنجامەکەی دەرببەن. جووتیار و سەرکاری کەمتەرخەمیش، وەک لای خێڵی ئەلبومحەمەد نەریتە، فڕێ‌دەدرێنە ناو بورجی تاریک (المفتول الأظلم)،[٢٧٣] تا چیان لەسەرە بیدەن! لە چەند لیوایەکی‌تر، سەرکار هەر بریکاری سەرۆکهۆزە و پشکێک لە بەربووم وەردەگرێ. لە مەڵبەندە گەورەکانی هێندێ لیوای وەک -بۆ نموونە- کەربەلا، وا ڕاهاتوون ڕووبەرێکی دەست‌نیشانکراوی زەوی بۆ هەر سەرکارێک جیابکەنەوە، پێی‌دەگوترێ (المطلک) و سەرکار هەموو بەروبوومەکەی دەبا.[٢٧٤]

لە عەمارە؛ جووتیار یا نیوەی بەروبوومە داچێندراوەکەی، ئەگەر خۆی بنەتۆو و ئامێر و ئاژاڵەکانی دابین‌کردبێ، یا سێیەکی بەربووم، ئەگەر بنەتۆوەکە هیی خۆی نەبێ، وەک پشکی خۆی وەردەگرێ. لەو زەوییە باشانەش‌دا کە بە بەپیت (التطیاب) ناسراون و ئەرکێکی کەمتریان دەوێ، پشکی جووتیار دەگاتە چارەک.[٢٧٥] لە لایەکی‌ترەوە، پشکی جووتیار لەسەر ڕووباری فورات، لە زەویی باش‌دا دەگاتە سێیەک و لە زەویی کەم‌بەرهەمتردا نیوە. لە بەندێکی پێشوودا دیمان چۆن دەرامەتی حکوومەت ڕووی لە کەمبوونەوە کردووە. بەڵام کاتێک حکوومەت موڵکانەکانی خۆی لەسەر سەرۆکهۆز کەم‌دەکاتەوە، سەرۆکهۆز هیچ موڵکانەیەکی خۆی

---

[٢٧٢] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ڕۆژی ٩ی مایسی ١٩٤٤ی موتەسەڕیفی عەمارە بە ناونیشانی: ترکات العقود المباشرة...، ص٦؛ دەستنووسێکی بڵاونەکراوەی ناونیشان "معلومات عن ریف العمارة"، ص١٣.

[٢٧٣] المفتول، بورجێکی بەرزە، بڕوانە: عبدالرزاق الهلالي، الهجرة من الریف الی المدن، ص١٧.

274 Reports of Administration of 1918, I, P. 189.

[٢٧٥] دەستنووسێکی بڵاوکراوەی ناونیشان "معلومات عن ریف العمارة"، ل١٦؛ ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ڕۆژی ٩ی مایسی ١٩٤٤ی موتەسەڕیفی عەمارە، ل١٨.

لەسەر سەرکار، یا جووتیار کەمناکاتەوە. ئەمە وا ڕووندەکەینەوە؛ پشکی ڕەسمیی حکوومەت لە دەرامەتی زەویی سەردەمی حوکمی عوسمانیدا،[276] لە قەزای شامییەی فوراتی ناوەڕاست ٥٢٪ (٣٠٪ی وەک باجی دەیەک و ٢٠٪ی وەک کرێی زەوی و ٢٪یش باجی یارمەتی و کۆمەک) بوو.[277]

سەرۆکهۆز ئەم داهاتانە کۆدەکاتەوە و حکوومەتیش ٦٪ی پشکی خۆیی دەداتێ بۆ قەرەبووکردنەوەی خزمەتەکانی و خۆیشی ٦٪ لە جووتیاران وەردەگرێ. لەبەرئەوە دابەشکردنەکە بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێ: حکوومەت: ٤٦٪، سەرۆکهۆز: ١٢٪، جووتیار: ٤٢٪.

بەڵام ئەم دابەشکردنە بەم شێوەیە بووبوو بە نەریتێکی باویش: جووتیار سێیەکی بەروبوومەکەی دەبرد و ئەوەیتری، بە بەشی حکوومەتیشەوە، بۆ سەرۆکهۆز دەمایەوە. لە قۆناغی ئینتیدابی بریتانیادا، حکوومەت پشکی خۆی کەمکردەوە بۆ ٣٠٪، بەڵام سەرۆکهۆز هەر دوو سێیەک (٣\٢)ی لە جووتیار دەماشییەوە و ئەم نەریتە تەنانەت پاش کۆتاییهاتنی سیستەمی باجی ڕاستەوخۆی سەر زەویش لە ١٩٣١دا، هەر مایەوە و هەمان زەوییەکان درانەوە بە سەرۆکهۆز بە لەزمە.

جووتیاران، بەشە بڕیارلێدراوەکانی خۆیان لە هەموو بەروبوومەکە وەرنەگرتەوە، بەڵکوو لە پاشماوەی بەروبوومەکە، دوای ئەوەی هەموو موڵکانەیەکی جۆربەجۆری دەرەبەگیی لێلادرا. سەرۆکهۆز خۆی ئەم موڵکانانە وەردەگرێ و بڕەکەیشی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکیتر جیاوازدەبێ. لە باشوور،[278] موڵکانە و بەروبوومەکە خۆیشی بە کێلە دەکێشرێن، یا بە مەن. کێلەیش دەکاتە چوار کیلۆگرام چارەکێک کەم. ئەم کێشانە لە بەشەکانی تەغارن. مەن دەکاتە ٢٥ کگم، کەچی تەغار دەکاتە ٢٠٠٠ کگم. ئەو موڵکانە سەرەکییانە

---

[276] ئەوسا زۆربەی زەویوزار میری بوو.

[277] احمد فهمي، مدير مجلس الحسابات العام، تقرير حول العراق، ص٧٨؛ ڕاپۆرتەکانی ساڵی ١٩١٨ی بەڕێوەبەران، بەرگی یەکەم، ل٧٣.

[278] ئەم بەندەی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی دیار پشتیبەستووە بە دەستنووسێکی بڵاونەکراوەی ناونیشان "معلومات عن العمارة"، ص١٦-١٩؛ احمد فهمي، تقرير حول العراق، ص٧٩-٨٠. زانیارییەکانی سەرچاوەی یەکەم بە گفتوگۆکردن لەگەڵ جووتیارانی پێشووی عەمارە کە لە بەغدا گیرساونەتەوە، ساغکراونەتەوە.

که سەرۆکهۆزەکان سالانی بیست لە قەزای شامییە بە مەن و لە عەمارەیش بە کێلە کۆیانکردووەتەوە، بەم شێوەیەن:

١. شاهەنی یا گەعادە (الشاهنية أو الكعادة): باجێکە وەرگیراوە بۆ ئەو پیاوانە کە پاسی بەروبووم دەکەن لە ساتەوەختی پێگەیشتنیەوە تا چنینەوە و درویێنەکردنی و ئەوانە گزیر (گوبانییە)ی[٢٧٩] سەرۆکهۆزن (لە عەمارە، باجی ٤ کێلە لە هەموو ١٠٠ کێلەیەکی سەرجەمی بەروبوومەکە وەردەگیرێ، لە کاتێکدا لە شامییە مەنێکە لە هەر تەغارێک).

٢. قاوەچییانە (القهوجية): مۆڵکانەیەکە بۆ قاوەچی، (٣ کێلەیە لە هەموو ١٠٠ کێلەیەک و یەک مەنە لە هەر تەغارێک). وێدەچێ ئەم مۆڵکانەیە لە عەمارە، خەرجیی دیوەخان (میوانخانە)[٢٨٠] دەربهێنێ. لە شامییە، مۆڵکانەیەکیتر کە بە بەرتیل (براطيل) ناسراوە، دەسەپێندرێ و ٢ مەن لە هەر تەغارێک دەگرێتەوە.

٣. ناوی خودا (اسم الله): لە عەمارە، مۆڵکانەیەکی ئایینییە، برەکەی دەگاتە ٣ کێلە و دەدرێتە ئیماندار (المؤمن).[٢٨١]

٤. ئاواکردنەوە (المعمورية): مۆڵکانەیەکە دەدرێتە ئاواکەرەوە (المعمور)، کە سەرپەرشتیی دابەشکردنی ئاو و چاککردنەوەی بەنداوەکان دەکا. لە عەمارە، ئاواکەرەوە ٣ کێلە لە پشکی هەر جووتیارێک و لە شامییە مەنێک لە هەر تەغارێکی هەموو بەروبوومەکە وەردەگرێ.

٥. کێشانە (الوزانة): مۆڵکانەیەکە بۆ قەپانچی (الوزان) کە بەروبوومەکە دەکێشێ ( ٥ کێلە لە عەمارە).

سەرانەیتریش هەن. لەو مەڵبەندانە کە پشت بە ئاوهەڵکێشەکان دەبەستن، بەرپرسی ئاوهەڵکێش پشکێکی هەیە و پێش دابەشکردنی بەروبوومەکە وەریدەگرێ. پووشانە (هەقی لەوەڕاندن) کە (شط مرتع یا الطرارة)ی پێدەگوترێ، لەو جووتیارانە وەردەگیرێ کە گاوگۆتاڵیان هەیە. هەندێ سەرۆکهۆزیش هەن، سەرانەی هەرەمەکیی وەک بۆنەی ژنهێنان یا منداڵبوون

---

[٢٧٩] گوبانییە، پاسەوانی چەکداری سەر بە سەرۆکهۆزن.

[٢٨٠] دیوەخان: میوانخانە، بارەگای میوانان و ناوەندی مەدەنیی خێڵە.

[٢٨١] ئیماندار (المؤمن): پیاوی دینی، مەلا.

لەناو بنەماڵەکانیان‌دا دەسەپێنن. سەرۆک‌هۆز ئەگەر بیەوێ، تەنانەت ئایەخترین برەپارە لە جووتیار دەبڕێ و هیچ شتێک نییە بەر بە هەڵس‌وکەوتی بگرێ، مەگەر یاخیبوون،[282] یا زەوی بەجێ‌هێشتن و کۆچکردن.

وەک زانراوە، کە دابەشکردنی بەربووم تەواودەبێ، شتێکی ئەوتۆ بۆ جووتیار نامێنێتەوە. گەورەترین دەرامەت کە دەشێ بۆ ساڵێکی ڕەبەقی کارکردن وەری‌بگرێ، تەغارێک (٢ تەن) دانەوێڵەیە. بەڕێوەبەری گشتیی ژمێریاریی گشتی لە وەزارەتی داراییی عیراق، ساڵی ١٩٢٤ تێکڕای داهاتی ٦٠٠٠ جووتیاری کە بۆ ١١٥ سەرۆک‌هۆزی شامییەی سەر فورات کاریان‌کردووە، بە دەوری ١٢٧٠کلگم دانەوێڵە خەملاندووە.[283]

حکومەتی ئینتیدابی بریتانیایش لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٣١دا بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان، تێکڕای بەهای نەختینەی داهاتی ساڵانەی جووتیاری بەپێی نرخەکانی دانەوێڵە لە ١٩٢٨دا بە دەوری ٢٠٠ ڕووپی و بەپێی نرخەکانی ١٩٣٠یش بە ٨٠ ڕووپی مەزەندەکردووە.[284] تێکڕای نرخی گەنم لە ١٩٣٠دا، دەگەیشتە نزیکەی ٦٥ ڕووپی بۆ هەر تەنێک و نرخی جۆیش ٣٠ ڕووپی. بە واتایەکی‌تر، جووتیار لە ١٩٣٠دا تێکڕا نیوتەن گەنم، یا ٢،٦ تەن جۆی وەرگرتووە. موتەسەڕیفی عەمارە، لە ڕاپۆرتی ١٩٤٤ی‌دا ڕوونی‌کردووەتەوە: سەروبەری داهاتی هەشتا جووتیار کە گزیری شێخ خەتاب جاسمیان لە سەرۆک‌هۆزانی ئەلبومحەمەد پێک‌هێناوە، ١٧٧ تەن چەڵتووک بووە. سەروبەری داهاتی ٥٥٢ پیاوی گزیری سەرۆک‌هۆزانی شێخی گەورە، محەمەد عریبیش لە هەمان خێڵ، ١٢٥٥ تەن بووە.[285] ئەمە -لەو دوو نموونەیەدا- تێکڕایەکی داهاتی ٢،٢ تەن بۆ هەر پیاوێک دەگەیێنێ و دیارە دەبێ داهاتی جووتیاری ئاسایی بە ناچاری لەوەیش کەمتربێ.

جووتیار، لەپێناوی بەدەست‌هێنانی ئەم داهاتە سادەیەدا، دەبوو نەک هەر کار لەو زەوییەدا بکا کە ڕەنێوی‌دێنێ، بەڵکوو دەیشبوو ئەرکێکی‌تری ناسراو

---

[282] لە شوێنێکی‌تر وت‌ووێژ سەبارەت بە مەسەلەی یاخیبوونی جووتیاران دەکەین.

[283] احمد فهمي، تقرير حول العراق، ص٨٧-٨٨.

[284] Great Britian Colonial office, Report on the Progress of Iraq 1920-1931, P. 239.

[285] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ڕۆژی ٩ی مایسی ١٩٤٤ی موتەسەڕیفی عەمارە، "تركات العقود المباشرة"، ص٢٣-٢٤.

بە یارمەتی (العونة) ڕاپەڕێنێ، ئەویش کاری بێگاری بوو لەسەر زەویی سەرۆکهۆز و زەویی ئیمانداران یا سادات کە بە قەدەغە (المحرمات) ناسراون. هەروەها بانگیش‌دەکرا بۆ بنیاتنان یا چاککردنەوەی بەنداو یا جۆماڵکردن یا لێدانی جۆگەی تازە؛ هەموو ئەمانە بەبێ کرێ و بە خۆڕایی. بۆ ئەوەی - ئەوەندەی بکرێ- بە خێرایی زۆرترین کەڵکیش لە ڕەنج و ئەرکی جووتیار وەربگیرێ، ڕێگەی کاری هەرەوەزی لەو بۆنانەدا دەگیرایەبەر؛[٢٨٦] ئەویش بریتی‌بوو لە بەخۆکەوتن و هەستانێکی جەماوەری خێڵ بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی کار. دەرکەوت جووتیار، لە دۆخی کاری هەروەزی‌دا، زیاتر لە دۆخی کاری تاکەکەسی کاردەکا. باسی بێگار (کاری زۆرەملێ)یش کراوە لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٢٦ی بریتانیادا بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان.[٢٨٧] ڕاپۆرتەکە ڕوونی‌کردووەتەوە کە سەرباری بەندی ١٤ی قانوونی ساڵی ١٩٢٣ی ئاودێری و بەنداوەکان، جووتیاران ناچارکراون بە خۆڕایی کار لە بەنداوەکان‌دا بکەن و دەیشبوو خۆیان ئامراز و خواردن و جێی مانەوەیان دابین‌بکەن. وێڕای دەرچوونی ڕێنوێنییەکان بۆ هەموو موتەسەڕیفانی لیوا کە بەرپرسیی پارەپێدان و خواردن و دابینکردنی جێگەی مانەوە بۆ جووتیارانی کارکردوو لە پڕۆژەکانی ئاودێری‌دا، لە ئەستۆی سەرۆک‌هۆزی سوودمەندە لەم کارانە، بەڵام لەوەناچێ ئەم نەریتە پێڕەوکراوە گۆڕدرابێ، بەتایبەت لەو ناوچانەدا کە سەرۆک‌هۆزەکان دەسەڵاتێکی ڕەهایان تێیان‌دا هەبووە.

بەشی ژنەجووتیار لە کاردا، زۆر لە بەشی پیاو قورستربووە، چونکە هەر بەشداریی کار و خەفەت و نەگبەتیی نەبووە، بەڵکوو دەبوو ستەم و ملهوڕیی ئەویش دەرببا و خەرجیی تۆڵەی یاوەرییە چەوتەکەیشی بکێشێ. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەم لە کۆیلەیش کۆیلەترە و بەپێی داب و نەریت، ململانێ خێڵەکییەکانیش لەسەر حیسابی ئەم یەکلادەکرێنەوە، چونکە لە مەسڵەتی ئەو ناکۆکییانەدا کە خوێنیان تێدا ڕێژراوە، لە خوێن‌بەهادا دراوەتە کەسانی‌تر.

---

[٢٨٦] فەرمانبەرانی ئاودێریی ئینگلیز کاری هەرەوەزییان بە ئەم مەبەستانە بەکاردەهێنا. براونە: ڕاپۆرتەکانی نیسانی ١٩١٨ی بەڕێوەبردن، بەرگی یەکەم، ل١٢٣.

[287] Great Britain, colonial office, Report by H. B. N. G. to the coyncil of the L. of N. on the Administration of Iraq for 1920, PP. 36-37.

لە ڕاپۆرتێکی ڕۆژی ١ی نیسانی ١٩٣٠ی پشکنێری کارگێڕیی عەمارەدا،[٢٨٨] دەخوێنینەوە کە ساڵی ١٩٢٩: «١٢٥ ئافرەت لە مەسڵەتی ٦٢ ناکۆکیی خێڵەکی‌دا دراونە نەیاران. لە هێندێ حاڵوباریش‌دا، ئافرەتان بە چەندین جار و لە چەندین ماوەی دەستنیشانکراودا بەخشراون. لە یەکێکیان‌دا، دوایین ئافرەت پاش نۆ ساڵ لە مەسڵەتەکە دراوە. جاروباریش گاوگۆتاڵ لەبریی ئافرەت دراوە. بۆ نموونە، لە کێشەی لەخشتەبردنی کچێکی خێڵی بەنولام‌دا، تاوانبار ناچارکرا کچە بهێنێ و دوو ئافرەت و چوار گامێش و دوو مانگایش بداتە کەس‌وکارەکەی... .»

ئەو ئافرەتە کە دەدرێ بە نەیار، بە خۆشەوەکەرە (الفصيلة) ناسراوە و ژیانێکی سەخت دەژی. مێردەکەی بە شێوەیەکی ئاسایی دەیچەوسێنێتەوە و بە سووکایەتییەوە مامەڵەی لەتەک دەکا. لاقەکردن تا ببێتە خۆشەوەکەرە، ئەو تاقە چارەنووسە نییە کە دوچاری ژنەجووتیار دەبێ؛ کارێکی باویشە ئافرەت لە لایەن باوکیەوە بە دیاری بدرێتە کەسێکی هەڵکەوتووی دیاریکراوی گوند، بۆ بەدەستهێنانی چاکە و ڕەزامەندیی. ئەمە بە هاوسەرگیریی بەخشین (زواج الهبة) ناودەبرێ، هەروەها گفت‌دەدرێ وەک ژن بدرێ و بە مارەکردن بە بچووکی (هاوسەرگیریی وەقف- زواج الوقف) ناسراوە، لە کاتێک‌دا ئەو هێشتا منداڵە، پەیمان‌دەبەسترێ وەک ژن بدرێتە کەسێک یا خزمێکی دیاریکراو.[٢٨٩] ئەمانە هەندێ نموونەی دیاری سەرکوتکردنی کۆمەڵایەتیی ئافرەتی جووتیارن و بابەتێکە ناتوانین لەم باسەدا لێی بکۆڵینەوە، چونکە بەرەو دەرەوەی چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەمان دەبا.

نوێنەرێکی بەسرە، لە دانیشتنێکی پەرلەمانەکەی بەکر سدقی‌دا ساڵی ١٩٣٧، بەسەرهاتێکی خۆی و سەربازێکی جووتیاری بۆ هاوڕێکانی گێڕایەوە، گوتی: بیست ڕۆژ لەمەوبەر، کاتێک بە بەلەمێکی بچووک لە دێی حەرەد (الحرد)ەوە دەگەڕامەوە بۆ بەسرە، بە سەربازێک گەیشتم لە قەراغی ڕووبارەکە. لەگەڵ خۆم بردم و لە ڕێگە و کاتی قسەکردنمان، هاتینە سەر باسی سوپا، ڕوانیم یەکجار بێزارە لە ژیانی سەربازی. بە چەندین شێوە هەوڵم دا قەناعەتی پێ‌بهێنم کە خزمەتی نیشتیمان بایەخی هەیە، وەلامەکەی ئەمە بوو: «مامە گیان،

---

[٢٨٨] ڕاپۆرتی ساڵانەی بڵاونەکراوەی عەمارە لە ١٩٢٩دا، ڕۆژی ١٩٢٥/٤/١، پشکنێری کارگێڕیی ئینگلیز لە لیوای عەمارە ئامادەی‌کردووە، ل٢١-٢٢.

[٢٨٩] دەستنووسێکی بڵاونەکراوەی ناونیشان: "معلومات عن ريف العراق"، ص٣٦.

نیشتیمان چییه؟! من کۆختەیەک شکنابەم تێیدا بژیم و کەس ڕێنادا گامێشەکەم تەنانەت لەناو هۆڕەکانیش بلەوەڕێنم!» ئەگەر ئەو هەلومەرجە سەختە کە جووتیاری تێدا دەژی، بێنینە بەرچاومان، پێم وایە دەتوانین هەڵوێستی ئەم سەربازە و ئەو خاڵە کە نوێنەری بەسرە ویستوویە بیگەیێنێ بە ئێمە، لەبەرچاوبگرین، چونکە وڵات هیچ شتێک نادا بە جووتیار، تەنیا سەرکوتی دەکا و پشتگوێی دەخا. لەبەرئەوە مەسەلەی ئەوە کە قەرزارباری هەر شتێکی وڵاتە، تەنیا قسەیەکی هیچوپووچ و بێهوودەییە. ئەو، بە هیچ شێوەیەک هەستناکا پابەندی ئەم وڵاتەیە و پێیەوە شەتەکدراوە. نکوولێکردن لە مافی ژیانە ئاساییەکەی، نەک هەر دەیکا بە کەسێکی نامۆ بە سەرۆکهۆز و خێڵەکەی، بەڵکوو بە هیچ شێوەیەک ناهێڵێ ببەسترێتەوە بەو کۆمەڵە گەورەیەوە کە لەناوی‌دا دەژی، بەتایبەت کە هەستدەکا هێزی ڕێکخەری ئەو کۆمەڵە، پشتیوانی شێوازە سەرکوتکەرییەکانی ئەو سەرۆکهۆزەیە. لەبەرئەوە ئەو زیانە کە سیستەمی زەوی‌وزار و بەردەوامیی دەسەڵاتی سەرۆکهۆزەکان بەسەر کۆمەڵەوە گەیاندوویانە، قووڵ و یەکجار کاریگەرە.

## باسی دەیەم

### دۆخی زەویوزار

سیستەمی سەرۆکهۆزان، نەک هەر جووتیارانی میزۆپۆتامیای شەکەتکردووە، بەڵکوو کاریگی ویرانکەرانە و تێکدەرانەیشی کردووەتە سەر زەوی. سەرۆکهۆز، بەوپێیە کە لە بنەڕەتدا جەنگاوەریکی دەشتەکییە، کەمترین زانیاری یا بایەخپێدانی سەبارەت بە کشتوکاڵ هەبووە. ناتوانین نکووڵی لەوە بکەین کە ئەمە جووتیاریش دەگریتەوە، چونکە ئەویش پێوەندییەکی توندوتۆڵی بە زەوییەوە نییە و ڕۆژێک لە ڕۆژان وەرزێریکی شارەزا نەبووە. بەڵام بەردەوامیی سیستەمی سەرۆکهۆزەکان هەر نەبووە بە هۆی هەژارخستنی جووتیار، بەڵکوو نەیهیشت بە سەرکەوتوویی خۆی لەگەڵ زەوی بگونجێنێ، چونکە دەرگای هەر بیریک یا شێوازیکی تازەی کشتوکاڵی لە ڕووی جووتیاردا داخست. هەلومەرجی سروشتیی زەویش لە عیراق، وەک لافاوی بەردەوام کە لە ساڵی ١٩٥٦دا هێنرایە ژێر ڕکێف و شۆریی خاک، ڕەنگە کۆششی لێبڕاوانەی هەر دەزگایەکی کشتوکاڵیان گەرەکبێ. بەڵام سیستەمی سەرۆکهۆزان، بێڕایبڕ لەباریدانییە مامەڵە لەگەڵ ئەم ژینگەیە بکا.

خاک، بە هۆی ڕێوشوێنە ویرانکەرەکانی کشتوکاڵەوە، بەتایبەت لە ناوچەکانی ئاودێریی باشوور، بە درێژیی چل ساڵی دوایی بە شێوەیەکی نەگۆڕ ڕووی لە خراپی کرد. زەویی شۆرەکات بە جۆرێکی بەرچاو بەرفراوانبوو. هیچ هەوڵێکنەدرا تا ئەم زەوییانە ئاوبڕبکرێن، یا لە ڕووی کشتوکاڵییەوە چاک و لەبار بکرێن.[٢٩٠] ئەم زەوییانە بە زۆری چۆڵدەکرێن و سەرۆکهۆزانیش بە هەستێکی

---

[٢٩٠] لە کاتێکدا بەنداو لە سەردەمی پاشایەتیدا بە خێرایی بنیاتدەنرا بۆ زیادکردنی ڕووبەری زەویی کشتوکاڵی، پرۆژەکانی ئاوەچۆڕکردن و پاککردنەوەی زەویوزاری شۆرەکات تا رادەیێک لە گۆڕێدا نەبوون؛ هەرچەندە بنیاتنانی بەنداو و بەرزکردنەوەی ئاستی ئاو دەبوونە هۆی زیادکردنی شۆری لە زەویوزاری دەوروبەری بەنداودا، کە بە ڕوونی لە مونتەفیک و بەتایبەت ناوچەی ڕووباری غەڕاف دەبینران، پاش دروستکردنی هەردوو بەنداوی بیدعە و

تێکدەرانەوە ڕوودەکەنە زەوییتری بەیار. وا مەزەندەدەکرێ ٢٠-٣٠٪ی زەویی کشتوکاڵی لە ساڵانی دواییدا چۆڵکراین و بەرهەمی زەوییەکانیتریش لە ئەنجامی شۆرییەوە بە ڕێژەی ٢٠-٥٠٪ کەمیانکردبێ.[٢٩١]

دەتوانین پرۆسەی وێرانکردنی خاک بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە لیوای عەمارە ببینین، کە -وەک سەرنجمانداوە- چڕبوونەوەی موڵکایەتیی زەویی لە چنگی سەرۆکهۆزاندا تێدا بەهێزتر و چۆڵبوونی زەویشی لە دانیشتووان زیاترە. دۆخەکەی عەمارە لە ساڵانی پەنجا و چلدا زۆر پێچەوانەی ساڵانی یەکەمە، کە موڵکایەتیی زەویی سەرۆکهۆزی تێدا بەرەو بەهێزبوون دەچوو. پاش ئەوە و لە ١٩١٨ەوە بەرەوژوور، پاش چەند سەدەیەک بۆ یەکەمجار گاسن کەوتە هەڵدڕینی ئەم زەوییە و وەک جووتیاری عەرەب دەڵێ: «زەوی نوستبوو، ئێستە یەکەمجارە دەستی بە چاوهەڵێنان کردووە.»

ئەفسەرانی سیاسی لە سەرۆکهۆزان دەدوێن و دەڵێن: «ئەوانە ناز و نیعمەتی دەوڵەمەندییان بەسەردا ڕژاوە.»[٢٩٢] تەنانەت لە دوادواکانی ١٩٣٠دا، ئەو ڕاپۆرتانە کە لەبارەی عەمارەوە دەهاتن، وا وەسفیاندەکرد کە یەکێکە لە دەوڵەمەندترین و جوانترین لیواکانی عیراق.[٢٩٣] بەڵام ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٤٤ی موتەسەڕیف، تێڕوانینێکی سەبارەت بە ڕادەی وێرانیی لیواکە لا بەجێنەهێشتووین؛ نووسیویە: «جۆگەکانی ئاودێری بە قوڕ و لیتە داخراون و پاکنەکراونەتەوە. جۆگە ئاوبەرەکانیش ڕێکنەخراون و ئەو زەوییانەیش کە خوێ و شۆرە دایپۆشیون، چۆڵکراون.»[٢٩٤] سکاڵایکردووە و گوتوویە:

---

کووت. بڕوانە: محمود شوقي الحمداني، لمحات من تطور الري في العراق قديما وحديثا، مطبعة السعدون، بغداد، ١٩٨٤، ص٣٤٦. (و.ع)

291 Lord Salter, The Development of Iraq, A Plan of Action (London, Coxton Press, Ltd., For the Iraq Development Board, P. 193.

ئەم هەڵسەنگاندنانە لە ڕاپۆرتی کۆمیسیۆنی ئاوەدانکردنەوە و گەشەپێدانی بانکی نێودەوڵەتیدا هاتووە.

292 Unpublished Monthly Report by the Britain Administrative Inspector of Amarah for March 1930 daled 20th April, 1930, P. 5.

٢٩٣ ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ڕۆژی ١٩٤٤/٥/٩ی موتەسەڕیفی عەمارە بەم ناونیشانە: "ترکات العقود المباشرة.." ، ص٧.

٢٩٤ هەمان سەرچاوە، ل٣، ٣٣.

هەرچەندە تەنیا ١٨١ موڵکداری زەوی لە عەمارە هەیە، خاوەنی ٣,٦٤٧,٧٩٣ مشارەیە، لەوە ٣,١٣٧,٤٣٦ی لەبارە بۆ کشتوکاڵ. بەڵام -لە ڕاستیدا- تەنیا ٦٢٥,٨٩٤ مشارەی داچێندراو لەوێ هەیە، ئەوەیتر چەندەها ساڵە بەجێهێڵراوە.[٢٩٥]

ڕاپۆرتێکی ساڵی ١٩٥١یش لەبارەی عەمارەوە، نیشانیداوە کە ١٧٧ موڵکداری زەویی عەمارە لەو ساڵەدا خاوەنی ٣,٤٢٢,٧٣٣ مشارە بووە، لەوە ٢,٧٢٢,٥٠٤ مشارەی لەباربووە بۆ کشتوکاڵ، لە کاتێکدا ئەوان بەکردەوە تەنیا ٥٥٣,٦٨٦ مشارەیان داچاندووە. ڕاپۆرتی ئاماری کشتوکاڵیی ساڵی ١٩٥٢ی حکوومەتیش، ئاماژەی بۆ کردووە کە موڵکدارانی زەویی عەمارە خاوەنی ٣,٣٢٤,٢٤٦ مشارەن، هەر ٩٤٩,٤٤٢ی داچێندراوە و ١,٤٧٨,٥٧٢یشی بە بەیاری وازی لێهێنراوە. ڕاپۆرتەکە باسی ڕووبەری ٨٧٠,٦٤٢ مشارەیشی کردووە کە لەبارنییە بۆ کشتوکاڵ. هەرچی ژمارەکانی ساڵانی ١٩٤٤ و ١٩٥١یشن، سەبارەت بە زەویی بەکەڵکنەهاتوو بۆ کشتوکاڵ، بەرودوا ٦١٩,٥٠٩ و ٥٣٦,٧٠١ مشارەن. ئاشکرایە ئاماری حکوومی دەستەواژەی «زەویی بەیار» بەکاردێنێ، تا مانایەکی فراوانی هەمەلایەنەی بداتێ، لە کاتێکدا ئەم پۆلێنکردنە ڕێژەیەکی بەرزی زەویی چۆڵکراو دەگرێتەوە. ئەمەیش مەسەلەیەکی گرنگە، چونکە بەپێی ئاماری ١٩٥٢، لە کۆی ٢٥ ملیۆن مشارەی سەرجەمی ڕووبەری موڵکایەتییەکانی زەویوزاری کشتوکاڵی لە عیراق، تەنیا ١١,٥ ملیۆنی لەو ساڵەدا داچێندراوە، واتە دەکاتە ٤٧٪ی سەرجەمی ڕووبەرەکە؛ لە کاتێکدا ١١ ملیۆن مشارە دەستی لێنەدراوە و بە بەیاری ماوەتەوە، واتە ٤٤٪ ڕووبەری ٢,٥ ملیۆنیش بەوپێیە کە لەبارنییە بۆ کشتوکاڵ، بەجێهێڵراوە، واتە ڕێژەی ١٠٪ی سەرجەمی ڕووبەرەکە.[٢٩٦] ئەم ژمارانە هەرچەندێک ڕاستبن، گومان لەوەدانییە کە زەوی بە شێوەیەکی بەرفراوان پشتگوێخراوە و وێرانکراوە.

---

[٢٩٥] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ساڵی ١٩٥١ سەبارەت بە لیوای عەمارە، لە کتێبخانەی ئاسایشی بەغدادایە.

[٢٩٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، خشتەی ٤، ل١٧. کە ئەو ١١ ملیۆن مشارە زەویی داچێندراوە، هەر ١,٥، واتە ٧٪ی یا باخات یا زەویی تەرخانکراوە بۆ ڕواندنی داری بەردار، یان وەک ڕەز یا وەک لەوەڕگە بەکارهێنراوە.

هەل‌ومەرجی کۆمەڵایەتیی کشت‌وکاڵ، هەر دەبێ بکێشێتەوە بۆ ئەم ئەنجامە، چونکە ئەو جووتیارانە کە وەک کۆیلە دەژین و ئەو هەژارییە سەختە کە بەدەستیەوە دەناڵێنن، وایان لێ چاوەڕوان‌ناکرێ گەشە بە هیچ مشوورخواردنێکی ڕاستەقینەی زەوی بدەن. ئەمە جەختکردنەوەیەکی‌تری ڕاستیی وتەکەی مۆنتیسکیۆیە کە گوتوویە: «زەوی بە زەبری پیت و فەڕی سروشتیی خۆی، کەمتر لەوە بەرهەم‌دێنێ ئەگەر ئەوانە کە دایدەچێنن، ئازادبن.»[٢٩٧] هەروەها چڕبوونەوەی موڵکایەتیش لە چنگی ژمارەیەکی کەمی سەرۆکخێڵ‌دا، زیانی گەورە بە زەوی دەگەیێنێ. موتەسەڕیفی عەمارە لە ١٩٤٤دا نووسیویە: «سەرۆکهۆزەکان تەنیا خەمی دەرامەتی دەم‌ودەست و ڕاستەوخۆی زەوییانە، بەبێ ئەوەی پاشەڕۆژی زەوی یا کاریگەریی ڕەنێوهێنانی ستەمکارانەی ڕەچاوبکەن. ڕادەی بایەخ‌پێدان یا پشت‌گوێ‌خستنی زەوی، مەسەلەیەکە بە لای ئەوانەوە گرنگ‌نییە، چونکە خاوەنی چەندین ڕووبەری فراوانی زەوین، لە هەموو بارێک‌دا دەرامەتێکی زۆریان بۆ دەستەبەردەکا.»[٢٩٨]

باری دەروونی و چەمکە کۆمەڵایەتییەکانی چینی سەرۆکهۆزان، کۆسپ دەنێنە بەر پەرەپێدانی کشت‌وکاڵ. پێشتر دیمان چۆن بەرهەمی مەڵبەندەکانی موڵکی سەرۆکهۆز، لە ئەنجامی پەرەگرتنی ئامرازەکانی گواستنەوە و کرانەوەی بازاڕی جیهانییەوە لە بەردەم بەرهەمی عیراقی‌دا، بوون بە بەرهەمێکی بازرگانی. مەبەستمان ئەوەیە؛ ئیتر مەڵبەند وای لێ‌هات لەپێناوی بازاڕی بازرگانی‌دا بەرهەم بەدەستەوەبدا، نەک هەر بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی خێڵ، وەک لە سەدەکانی پێشوودا وەهابوو. بەڵام سەرۆکهۆزەکان پەرەیان بە گیانی بازرگانی -بە چەمکە تەواوەکەی- نەدا. ڕاستە -لە لایەکەوە- هەرگیز نەیانتوانی خۆ لەبەردەم هەڵپەی لەڕادەبەدەری پارەپەیداکردن‌دا بگرن و کاری تێ‌کردن، ئەفسەرانی سیاسیش

---

[٢٩٧] فەیلەسووفی فەرەنسەیی مۆنیسکیۆ، جوگرافیا و سیستەمە سیاسی و ئاینییەکانی پێکەوە بەستووەتەوە و جەختی‌کردووە کە زەوی‌وزاری دەشتایی و کشت‌وکاڵەکەی ژینگەیەکی لەبارن بۆ ستەمکاری و ملکەچی و شوێنکەوتەیی، لە کاتێک‌دا ئەو میللەتانە کە خەریکی کشت‌وکاڵ نین، بڕێکی زیاتری ئازادییان تێدایە. بڕوانە: فولغین ف.، فلسفه الأنوار، ترجمة هنريت عبودي، دار الطليعة، بيروت، ١٩٨١، ص٤٩. (و.ع)

[٢٩٨] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی موتەسەڕیفی عەمارە بە ناونیشانی: "تركات العقود المباشرة ..."، ص٦.

سەرسامبوون کە بینییان زۆر چاوچنۆکن بۆ پارە و بێئەندازە هەست بە هەموو شتێک دەکەن پێوەندیی بە گیرفانیانەوە هەبێ؛[٢٩٩] لە لایەکیترەوە، هەرگیز فێری هونەری پاشەکەوتکردن نەبوون. ئەوان زیاد لە پێویست بایەخ بە پاراستنی دیوە رووکەشەکانی سەرۆکایەتیی هۆز دەدەن، بە جۆرێک کە هەر برێکی کەم دەمێنێتەوە تا لە زەویدا رەنتویبێنن. فەرمانبەری ئینگلیزی بەرپرسی دەرامەت، لە ١٩٢٤دا هۆیەکانی کەمبوونەوەی دەرامەتی زەوییەکانی دەوڵەتی روونکردووەتەوە و نووسیویە: «ئەگەر سیاسەتی حکوومەت وا بخوازێ کۆنە سەرۆکهۆزەکان بهێڵرێنەوە، دەبێ پارەیەکی زۆر تەرخانبکرێ بۆ دابینکردنی دەستبڵاوییان لە خەرجیدا. هەرچەندە لەوانەیە بەکرێگرانی تازە کە لە چینێکی هاوشێوەی چینی بازرگانان کەوتوونەتەوە و هیچ رواڵەتێکی نەریتییان نییە هەوڵی پاراستنی بدەن، کرێی زیاتر بدەنە دەوڵەت.»[٣٠٠] بەڕێوەبەری گشتیی ژمێریاریی گشتیی عیراق هەڵسەنگاندنێکی بۆ بەجێهێشتووین، لەو رووەوە کە ١١٥ سەرۆکهۆزی شامییە و ئەبوسخێر چۆن داهاتی ساڵی ١٩٢٥ی خۆیان خەرجکردووە.

خشتەی ژمارە ٢٥ ئەم هەڵسەنگاندنە نیشاندەدا. نازانین تا چ رادەیەک ورد و تا چ رادەیەکیش راستە، بەڵام ئاشکرایە کە سەرۆکهۆزانی -بە رێژە- بچووکی فورات، ئەگەر پارە بە تێکرایەکی بەرزی سوود لە سوودخۆران قەرزنەکەن، ناتوانن هەر بەم دەرامەتەیان و بەو شێوەیە کە باری کۆمەڵایەتییان پێملیکردوون، بژین. رێژەی باوی سوود لە عیراق، ئاسایی ٣٠٪یە، ئەگەرچی هەندێ قەرزدەر تێکرایەکی سوود بە جۆرەها رێگەی پێچاوپێچ دەسەپێنن، رەنگە بگاتە ٦٠٪.[٣٠١] سەرۆکهۆزانی فورات، لەبەرئەوەی لە شارە پیرۆزە شیعەنشینەکانەوە نزیکن، زیاتر حەزدەکەن پارە بۆ زانایان و سادات و کاروباریتری ئاینیی خەرجبکەن. ئەمەیش کارێکی ناچارییە، چونکە بە پێچەوانەوە، کاردەکاتە سەر جێورێ و شانوشکۆیان لەناو کۆمەڵدا. لە کاتێکدا سەرۆکهۆزانی دیجلە ناچارنین بایەخێکی زۆر بە زانایان بدەن، بەڵام - سەرباری ئەوە- لەوەناچێ باری داراییان لە هیی سەرۆکهۆزانی فورات باشتربێ.

---

[٢٩٩] بۆ نموونە، بڕوانە:
Administration Reports of Amarah Division for the Year 1920-1921, p. 25.

[300] Great Britain, Colonial Office, Report on the Administration of Iraq, April 1924 to December 1923, P. 140.

[٣٠١] عبدالرزاق الهلالي، مشاكل الإئتمان الزراعي في العراق، بغداد، مطبعة النجاح، ١٩٥٧، ص٩١.

**خشتەی ژمارە ٢٥**

**خەرجیی مەزەندەکراوی ١١٥ سەرۆکهۆز لە سەرۆکهۆزانی**

**هەردوو قەزای شامییە و ئەبوسخێر لە ١٩٢٥دا[٣٠٢]**

| | بە هەزاران ڕووپی | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| پوختەی مەزەندەکراوی هەموو داهات | ٢.١٢٢ | ١٠٠ |
| خەرجیی مەزەندەکراو: | | |
| خەرجیی میوان | ٢١٢ | ١٠ |
| خەرجیی ژنەکان و منداڵان | ٤٢٤ | ٢٠ |
| خەرجیی زانایان و سادات، وەک زەکات و شتیتر | ٥٣١ | ٢٥ |
| خەرجیی زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان | ٣١٨ | ١٥ |
| سوودی قەرزکردن لە بازرگانان | ٦٣٧ | ٣٠ |

ئەم سەرۆکهۆزانە بە درێژیی ساڵانی بیست و تا هەڵوەشاندنەوەی باجی ڕاستەوخۆی سەر زەوی لە ١٩٣١دا، دادوبێدادیان بوو کە ناتوانن دەرامەتی داواکراوی حکوومەت بدەن، لەبەرئەوە حکوومەت بەپێی قانوونی ژمارە ٤١ی ساڵی ١٩٢٧ی دەسەڵاتبەخشین بۆ کەمکردنەوەی باجی زەویوزار و قانوونی ژمارە ٥٥ی ساڵی ١٩٢٩ی یەکلاکردنەوەی قەرزە دواکەوتووەکان، زۆری قەرزەکانی خۆی لەسەریان سڕییەوە.[٣٠٣]

فەرمانبەرە کارگێڕییەکانیش پێیان وایە: «سەرۆکهۆزەکان ڕێژەیەکی زۆری داهاتیان بۆ ژنان و کوڕان و تەنانەت خزمە دوورەکانیشیان خەرجدەکەن.»[٣٠٤] گزیر، بە شێوەیەکی تایبەت زۆر کاردەکاتە سەر داراییی سەرۆکهۆزانی دیجلە. تەنانەت سەرۆکهۆزی خاوەن موڵکایەتییەکی مامناوەند لە سەرۆکهۆزانی ئەلبومحەمەد، ساڵێکیان داهاتەکەی گەیشتە ٧٣٧ تەن چەڵتووک، ١٧٧ تەن (واتە

---

[٣٠٢] أحمد فهمي، مدير عام الحسابات العامة، تقرير حول العراق، ص١٠٥-١٠٦.

[٣٠٣] بۆ زانینی کورتە وەسفێکی ناوەڕۆکی ئەم قانوونە، بڕوانە:
Great Britian, Colonial office, Report on the Progress of Iraq, 1921-1931, P. 123.

[٣٠٤] ڕاپۆرتی مانگانەی بڵاونەکراوەی نیسانی ١٩٣٠ی پشکنێری کارگێڕیی عەمارە، ٣٠ی مایسی ١٩٣٠، ل١٦.

٢٤٪)ی دەرخواردی گزیرەکانی دا.[٢٠٥] ئەمە دەریدەخا کە سەرۆکهۆزەکان تا چ ڕادەیەک پشت بە پۆلیسە چەکدارەکانیان دەبەستن، بۆ ئەوەی پیاوانی خێڵەکەیان لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بهێڵنەوە.

سەرۆکهۆزەکانیش، وەک چینێک، بە هەمان شێوە بەرەنگاری هەر تازەکردنەوەیەکی بواری کشتوکاڵ بوونەوە، هەموو هەوڵێکیان لە بەرهەمهێنانی دانەوێڵەدا چرکردەوە و دیارە هەر چەند کەسێکی کەمیان ڕازیبوون بەرهەمهێنانی بەروبوومی تازە تاقیبکەنەوە. شارەزایانی بیانیی سەر بە وەزارەتی کشتوکاڵ، کۆڵیان دا و نەیانتوانی هاوکاریی ئەو سەرۆکهۆز و ئاغایانە زامنبکەن کە قایلنەبوون کەڵک لە بەروبوومی تازە وەربگرن و بەرهەڵستیی ڕێنیشاندانی کشتوکاڵی و توێژینەوەیان کرد.[٢٠٦]

شارەزایەکی ڕێکخراوی خۆراک و کشتوکاڵ[٢٠٧] (F. A. O.) لە نامەیەکیدا بۆ وەزارەت، هەڵوێستی جووتیاران و سەرۆکهۆزانیشی بەرامبەر بە موڵکدارانی زەویی لیوای کووت سەبارەت بە بەکارهێنانی بەروبووم یا پەیینی کیمیاییی تازە (سەماد) ڕوونکردووەتەوە و دەرکەوتووە موڵکداری زەوی «گوێ بە داهێنانە تازەکان نادا، بەڵام جووتیارانیش هیچ هەڵوێستێکیان بەرامبەری نییە.» جووتیاران حەزیاندەکرد پەیینی کیمیایی بەکاربێنن، بەڵام پارەیان نەبوو بیکڕن، «لە کاتێکدا -لە لایەکیترەوە- موڵکداری زەوی پێی وایە ئەم سەرمایەخستنەوەیە مەترسیی تێدایە.» پسپۆڕان بۆیان دەرکەوتووە جووتیاران -بەگشتی- زیاتر بەپیر بۆچوونی تازەوە دەچن. لەوانەیە هۆی ئەم بەپیرەوەچوونە هەلومەرجی تایبەتی جووتیاری عیراقی بێ، چونکە ئەو دێیە کە تێیدا دەژیا، وەک هیی وڵاتانیتر سەقامگیرنەبوو و دێیەکەی زیاتر لەوە دەچوو یەکەیەکی شیاوی جێگۆڕکێی ڕاهاتوو بێ؛ هەر لەبەر پێکهاتە خێڵەکییەکەی نا،

---

[٢٠٥] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ٩ی مایسی ١٩٤٤ ی موتەسەڕیفی عەمارە، بە ناونیشانی: "ترکات العقود المباشرة.. "، ص٢٤.

[٢٠٦] بەڕێز پیتەر ڤاندەرڤین Peter Vandarveen کە پسپۆڕێکی هۆڵەندایییە و کارەکەی خرابووە سەر وەزارەتی کشتوکاڵ، لە تشرینی دووەمی ١٩٥٧دا ئەوەی پێڕاگەیاندم.

[٢٠٧] پسپۆڕەکەی ڕێکخراوی خۆراک و کشتوکاڵ (F.A.O. )، بەڕێز A. J. Mocrisە و نامەکەیش هیی شوباتی ١٩٥٧ە و بۆ بەڕێوەبەری ڕێنیشاندانی کشتوکاڵی لە وەزارەتی کشتوکاڵ نووسراوە و لە فایلی شارەزایانی کشتوکاڵیی وەزارەتدا پارێزراوە.

بەڵکوو لەبەر ئەو لافاوە بەردەوامانەیش کە جووتیاران هەڵدەپێچن هەمیشە خۆیان لەگەڵ هەلومەرج و بارودۆخە تازەکە بسازێنن.

خەوشەکانی سیستەمی سەرۆکایەتیی هۆز کە تا ئێستە وتوویژمان لەبارەوە نەکردوون و چەند لیوایەکی عیراقیشیان تێدا هاوبەشە، هەر خۆیان ئەوەیان پێ لێکنادرێتەوە کە بۆچی دەبوو عەمارە داکەوتنی ئاستی کشتوکاڵی تێدا زیاتر ڕوون و بەرچاو بێ؟! بەشێکی هۆیەکانی ئەوە -وەک دەبینین- لەوەدایە کە چەندەها ترومپای زیاتر بە خێرایی لەسەر دیجلە دانران، چونکە ڕێدرا موڵکدارانی زەویی کووت و بەغدا ژمارەیەکی زۆر ترومپا دابنێن، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی‌بکەن چ سەرەنجامێکیان بۆ کشتوکاڵی عەمارە دەبێ. لەو ٥,٢٦٤ ترومپایەی هەموو عیراق لە (١٩٥٦-١٩٥٧)دا، هەر کووت خۆی خاوەنی ٨٨٠ ترومپا و بەغدایش ١,٥٤٧ بوو، کە ١,١٩٩یان لەسەر ڕووباری دیجلە بوو، واتە ٤٠٪ی هەموو ترومپاکانی عیراق لەسەر ڕووباری دیجلە دابەسترابوون. لە ١٩٣٠دا، کە ئەوسا تەنیا ١,٢٤٨ ترومپا لەسەر دیجلە و باکووری عەمارە هەبوو، پشکنێری کارگێڕیی عەمارە پێی وابوو دەبێ بە ناچاری سەرنجی ئەو ڕاستییە بدرێ کە: «پێش تەشەنەکردنی دانانی ترومپاکان، ڕووباری دیجلە -بە هەموو مانایەکی وشەکە- هەر چەمێکی هاوینەی عەمارە بوو و گەشەکردنیشی بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی بەم ڕاستییە دەبەست. وای لێهات دانانی ترومپای زیاتر، هەڕەشەی گۆڕینی هەموو ئەوانە بکا، لە کاتێکدا بڕێکی گەورەی ئاو لە باکووری عەمارە هەڵدەکێشرێ و ژمارەی ترومپاکانیش بەبێ بەربەست دەبنە دووئەوەندە. عەمارە چیی لێ بەسەردێ؟ لەوە ناچێ حکوومەت ڕێگەبدا ئەم دۆخە لە یەکێک لە دەوڵەمەنترین لیواکانی‌دا ئاڵۆزتربێ، چونکە دەبێتە هۆی تێکدانی ئەم لیوایە، یا هانی خەڵکی‌تر دەدا ترومپا گرانبەهاکانی ئاودێری دابنێن و نەهێڵن ئاو بە ئازادی بگاتە عەمارە.»[٣٠٨]

بەڵام وا دیارە موڵکداران و سەرۆکهۆزانی بەغدا و کووت، لە سەرۆکهۆزانی عەمارە و -وێڕای ئەوە- کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنی ترومپاکانیش زیاتر، لە ڕووی سیاسییەوە، لای دەسەڵاتدارانی بەغدا دەستیان دەڕۆی. پشکنێری کارگێڕی لە شوێنێکی‌تری ڕاپۆرتەکەی‌دا پرسیویە: «سیاسەتی حکوومەتی عیراق بەرامبەر بە

---

[٣٠٨] ڕاپۆرتی مانگانەی بڵاونەکراوەی مارتی ١٩٣٠ی پشکنێری کارگێڕیی ئینگلیز لە عەمارە، ١٩٣٠/٣/٢٠، ل٤-٥.

پیشەسازیی بەرهەمهێنانی برنج چییە؟ لەوانەیە تەنانەت پاش تێپەڕینی دە ساڵیش هێشتا هەر سەرقاڵی سیاسەت بێ، بەبێ ئەوەی هیچ سیاسەتێکی تایبەت بە بەرهەمهێنانی برنجی هەبێ. بەڵام لە هەموو حاڵوبارێکدا و کە ساڵێک لەمەوبەر مەسەلەی ئاوگەیاندن بە عەمارە لە هاویندا خراپە بەر باس، وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری تێڕوانینی خۆی سەبارەت بە مەسەلەی مەرەزە خستەڕوو. ئاشکرایە وەزارەت -بە هەموو دڵنیاییەکەوە- مەرەزەکردن ڕەتدەکاتەوە و وا دیارە پادشایانی مەرەزەیش لە عەمارە، کارەکەیان بە توندی ڕەتکرایەوە و وەزارەت گوتی: ئەوانە بڕەئاوێکیان دەستدەکەوێ، بەسە بۆ داچاندنی بەروبوومیتری جگە لە مەرەزە بەکاریبێنن. وا دیارە پادشایانی ترومپاکان لە بەغدا و کووت سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە.»[309]

دانانی ترومپای زیاتر، بە دروستکردنی بەنداوی کووت لە ۱۹۳۹دا، کە ڕووی برێکی گەورەی ئاوی پێکرایە زەویوزاری گەورە سەرۆکهۆزانی سەر غەراف، کاریگەرتربوو. لە ئەنجامدا، هەندێ جۆگەی ئاودێری لە عەمارە وشکبوو و سەرۆکهۆزانیش ناچاربوون پەنا ببەنە بەر بەکارهێنانی ترومپا گرانبەهاکان بۆ ئاودانی زەوییەکانیان و ژمارەی ترومپاکانی عەمارەیش لە ۱۰۵ەوە ساڵی ۱۹۲۹[310] زیادبوو بۆ ٤٦٢ لە ١٩٥٦-١٩٥٧دا.[311] ئەمەیش کاریگەریکرد، مامەڵەیەکی زیاتر زەوتکەرانە لە ڕووی بەکرێدان یا پشکی بەروبوومەوە، لەگەڵ جووتیار بکرێ.

سەرەڕای ئەوە، ناتوانین بڵێین هۆی سەرەکیی وێرانیی عەمارە، ئەوەندەی بەکارهێنانێکی بێسەروبەری ئاوە، ئەوەندەیش کەموکووڕیی ئامرازەکانی ئاوگەیاندنە، لەبەرئەوە سەرۆکهۆزەکان بەردەوام پەنایاندەبردە بەر دروستکردنی بەنداو و بەنداوەکانیشیان لە سەراوردی چەمەکان و شوێنی جوێبوونەوەی لقە جۆگەکانی ئاودێری دادەنان و ئاویان دەبڕی لەو زەوییانە کە ئەم جۆگانە ئاویاندەدان. ئەم ڕەفتارە بە زۆری کێشایەوە بۆ وشکبوونی جوگەکانی ئاو.

ڕەفتارێکیتری زیانبەخشی سەرۆکهۆزەکان، بریتیبوو لە ژێرئاوخستنی زەویوزار و بەرەڵاکردنی ئاوەکە، پاش ئاودانی کێڵگە و مەزراکانیان، بەرەو

---

[309] Ibid, P. 8.

[310] ڕاپۆرتی بڵاونەکراوەی ئابی ۱۹۲۹ی پشکنێری کارگێڕیی عەمارە، ۱۹۲۹/۹/۲۰.

[311] الجمهورية العراقية، وزارة الإقتصاد، موجز إحصائي، ۱۹۵۷و جدول رقم ۸۹، ص۷۱.

چەند جۆگەیەکی خۆجێیی ئاوبەردانەوە و وازلێهێنانی، تا بەپێی ئاستی زەوی ڕێگە بۆ خۆی بکاتەوە. بەشێکی زۆری ئەم جۆگانەی ئاوبەردانەوە، ئەوەندەی ڕووباری ئاودابەشکردن گەورەیە. ئەمە زانیارییەک سەبارەت بە قەبارەی ئاوی لەدەستدراو دەخاتە بەرچاو. چەندین ڕووبەری پان و بەرینی زەویی لەبار بۆ کشتوکاڵ، بەم ڕێگایانە تێکدرا. هەندێ سەرۆکهۆز بەدەست ئاوزۆرییەوە و هەندێکی‌تریش بەدەست کەمئاوییەوە گیروگازیان‌بوو و نەیانتوانی هاوکاریی یەکتر بکەن. موتەسەڕیفی عەمارە لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٤٤دا[٣١٢] ئاماژەی پێداوە کە شەتاوی حللەی لقێکی فورات و دابینکەری ئاوی هەموو زەوییەکانی لیوای حللە، جگە لە زەوییەکانی قەزای موسەییەب و ٣٥٪ی زەوییەکانی دیوانییە، هەر ٢٠٠م³ ئاوی لە چرکەیەکدا بەرکەوتووە. لە کاتێکدا جۆگەی کەحلائی لقێکی دیجلە لە عەمارە ساڵی ١٩٤٢، ٤٠٠م³ ئاوی لە چرکەیەکدا بەردەکەوت و تەنیا بەشی دوو سەرۆکهۆز بوو، هەمیشە ناکۆکییان هەبوو لەسەر ئاودابەشکردن و زۆر بەگازندەبوون کە ئاو بەشی‌نەدەکردن. بە هەمان شێوە، جۆگەی بوتێرە (البتیرة) لە عەمارە، ساڵی ١٩٤٢، ٧٢٢م³ی لە چرکەیەکدا وەردەگرت و دوو سەرۆکهۆزی زۆر ناکۆکی خێڵی ئوزێرج دەستیان بەسەرداگرتبوو.[٣١٣] وا دیارە ناکۆکیی سەر چەمی بوتێرە، بووبێتە بەشێکی نەریتە میراتییەکان، چونکە باوکانی ئەو سەرۆکهۆزانە گیرۆدەی هەمان گیروگرفت بوون. پشکنێری کارگێڕی لە ١٩٢٩دا نووسیویە: «شێخ سەلمان مونشید هاواریەتی بەدەست ئاوزۆرییەوە و دەبێ بکەوێتە چاکسازیی بەنداوی گەورەی ئومزۆرە (أم زورة)، تا زەوییە مەرەزەتێداکراوەکانی ژێرئاونەکەون. لەوە دەچێ بەبێ یاریدەی شەوای (شواي)ی دراوسێی کە حەزناکا دەستی یارمەتیی بۆ درێژبکا، نەتوانێ ئەوە بکا.»[٣١٤]

هەلومەرجی هاوشێوە لە چەند لیوایەکی‌تریش هەیە، کە سەرۆکهۆزەکانی لەسەر دەستبەسەرکراون. زۆرجار ڕوویداوە، ئەو سەرۆکهۆزانە کە دەسەڵاتی ئاوبەردانەوەیان هەیە بۆ دراوسێکانیان، لەبەر چەند هۆیەکی

---

[٣١٢] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ڕۆژی ٩ی مایسی ١٩٤٤ی موتەسەڕیفی عەمارە، ل١١.

[٣١٣] هەمان سەرچاوە، ل١١.

[٣١٤] ڕاپۆرتێکی بڵاونەکراوەی ١٩٢٩ی پشکنێری کارگێڕیی ئینگلیز لە عەمارە، ڕۆژی ١/٤/١٩٣٠، ل١٣.

دیاریکراو، بەرهەڵستیی ئەو دراوسێیانەیان دەکەن؛ ئەم جۆگانە دادەخەن، تا بیسەلمێنن بەرهەڵستیانن و بەوەیش بەروبوومەکە لەناودەبەن.[٣١٥]

لێرەوە خەسڵەتە هەڵاواردەکانی ئەو سیستەمی سەرۆکایەتیی هۆزەی سەردەمەکە بریتین لە: دەستبڵاوی و تەخشانوپەخشانکردن و بێتوانایی لە ڕەنێوهێنانی زەوی‌دا و بایەخدانی زیاتر بە دەرامەتی دەستبەجێ و بەرەنگاریی هەر داهێنان یا تازەکردنەوەیەک و بێسەروبەر بەکارهێنانی ئاو و شێوازە وێرانکەرەکانی کشتوکاڵ و پشتگوێخستن و هەژارخستنی زەوی. بەوپێیە، تێچوویەکی زۆر، نەک هەر لەسەر مرۆڤ خۆی، بەڵکە لەسەر سەرچاوە ماددییەکانیش کەوت، بە شێوەیەک کە دەبوو ملێونەها عیراقی هەموو ئەوانە لەپێناوی بەردەوامیی بووژانەوەی ژیانی تەنیا چەند سەد سەرۆکهۆزێک‌دا دەرببەن!

---

[٣١٥] بۆ نموونە بڕوانە: ڕاپۆرتی نهێنیی هەواڵگریی ژمارە ١٧ی ڕۆژی ١ی ئەیلوولی ١٩٢٢، بڕگەی ٨٥٢؛ ڕاپۆرتی ژمارە ٣ی ڕۆژی ٩ی ئەیلوولی ١٩٢٤، بڕگەی ٨٥٢؛ ڕاپۆرتی ژمارە ٣ی ڕۆژی ٧ی ئەیلوولی ١٩٢٤، بڕگەی ٢٣٤.

# پاشکۆ

**(١)**

**خشتەی ژمارە ١**

## دەرامەتەکانی حکوومەتی عیراق بە بەراورد لەگەڵ سەرچاوەکانی‌تری دەرامەت لە ماوەی نێوان ١٩١١-١٩٥٥دا[٣١٦]

**(بە هەزاران دینار)**

---

[٣١٦] وەرگیراوی ژمارەکانی ١٩١١ لە گۆڤاری ساڵانەی ئامارەوە، لە:
Great Britain, Colonial Office, Reports on Administration of Iraq April 1923-December 1924, pp. 133-135.

ژمارەکانی ١٩١٨ لە: Gertyude Bell, Reports of Civil Administration, p. 119.

ژمارەکانی ١٩١٩ لە: Philip Drelaged, Study of Political Development, p. 126.

ژمارەکانی داهاتی زەویی ١٩٢٠ لە:
Great Britain, Reports on the Administration of Iraq for 1922-1923, p. 100.

ژمارەکانی گومرگ و باجی ١٩٢٠-١٩٢١ لە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٢؛ ١٩٢٢-١٩٢٣ لە:
Great Britain, Reports on the Administration of Iraq for 1923-1924, 1925-1926, pp. 128, 89 and 87 respectively.

ژمارەکانی داهاتی زەوی و باجی ئاژاڵ (کودە)ی ١٩٢١-١٩٢٥ لە:
Reports on Administration of Iraq, p. 91.

هەموو ژمارەکانی ١٩٢٦-١٩٣٠ لە:
Reports on Administration for the Years 1927, 1928, 1929, 1930 and 1931, pp 48-49, 71, 86, 94, 95 respectively.

هەموو ژمارەکانی ١٩٣٤-١٩٤٠ لە: أحمد عبدالباقي، ميزانية الدولة العراقية، القاهرة، دار الكتاب العربي، ١٩٤٧، ص٦٢، ٦٥، ٧٥.

ژمارەکانی داهاتی نەوتی ١٩٣١-١٩٥٠ لە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨؛ المديرية العامة للحسابات العراقية، التقرير السنوي عن حسابات الدولة العراقية لـ١٩٥٠، بغداد، مطبعة الحكومة، ١٩٥٦، ص٦٠.

هەموو ژمارەکانی ١٩٤١-١٩٥٠ لە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨؛ ١٩٥٠-١٩٥٤ لە: المديرية العامة للحسابات، التقرير السنوي لعام ١٩٥٤، ص٦٣. ژمارەکانی داهاتی نەوتی ١٩٥١-١٩٥٥ لە: المجلة الدورية للبنك الوطني العراقي، العددان ١٥ و٢٥، تموز-أيلول ١٩٥٥ وتموز- أيلول ١٩٥٧، ص٣٣-٣٥ وص٣٣-٣٥ على التوالي.
هەموو ژمارەکانی ١٩٥٥ لە وەزارەتی دارایی، بەغدا.

| سال | سەرجەمی دەرامەت | دەرامەتی زەوی | ڕێژەی سەدی | باجی سەر ئاژاڵ | ڕێژەی سەدی | دەرامەتی نەوت | ڕێژەی سەدی | بارانەی گومرگ | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١. ماوەی حوکمی تورکی | | | | | | | | | |
| ١٩١١ | ١٦٥٠ | ٧٣١ | ٤٤,٣ | ١٧٩ | ١٠,٨ | | | ٤١٠ | ٢٤,٨ |
| ٢. ماوەی حوکمی ئینگلیز- قۆناغی داگیرکاری | | | | | | | | | |
| ١٩١٨ | ٢١٩٨ | | ١١٨١ | | ٥٣,٧ | | | ٤٨٧ | ٣٢,١ |
| ١٩١٩ | | | ١٣٦٧ | | ٣٦,٧ | | | ١٦٥٢ | ٤٤,٤ |
| ١٩٢٠ | | | ١٢٩٧ | | ٢٤,٩ | | | ٢٠٣٢ | ٣٩,١ |
| ١٩٢١ | | ١٠٩٦ | ٢٧,٦ | ٢٠٤ | ٥,٢ | | | ١٧٣٥ | ٤٣,٧ |
| ٣. ماوەی ئینتیداب | | | | | | | | | |
| ١٩٢٢ | ٣٥٦٠ | ٨٢٦ | ٢٣,٢ | ٢٠١ | ٥,٦ | | | ١٦٠٤ | ٤٥,٠ |
| ١٩٢٣ | ٣٨٢١ | ٨١٦ | ٢١,٣ | ٢٣٠ | ٦,٠ | | | ١٨١٤ | ٤٧,٤ |
| ١٩٢٤ | ٣٩٥٥ | ٨٤٧ | ٢١,٤ | ٢٤٧ | ٦,٢ | | | ١٨٦٧ | ٤٣,٦ |
| ١٩٢٥ | ٤٣٥٨ | ١١١٤ | ٢٥,٥ | ٢١٥ | ٤,٩ | | | ١٩٠٣ | ٤٣,٦ |
| ١٩٢٦ | ٤٢٥٢ | ٩٨٢ | ٢٣,٠ | ٢٥٣ | ٥,٩ | | | ١٨٩٥ | ٤٤,٥ |
| ١٩٢٧ | ٤٤٣٢ | ٩٨٤ | ٢٢,٢ | ٢٧٢ | ٦,١ | ٨ | ٠,١ | ٢٠٦٣ | ٤٦,٥ |
| ١٩٢٨ | ٤٤٥٨ | ١٠١٦ | ٢٢,٧ | ٣١٥ | ٧,٠ | ١٢ | ٠,٢ | ٢٠٦٤ | ٤٦,٢ |
| ١٩٢٩ | ٤٣١٠ | ٨٦٦ | ٢٠,٠ | ٢٩٧ | ٦,٨ | ١٤ | ٠,٣ | ٢٠٦٠ | ٤٧,٧ |
| ١٩٣٠ | ٣٤٨٤ | ٤١٠ | ١١,٧ | ٢٩٩ | ٨,٥ | ١٥ | ٠,٤ | ١٧٦٥ | ٥٠,٦ |
| ١٩٣١ | ٤٢١٩ | ٤٠١ | ٩,٥ | ٢٦٢ | ٦,٢ | ٨٦٩ | ٢٠,٥ | ٢٠٣٣ | ٤٨,٢ |
| ١٩٣٢ | ٤٢١٥ | ٣٩٦ | ٩,٤ | ٢١١ | ٥,٠ | ٥٢٤ | ١٢,٤ | ١٩٣١ | ٤٥,٨ |
| ٣. ماوەی سەربەخۆیی | | | | | | | | | |
| ١٩٣٣ | ٤١٤٩ | ٤١١ | ٩,٩ | ١٩٢ | ٤,٦ | ٥٣٦ | ١٢,٩ | ٢٠٤٧ | ٤٩,٣ |
| ١٩٣٤ | ٥٠٢٣ | ٤٥٧ | ٩,٠ | ٢٠٥ | ٤,٠ | ٩٨٩ | ١٩,٦ | ٢٣٠٣ | ٤٥,٨ |
| ١٩٣٥ | ٥٣٥٧ | ٤٤٣ | ٨,٢ | ٢١٦ | ٤,٠ | ٥٩٨ | ١١,١ | ٢٥٠٣ | ٤٦,٧ |
| ١٩٣٦ | ٦٠٢٧ | ٦٣٦ | ١٠,٣ | ٢٧٨ | ٤,٦ | ٦٠٠ | ٩,٩ | ٢٨٢٣ | ٤٦,٨ |
| ١٩٣٧ | ٦٩١٧ | ٦٤٤ | ٩,٣ | ٢٤٢ | ٣,٤ | ٧٣١ | ١٠,٥ | ٣٣١١ | ٤٧,٨ |
| ١٩٣٨ | ٧٨٣٨ | ٦٠١ | ٧,٦ | ٢٥١ | ٣,٢ | ١٩٧٧ | ٢٥,٢ | ٣٢٦٠ | ٤١,٥ |
| ١٩٣٩ | ٩٢٠٨ | ٦٥٢ | ٧,٠ | ١٩٠ | ٢,٠ | ٢٠١٤ | ٢١,٨ | ٣٣٨٨ | ٣٦,٧ |
| ١٩٤٠ | ٩٧١٨ | ٧٥٢ | ٧,٧ | ٣٠٩ | ٣,١ | ١٥٧٦ | ١٦,٢ | ٣١٣٦ | ٣٢,٢ |
| ٤. ماوەی گەڕانەوەی داگیرکاریی ئینگلیز | | | | | | | | | |
| ١٩٤١ | ١٠١٥٥ | ٨٠٢ | ٧,٨ | ٣٠٤ | ٢,٩ | ١٥٣٤ | ١٥,١ | ٣٢٧٣ | ٣٢,٢ |
| ١٩٤٢ | ١٣٨٢٧ | ١٧١٤ | ١٢,٤ | ٤١٥ | ٣,٠ | ١٥٧٦ | ١١,٤ | ٤٥٠٥ | ٣٢,٥ |
| ١٩٤٣ | ١٨١٠٥ | ٣٢١٤ | ١٧,٧ | ٦٦٦ | ٣,٦ | ١٨٨٠ | ١٠,٣ | ٤٣٢١ | ٢٣,٨ |
| ١٩٤٤ | ١٨٨٩٧ | ٣٣٣٤ | ١٧,٧ | ٧٦٨ | ٤,٠ | ٢٢٢٥ | ١١,٧ | ٥٦١٩ | ٢٩,٧ |
| ١٩٤٥ | ٢٠٢٢١ | ٢٨١٣ | ١٣,٩ | ٨٥١ | ٤,٢ | ٢٣١٦ | ١١,٤ | ٤٦٦٤ | ٢٣,٠ |
| ١٩٤٦ | ٢٥٠٩٧ | ٣٥٤٦ | ١٤,١ | ٨٠٣ | ٣,١ | ٢٣٢٧ | ٩,٣ | ٧١٨٠ | ٢٨,٦ |
| ٥. ماوەی گەڕانەوەی سەربەخۆیی | | | | | | | | | |
| ١٩٤٧ | ٢٦٠١٢ | ٢٨٣٥ | ١٠,٨ | ٧١٠ | ٢,٧ | ٢٣٤٦ | ٩,٠ | ٨٨٥١ | ٣٤,٠ |
| ١٩٤٨ | ٢٦٧٢٢ | ٣٠٣٧ | ١١,٣ | ٧٩٩ | ٢,٧ | ٢٠١٢ | ٧,٥ | ٩٨٠٠ | ٣٦,٦ |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٩ | ٢٨٦٣٣ | ٣٢٣٦ | ١١,٣ | ٨٠٠ | ٢,٧ | ٣٢٢٨ | ١١,٣ | ١١٢٩٥ | ٣٩,٤ |
| ١٩٥٠ | ٣٣٤٩٤ | ٣٩٦٣ | ١١,٥ | ١٠٢٣ | ٣,٠ | ٥٢٨٦ | ١٥,٧ | ١٣٤٦٨ | ٤٠,٢ |
| ١٩٥١ | ٤٥٠٠١ | ٣٦٦٥ | ٨,١ | ٩٠٤ | ٢,٠ | ١٣٢٩٥ | ٢٩,٥ | ١٣٦٤٢ | ٣٤,٧ |
| ١٩٥٢ | ٧٤٥٤٢ | ٣٠٥١ | ٤,٠ | ٨٠٥ | ١,٠ | ٣٢٤٠٥ | ٤٣,٤ | ١٥٥٠٤ | ٢٠,٧ |
| ١٩٥٣ | ٨٢٩٩٨ | ٢٨٦٦ | ٣,٤ | ٦٢٥ | ٠,٧ | ٤٩٨٦٧ | ٦٠,٠ | ١٨٧٨٤ | ٢٢,٦ |
| ١٩٥٤ | ٩٢٩٠٨ | ٢٧٨٨ | ٣,٠ | ٤٤٧ | ٠,٤ | ٥٧١٩٩ | ٦١,٥ | ٢١٧٢٤ | ٢٣,٣ |
| ١٩٥٥ | ١٢٦٠٤٨ | ٢١٦٣ | ١,٧ | ٣٨٨ | ٠,٣ | ٨٤٤٠١ | ٦٦,٩ | ٢٥٣١٩ | ٢٠,٠ |

**خشتەی ژمارە ٢**

## پەسەندترین مامەڵەی کێشەکانی باجی سەر گەورە سەرۆکهۆزان و لایەنگران

| ناوی لیوا | ستوونی ١ | | ستوونی ٢ | | ستوونی ٣ | | ستوونی ٤ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | دەرامەتی ساڵی ١٩١٨ی زەوی | | دەرامەتی ساڵی ١٩٢٨[٣١٧]ی زەوی | | دەرامەتی ١٠ مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٢٨ی زەوی[٣١٨] | | دەرامەتی ١٠ مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩ی زەوی | |
| | بە لەک[٣١٩] | بە هەزاران دینار | بە لەک | بە هەزاران دینار | بە لەک | بە هەزاران دینار | بە لەک | بە هەزاران دینار |
| دیوانییە | ٣٣,٠٥[٣٢٠] | ٢٤٩ | ١٩,٩٢ | ١٥٠ | ١٨,٣٤ | ١٣٨ | ١٤,١٣ | ١٠٦ |
| دیالە | ١٠,٤٤[٣٢١] | ٧٨ | ١٠,١٩ | ٧٦ | ٨,٨٥ | ٦٦ | ٦,٩٤ | ٥٢ |
| کووت | ٤,٧١[٣٢٢] | ٣٥ | ٣,٤٨ | ٢٦ | ٣,٢٥ | ٢٤ | ٢,٩٤ | ٢٢ |
| عەمارە | ١٥,١٦[٣٢٣] | ١١٤ | ٢٥,٧٩ | ١٩٣ | ١٨,٣٧ | ١٣٨ | ١١,٠٢ | ٨٣ |

---

٣١٧ الحكومة العراقية، وزارة المالية، التقرير السنوي عن عمليات قسم الايرادات في وزارة المالية للسنة المالية ١٩٢٨-١٩٢٩، ص‌ص٣٠-٣١.

318 Great Britain, Colonial Office, Reports of HBB.M.G. to the Council of the L. of N. on the Administration of Iraq for 1918, p. 99.

٣١٩ لەک: سەدهەزار رووپیی هیندی.

٣٢٠ ژمارەکانی لیوای دیوانییە ١٩,٦٩ لەک و لیوای سەماوە ١,٤٥ لەک و شامییە ١٢,٩١ لەک دەگرێتەوە، لە Reports of Administration for 1918, I, pp. 208-216 وەرگیراون.

321 Reports of Administration for 1918, I, pp. 16-17 and 51.

322 Reports of Administration for 1918, I, pp. 346-347.

323 Ibid, p. 322.

**خشتەی ژمارە ٢: تەواوکەر**

| ناوی لیوا | ستوونی ٥<br>زەویی داچێندراوی مەزەندەکراو لە ١٩٣٠دا بە کم[٣٢٤] | ستوونی ٦<br>زەویی تاپۆ[٣٢٥] | ستوونی ٧<br>خەمڵاندنەکانی باجی سەر زەویی تاپۆ لە رووی تیۆرییەوە[٣٢٦] | ستوونی ٨<br>تێکڕای لەبەرگیراوی پشکی دەوڵەت لە زەوییەکانی میری، پێش قانوونی ٤٢ی ساڵی ١٩٢٧[٣٢٧] |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| دیوانییە | ٢٩٥٠٠ | ٢٢٧٠٠ | ١٠٪ی بەروبووم + ١٠٪ لە دۆخێکدا حکوومەت ئاو دابینبکا | ٢٥-٣٠٪ |
| دیالە | ٣٥٦٠٠ | ٣٤١٠٠ | هەمان شت | ٣٦٪ |
| کووت | ٨٥٤٠٠ | ٢٥٨٠٠ | هەمان شت | ٢٠-٢٥٪ |
| عەمارە | ٦٦٨٠٠ | ١١٠٠ | هەمان شت | داچێندراو |

**خشتەی ژمارە ٢: تەواوکەر**

| ناوی لیوا | ستوونی ٩<br>تێکڕای تیۆریی پشکی دەوڵەت لە زەوییەکانی میری بەپێی قانوونی ٤٢ی ساڵی ١٩٢٧[٣٢٨] | | | ستوونی ١٠<br>دابەشکردنی ترومپاکانی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| | جۆری ئاودێری | باج | بەکرێدان | |

324 Sir Ernest Dowson, An Inquiry in to Land and Related Quistions, Table 1, p. 11.

325 Ibid, p. 11.

326 Great Britain, Colonial Office, Report on Administration of Iraq, April 1923-December 1924, p. 137.

327 Ibid, p. 137.

٣٢٨ دەقی قانوونی ژمارە ٤٢ی ساڵی ١٩٢٧، لە:

Great Britain, Colonial Office, Report on the Administration of Iraq for 1927- Article 3 and 4 have Referendum.

| | | | | کشتوکاڵی لە ١٩٢٩دا[٣٢٩] |
|---|---|---|---|---|
| دیوانییە | بە ئاوی سەرزەوی | ٪٢٠ | ١٠٪ یا ٥٪ یا ٢,٥٪ بەپێی چوستیی ئاوپێدان | ٢٦٩ |
| دیالە | ... | ... | ١٠٪ یا ٥٪ یا ٢,٥٪ بەپێی چوستیی ئاوپێدان | ٣٢٧ |
| کووت | هەڵدان | ٪١٠ | ٢,٥٪ یا ١,٥٪ | ١٣٥ |
| عەمارە | باران | ٪١٠ | ٪٥ | ٤٤ |

**خشتەی ژمارە ٢:[٣٣٠] تەواوکەر**

| ناوی لیوا | ستوونی ١١ | | | ستوونی ١٢ | | | ستوونی ١٣ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بە هەزاران تەن | | | بە هەزاران تەن | | | | |
| | بەرهەمی گەنم | | | بەرهەمی جۆ | | | بەرهەمی چەڵتووک | |
| | ١٩٤٨ | ١٩٤٩ | ١٩٥٠ | ١٩٤٨ | ١٩٤٩ | ١٩٥٠ | ١٩٥٠ | ١٩٥١ |
| دیوانییە | ١٧ | ٦٢ | ٥٤ | ٢٤ | ٨٢ | ٨٤ | ٦٦ | ٣٣ |
| دیالە | ١٣ | ١٩ | ٥ | ١٣٨ | ٦٦ | ٩٩ | ٦ | ١,٥ |
| کووت | ٥٩ | ١١٤ | ٧٧ | ١١٠ | ١٦٠ | ١٦٤ | ٦ | ٦ |
| عەمارە | ٩ | ٨ | ٨ | ٣٧ | ٤٥ | ٣٢ | ١١٤ | ٢٤ |

**خشتەی ژمارە ٣:**

**تێکرای ئاڵوگۆڕی دەرامەتەکان (بە رووپێ بۆ هەر تەنێک)[٣٣١]**

| ناوەندی لیوا | تێکرای سەبارەت بە گەنم | | | تێکرای سەبارەت بە جۆ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١٩١٨ | ١٩٢١ | ١٩٢٢ | ١٩١٨ | ١٩٢١ | ١٩٢٢ |

---

[٣٢٩] الحكومة العراقية، وزارة المالية، موجز احصائي للسنوات المالية السبع ١٩٢٩-١٩٣٦، بغداد، مطبعة الحكومة، ١٩٣٨، الجدول ١٢٨، ص٨٩-٩١.

[٣٣٠] الجمهورية العراقية، وزارة الاقتصاد، موجز احصائي لسنة ١٩٥١، الجدول ١٤٢ ب، ص١٤٣؛ الجدول ١٤٤، ص١٤٥.

[٣٣١] ژمارەکانی ساڵی ١٩١٨، لە: Reports of Administration for 1918, I, p. 208, 346.

ژمارەکانی ساڵانی ١٩٢١ و ١٩٢٢، لە:

Great Britain, Colonial Office, Report on Administration of Iraq 1922-1923, p. 102.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بەغدا | ... | ٢٥٠ | ٩٠ | ... | ١٢٠ | ٣٧ |
| دیوانییە | ٢٠٠ | ٢٢٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ٤٠ |
| دیالە | ... | ٣٢٠ | ١٠٠ | ... | ١٢٠ | ٣٧ |
| کووت | ١٥٠ | ٣٤٠ | ١١٤ | ٩٠ | ١٦٥ | ٥٥ |
| عەمارە | ... | ٢٨٠ | ٨٦ | ... | ١٤٧ | ٥٣ |

**خشتەی ژمارە ٤:**

پشکداریی باجی ساڵی ١٩١٨ بە بەرهەم[٣٣٢]

| ناوی لیوا | گەنمەشامی | گەنم | جۆ | چەڵتووک |
|---|---|---|---|---|
| دیوانییە | | ٤٠٧٤ تەن | ١٠٦٨٦ تەن | ٤٢٣٣ تەن<br>+٢,٩٧ لەک |
| دیالە | ٦٤ تەن | ٥١٦ | ٤٥٩١ | ١+٥ لەک |
| کووت | ... | ٨٤٢ | ٢٣٦٥ | ١,١٧ لەک |
| عەمارە | زانیاری نییە | | | |

332 Reports of Administration for 1918, I, pp. 16-17, 51, 60, 116, 208, 346-347.

(٢)

مەملەکەتی مونتەفیک لە ئەوپەڕی فراوانبوونی مێژووییی خۆیدا
سەردەمی میر مانیع ئالشبیبی حوکمداری (لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا)



حەننا بەتاتۆ،
دانەری ئەم کتێبە

حەننا بەتاتۆ، مێژوونووسێکی مارکسیی فەلەستینییە، ١٩٢٦ لە شاری قودس هاتووەتە دنیاوە. ٢٠٠٠/٦/٢٤ لە وینستد/ کۆنیکتیکۆت- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەری‌ناوەتەوە. مێژوونووسێکی پسپۆری مێژووی نوێی ڕۆژهەڵاتی عەرەبییە، کاری لەسەر عیراق و سووریا کردووە. ١٩٤٨ چووەتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. ١٩٥١-١٩٥٣ لە قوتابخانەی ئێدمۆند ویلش بۆ کاروباری دەرەکیی زانکۆی جۆرج‌تاون خوێندوویە. ١٩٦٠ دکتۆرای لە زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی هارڤارد وەرگرتووە، لەسەر تێزەکەی بە ناونیشانی The Shaykh and Peasant in Iraq 1917-1958. ١٩٦٢-١٩٨٢ لە زانکۆی ئەمەریکایی لە بەیرووت، ١٩٨٢ تا خانەنشینبوونی لە ١٩٩٤دا، لە زانکۆی جۆرج‌تاونی ویلایەتە یەکگرتووەکان، دەرسی وتووەتەوە.

سەرەتای سالانی پەنجا، کەوتووەتە لێکۆڵینەوە لە مێژووی عیراق و بایەخی بە جووڵانەوە شۆڕشگێڕییە تاوسەندووەکانی ئەم وڵاتە داوە، بەتایبەت لەسەر حیزبی شیووعیی عیراق گیرساوەتەوە. دوادوای سالانی پەنجا، چەند جارێک سەری لە عیراق داوە و چەند زیندانییەکی سیاسیی شیووعی و فایلە نهێنییەکانی پۆلیس و ئەمنی عیراقی پێش شۆڕشی ١٩٥٨ی دیون. بەوپێیە پێوەندییەکی فراوانی بە سیاسی و جووڵانەوە سیاسییەکانی عیراقەوە پەیداکردووە و فایلە نهێنییەکانی دەزگا ئەمنییەکانی عیراقی تا سالانی حەفتا بەرچاوکەتووە. ئەم تۆمارانە کارێکیان‌کردووە بتوانی لە کتێبی "چینە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان و جووڵانەوە شۆڕشگێرییە نوێیەکانی عیراق"دا (١٩٧٨ بلاوبووەوە) لە گۆڕانکارییە

سیاسییەکانی عیراق بکۆڵێتەوە. ئەم شاکارە، سەرچاوەیەکی بنچینەییی مێژووی نوێی عیراقە، لەسەر میتۆدی بەتاتۆ بنیاتنراوە کە پشت بە شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی- سیاسی دەبەستێ و نەخشی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان لە پەرەسەکاندا دەخاتەڕوو.

لە کۆتاییی ژیانیدا، لێکۆڵینەوەیەکی هاوشێوەی سەبارەت بە سووریا ئەنجامداوە، بە ناونیشانی "جووتیارانی سووریا: کوڕانی پیاوماقووڵانی لادێ و سیاسەتیان" (١٩٩٩ بڵاوبووەوە).

